بەرهەمی ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم
بە هاوسەری ژیانم خەجیج و منداڵە
خۆشەویستەکانم شلێر و کەمال
"نووسەر"

---

**ناسنامەی کتێب:**


ناوی کتێب : لە بیرەوەرییەکانم بەرگی یازدەهەم
نووسەر : کەریمی حسامی
پیت چنین و مۆنتاژ : ناسری ئیبراهیمی
چاپخانەی : - سوید ۲۰۰۱
ISBN-91-631-1477-1


---

# پێڕست

## چەند وتەیەکی پێویست

بەراستی نازانم چۆن هەستی گرگرتووی دەروونی خۆم دەربڕم!
لەکاتێکدا ئەم پێشەکییە دەنووسم کە ئاخرین بەرگی بیرەوەرییەکان و نووسینە ئەدەبی و سیاسیەکانی کاک کەریم - ە.
لێرەدا بە پێویستی نازانم بە کاک کەریم هەڵ بڵێم، چونکە تێکۆشان و خەباتی سیاسی و نووسینە ئەدەبیەکانی زیندووترین بەڵگەن بۆ ئەو.
کاک کەریم هەرچەند بە بیر چەپ و لایەنگری سۆسیالیزم بوو، بەڵام هەمووکات بیرو باوەڕەکەی لە خزمەت گەل و نیشتمانەکەیدا بووە. کاک کەریم نموونەی مرۆڤێکی تێکۆشەرو ماندووبوونیش هەمووکات لای نامۆ بووە.
بەرهەمەکانی کاک کەریم چ لەباری سیاسی و چ لە باری ئەدەبییەوە راستەوخۆ رووبەڕووی میللەتەکەی بۆتەوەو لە لایەکی کەشەوە تەوەژمی هەستی ئەدەب دۆستی و بەشدار بوون لە کۆڕو دیداری سیاسی و ئەدەبیدا، وەک بارانی پەلە، دێبەری دڵ و دەروونی هەزاران کوردی ئاو داوە.
کاک کەریم نموونەی کوردێکی بە پرینسیپ و زۆر جارانیش لەبەر بێ پرینسیپی هێندێک کوردی(شۆڕشگێڕ)خۆی خواردۆتەوە و بێ نارەحەت بووە. کاک کاریم وەک خۆی دەڵێت، کەسێک کە قەڵەم بە کاغەزدا دێنێ، دەبێ چاوەڕوانی هەم پێداهەڵگوتن بێ و هەم رەخنە، بەڵام نە وەک پیرێژنی بەر کۆڵان قسەو قسەلۆک بێنێ و بەرێت.
بیرەوەرییەکانی کاک کەریم جیا لەوە کە سەربردەی ژیانی خۆیەتی، دەبێ بڵێم لاپەرەیەکی لە مێژوو، خەبات و تێکۆشان و بۆچوونی ئەندامانی حیزب و رێکخراوە سیاسیەکان و کەسایەتیە سەربەخۆکانی کوردی بۆمان هەڵداوەتەوە. کاک کەریم لە بیرەوەرییەکانی، خۆی بە میللەتەکەی دەناسێنێ. هەر وەک ژان ژاک روسـۆ دەڵێ: **"من مەبەستم ئەوەیە، مرۆڤێک بە خەڵک بناسێنم کە بە راستگۆیی سرشتی دەژی، ئەو مرۆڤەش منم... نەک کەسێکی دیکە غەیری خۆم".**
کاک کەریم هەرگیز کینەی هەڵنەگرتووە بەرامبەر نەیارەکانی و هەردەم بەرژەوەندی نەتەوەکەی لەبەرچاو گرتووە، بە پێچەوانەی زۆر لە کوردە (شۆڕشگێڕەکان) کە هەر گفتاریان هەیەو کرداریان نەبووە! کاک کەریم رەش و سپی لێک جیا کردۆتەوە، وەک دەزانین و کاک کاریمیش لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژەی پێکردووە، ئەوەی د. قاسملو دەگەڵ ئەوی کرد، دەبوایە کاک کەریم هیچ کات لە بیری نەچووبایەوە، بەڵام کاتێک کە دوکتور بەدەستی دووژمنانی کورد

شەهید دەکرێ، کاک کەریم لەسەری دەنووسێ و رەشی بۆ دەپۆشێ لە کۆرو ماتەمینیشدا شەهید کردنی د.قاسملو لە قاو دەدات و ئەو کارەساتە بە زیانێکی گەورە بۆ جولانەوەی کورد دەبینێ.
زۆر کەس کە لە خەباتدا دەگەڵ کاک کەریم بوون، گلەیی و گازندە لەوە دەکەن کە بۆچی کاک کەریم لە بیرەوەرییەکانیدا نەخشی ئەوانی زۆرتر باس نەکردووە و نەیهێناوەتە سەر کاغەز. یەک لەوان بەرێز کاک جەلیل گادانییە کە لە پەرتووکێکدا "با نەبێتە قسەی پاش مردووان" داخەکەم وای لێهات و مەرگ مەودای وەلامدانەوەی پێنەدا. رەخنەو گازندە لە کاک کەریم دەگرێ و بەم بیانووەش باسی تێکۆشانی خۆی بە درێژی دەکات.
ئێمە لەم پێشەکیەدا بۆ ئەوەی شوێنە ونکە نەبێ لەم بەشە مێژووییە چەند تێبینی لەسەر نووسینەکەی کاک جەلیل لەمەر رەخنەو گازندەی بۆ کاک کەریم دەنووسینەوە. کاک جەلیل لە وڵامی مامە غەنی کە: "لەو کتێبانە کە نووسراون هەقی خۆیان نەداوەتێ" دەڵێت :هەر کەس بە پێی هەول و تێکۆشان و کارو کردەوەکانی بەشێکی بەردەکەوێ و ناکرێ بە وردی و درێژی لەسەر هەر کەس و رووداوێک بنووسرێ..." لە هەمان نووسراوەدا رەخنە لە کاک کەریم دەگرێ و دەڵێت :"لە هێندێک جێ هەوڵت داوە وەزعی خۆت کەڵێک بەرجەستە کەیەوە کەچی هەر لە پەنای خۆت سەرنجت نەداوەتە نەخشی هاوسەنگەرو برادەرەکەی هاوکارو هاوخەبات و زۆر بەساکاری و بە تیژی بەسەریدا تێپەریوی.." لێرەدا هەول دەدەم قسەکانی دژ بەیەکتری کاک جەلیل بێنمەوە تا خوێنەر چاکتر بتوانی لە مەبەستی کاک جەلیل بگات!
کاک جەلیل دەڵێت: مێشکی مرۆش ناتوانێ هەموو شت لە خۆیدا رابگرێ و چوونە سەری تەمەنیش لەم بارەوە شوێنی تایبەتی دادەنێ.." کاک جەلیل درێژەی پێدەداو دەلێت: "بە هۆی ئەوەی هەڵگرتنی یادداشت لە ژیانی رۆژانە ئیستاش لە نێو ئێمەدا باو نییەو بە دەگمەن کەسانێک هەڵدەکەون کە ئەو کارە لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا بکەنە بەرنامەو بایەخی پێبدەن..." سەرەرای ئەو قسانە کاک جەلیل هەر لەو نووسینەدالەسەر بیرەوەرییەکانی کاک کەریم دەڵێت: "زیاتر جێگەی سەرنجم بوون تا ئەگەرهەڵەیان تێدا بێ روونی کەمەوەو ناراستیە عەمدیەکانیش راست کەمەوە" بەراستی جێگەی سەرسوورمانە کە کاک جەلیل بە بێ یادداشتی رۆژانەو تەمەنی زۆریش دووای ئەو هەموو ساڵە ویستوویەتی ناراستیەکان بۆ کاک کەریم راست کاتەوە!
کاک جەلیل لەسەر بەرگی یەکەمی بیرەوەرییەکانی کاک کەریم دەنووسێ: "ژان ژاک رۆسۆ بۆ فەرانسەوی و لە فەرانسە نووسیویە" کۆمەڵی کوردەواریش وەک هەموو کۆمەڵی ئادەمیزاد پرە لە دیاردەی چاک و خراپ. با بە درۆش ئاوی خاوێن بە کۆمەڵی کوردەواریدا نەکەین و وەک ناسیونالیستێکی بەرچاوتەنگ

هەموو شتی کوردەواریمان پێ باش بێ". لە دوواتر کاک جەلیل دەنووسێ: "کاک کەریم خوێنەران و بینەران بەرەو رەشبینی دەباو لەوانەیە هەر سەبارەت بە مێژوو تووشی بەدبینی بێ". کاک جەلیل درێژەی پێدەداو دەڵێت: "بە بروای من جێگەی خۆی بوو بۆ چاپکردنی ئەوانەی لە کتێبەکانتدا هێناوتن (جگە لەوانەی لایەنی فەردییان هەیە و بۆ خۆت نووسراون) پرسێک بە حیزب بکەی و پێویست بوو لە سکرتێرو دەفتەری سیاسی ئیزن وەرگری..." یەکەم دەبێ بڵێم کە کاک کەریم کتێبی نووسیوەو نەک فیلمی دروستکردووە تا بینەران بەرەو رەشبینی بەرێت. دووهەم ئەوە کاک کەریم نەبوو کە حیزبی دێموکراتی کرد بە دوو بەش و رۆڵەکانی کوردی بە دەستی یەکتری بەکوشتن داو رێژیمی داگیرکەری پێ قەڵەو کرد. ئەوا کاک کەریم نەبوو کە بەڵگەی بەراست و درۆی وەدەر ناو حورمەتی بۆ کەس نەهێشتەوە. بەڵێ ئێوە رۆژ نەبوو کە هەزاران جنێوو قسەی سووک بە یەکتری نەدەن و ئیزنیشتان لە کەس وەرنەگرت و کەسیش هەقی نییە لێتان بپرسێ: "لە پێناوی چی" ئاواتان کرد. ئینجا بزانین کێ " خوێنەران و بینەران" بەرەو رەشبینی دەبا!

کاک کەریم لە بیرەوەرییەکانیدا بە باشی باسی کاک جەلیل و خوشکە سەعادەت دەکا کە لە ماڵی خانمە خانمە بوون. بەڵام کاک جەلیل لە وەڵامدا هەروا کە لە نووسینەکەی دیارە، زۆر بە قەڵسییەوە دەنووسێت: "ئەمن و خوشکە سەعادەت وەک یەک دەکا کە چالاک بووین" کاک جەلیل دووایە دێتە سەر خۆی و لە داخان لە مەبەست لادەداو بیرەوەری و چالاکی خۆی بە درێژی باس دەکات و هەر ئەوەندەیە کە راستەوخۆ ناوی قارەمانی ئەو سەردەم لە خۆ نانێت. پێم وایە ئەم نووسینەی کاک جەلیل کە پەیتا پەیتا باسی خۆی و چالاکیەکانی دەکا، ناویشی ناوە "با نەبێتە درۆی پاش مردووان" هەر وەک رەخنەو قسەی بەشێک لە کونە ئەندامانی حیزبە، کە بۆ کاک کەریم "نەخشی ئەوانی لەبەر چاونەگرتووە". پێیان وایە کە کاک کەریم دەبوایە بیرەوەری ئەوانیشی نووسیبا! ئینجا بۆیە باشتر دەبوو ئەگەر کاک جەلیل راستەوخۆ دەستی دابا تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانی خۆی! کاک جەلیل لە نووسینەکەیدا باسی کوری رەش دەکات، جێگای سەرسوورمانە کە کاک جەلیل دەرسی لە رابردوو وەرنەگرتووەو ئێستاش هەر بە تەمایە عەلی قازی بکات بە قارەمان. دووای شۆرشی گەلانی ئێران کاک جەلیل کە بەرپرسی حیزب و سەرۆکی کوردەکانی دانیشتووی تاران بوو، رۆژێک کوری رەشی دەگەڵ خۆی هێنا بۆ زانستگای سەنعەتی تاران. وای نیاز بوو بیکا بە قارەمان لەسەر ئەو خەڵکە، میکرۆفۆنی دایە کە قسان بۆ دانیشتوان بکات.بەڵام خەڵکەکە بەم دێرە شیعرە فارسیە لێیان لە قاو داو:

(گیریم پدرت بود که فاضل از فضل پدر تو را چ حاصل) هەرچەند کاک جەلیل هاواری کرد، کە خەڵکەکە ئارام کاتەوە سوودی نەبوو، نەیانهێشت کاک

عەلی قازی قسان بکات.
کاک جەلیل باسی پێوەندییەکان و دابرینی حیزبی دیمۆکرات دەگەڵ حیزبی توده لە سەرەتای کودیتای ٢٨ـی گەلاوێژ دەکات. کاک جەلیل بۆچوونەکانی کاک کەریم لەمەڕ ئەم پێوەندیانە بەرپێچ دەداتەوە بۆچوونی خۆی دەنووسێ. تۆ بڵێی کاک جەلیل بۆ ئەو قسانە بەڵگەشی هەبێ یا خود پێوەندی ئەو دەگەڵ د. قاسملو و بەرێوەبەرانی حیزبی توده لە پێوەندی کاک کەریم پتەوتر بووە!
کاک جەلیل یەک بەیەک بەسەر بیرەوەرییەکانی کاک کەریم هاتۆتە خوارێ، ئەگەر خوێنەر کەمێک سرنجی بداتێ، دەزانێ کە کاک جەلیل بەم بۆنەوە ویستوویەتی بیرەوەری و قارەمانیەتی و چالاکی خۆی بنووسێتەوە. لەسەر بەرگی پێنجەم، کاک جەلیل زۆری پێ سەیرە، پێوایە کاک کەریم بە هەڵە ناوی ئەوی لە دەقی نامەیەک کە لە لایەن د.قاسملو بۆ کاک کەریم نووسراوە، نووسیویەتەوە. چاکتر نەبوو لە پێش ئەوەی کاک جەلیل ئاوا بریار بدا چاوێکی لە پاشکۆی کتێبەکە کردباو کۆپی نووسینی نامەکە بە دەستخەتی د.قاسملوی خوێندباوە!
کاک جەلیل لە نووسینەکەیدا دەڵێت "دەمەوێت هەڵەکان بۆ کاک کەریم ساغ کەمەوە" ناوەکان، رووداوەکان و رۆژمێرەکان بۆ کاک کەریم بە پێموابێ، پێموابێ راست دەکاتەوەو نەزەری خۆی دەردەبرێ. لە کاتێکدا کاک جەلیل دەبێ ئەوەی چاک بزانێ و هەروا کە بۆ خۆشی ئیشارەی پێکردووە، ئەوە کاک کەریم بوو کە دەفتەری رۆژانەی هەبوو،و یادداشتی رۆژانەی هەڵدەگرت، کاک جەلیلیش خۆزیای ئەوەیە کە بریا ئەمشێوەیەی زۆر زووتر لە کاک کەریم فێر بوویایە. ئینجا هەڵەکانی چۆن ساغ کردۆتەوە، خۆی و خودای خۆی دەزانێ!
لەبابەت پێوەندی کاک کەریم بە بالوێزخانەی سۆڤیەت و رۆژنامەکانی لوبنانی و چاوپێکەوتنی دەگەڵ یاسر عەرەفات و...هتد، هەر وەک کاک کەریم بۆخۆی باس دەکات رەنگە لەباری تەشکیلاتییەوە رەخنەیان لەسەر بێ، بەڵام لەباری سیاسییەوە بە قزانجی حیزب و جوڵانەوەی کوردستان بووە. دووانریش کارەکانی کاک کەریم لە کومیتەی ناوەندی حیزب پەسند کراوە.
کاک جەلیل ئاماژە بە بریارەکەی حیزب و ئیعلامیەی ماموستا مەلا شێخ عیزەدین لەسەر تەحریمی رێفراندۆم دەکات و بۆچوونەکەی کاک کەریم کە دەڵێت: "یەکەم بەردی بناغەی ناکۆکیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی دانا" رەت دەکاتەوەو لەسەر ئەو بروایەیە کە بۆچوونەکەی ماموستا (لە هی حیزب لیبراوانەتر و ژیرانەتر و شۆرشگێرانەتر بووە) زۆرم بەلاوە سەیرە کە رێبەرو تێکۆشەرێکی ماندوونەناس وەک کاک جەلیل بۆچوون و لێکدانەوەی ئاوا بێ! لە کاتێکدا کاک جەلیل دەبێ چاک بزانێ کە لە سەردەمی وتووێژ دەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانی، شەر دەگەڵ کۆمەڵە، بریاری مادە ٨و...هتد ماموستا چ

دەورێکی گێڕاوە. کاک جەلیل باسی دەستەی نوێنەرایەتی حیزب بۆلای خومەینی دەکات و دەڵێت من ئەودەم مشاوری کومیتەی ناوەندی بووم. بەڵام بەرێز کاک حەمەدەمینی سیراجی کە لە ڕێبەرایەتی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبدا بوو دەڵێت: (ئەوەی کاک کەریم نووسیویەتی ڕاستەو ئەو چەند کەسەی خوارەوە کە لە ڕێبەرایەتی دا نەبوون و دەگەڵ کەوتن بریتی بوون لە کاک جەلیل، کاک نەبی قادری، سەننار مامەندی، ئەحمەدی قادری. لە درێژەدا کاک حەمەدەمین گوتی: ئەوەی کاک جەلیل دەیڵێت ڕاست نییە، تەنانەت زۆر دواتر ئەمن پێشنیهادم کرد کە کاک جەلیل و د. صادق شەرەفکەندی ببن بە موشاویری کومیتەی ناوەندی و پێشنیهادەکەشم قبول کرا. کاک جەلیل لەسەر نووسینەکەی کاک کەریم کە باسی پەیامەکەی ٢٦ی خەزەڵوەری ساڵی ٥٨ی خومەینی دەکاو دەڵێت: "زۆر سەیرە کە کاک کەریم پاش ئەو هەموو تاقیکارییە بروای بە خۆمەینی هەر ماوە" کاک جەلیل لەنووسینەکەیدا باسی ئەوە دەکات کە یا غەرەز وەلانێن، لێرەدا دیارە کە چەندەی وەلای ناوە! ئێنجا با بزانین کاک کەریم لە بەرگی شەش ل.٢٢٨ چ دەڵێت: "پێویستە وەبیری خەمەوە لەوکاتەدا کە خومەینی بە درۆو بە ناچاری پەیامی ٢٦ی خەزەڵوەری ناردبوو، گەلی کوردیش...." لێرەدا دەبێ ئەوە بخەمەوە بیر کە ئەوە کاک کەریم نەبوو کە بروای بە خومەینی هەر مابوو، بەڵکو ئەوە ح.د.ک.ا و ڕێبەرانی ئەو حیزبە بوو کە بڕواو هیوایان هەر بە خومەینی و ڕژیمەکەی مابوو. کە بە داخەوە لە سەر ئەم بڕوا پێکردنەدا شەهید کران.

لەسەر بەرگی حەفتەم کاک جەلیلی (بێ غەرەزانە!!) مەسەلەکان دەخاتە بەر باس و کاتێک کە کاک کەریم لە بەندیخانەی بەغدا دەسبەسەر بووە، کاک جەلیل دەڵێت: "بە عەقلیشمدا نایە کاک کەریم دەگەڵ ئەوان قەولی هیچ چەشنە هاوکارێکی دابێ، بەڵام بۆخۆی لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی و قبولی کردووە". یان چوونی کاک کەریم بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەت. وادیارە کاک جەلیل پێیوایە کەس کتێبی کاک کەریم ناخوێنێتەوەو تەنیا کتێبی جەنابیانە کە لە دەستان ناکەوێت و بە ئیشتیای خۆی نووسینەکانی کاک کەریم وەرگێرێتەوەو بیکا بە بەڵگە بۆ دوارۆژ..بەڵام کاک جەلیل باسی ئەوە ناکات کە کاک کەریم بە ئیزنی چێ چۆتە باڵوێزخانەی سۆڤیەت و لە لای کاربەدەستی باڵوێزخانە چ دەڵێت: "....پاشان هاتمە سەر سیاسەتی نادۆستانەی سۆڤیەت سەبارەت بە کوردو چەوتی ئەو سیاسەتەم بە گوێرەی بۆچوونی خۆم ڕوونکردەوە". کاک کەریم لە دوو نامەشدا بۆ شەهید د. قاسملو لەمەڕ چوونی بۆ باڵوێزخانەی سۆڤیەتی و حکومەتی عیراق دەنووسێ: "تکایە بە هیچ جۆر بڕوا بە حکومەتی عیراق مەکەن و... مەهێڵن شەر پەرە بستێنێ، بە هیوای درۆو بەڵێنی بەعس خۆ تووشی شەرێکی قورس مەکەن. ئەوانەی ئێرە جێگای ئیتیبار نین...". کاک

جەلیل لەو شوێنانەی کە کاک کەریم بە کورتی لەسەری نووسیوە، کاک جەلیل زۆر بە تێروتەسەلی بەرپرسایەتی و تێکۆشانەکەی خۆی دەکات. ئەمە کارێکی باشە، بەڵام دەبوایە لە کتێبێکی تایبەتیدا ئەوەی باسکردبا نە دەگەڵ رەخنەو گازندە تێکەلی کردبا.

کاک جەلیل لە لاپەرەی ۸۷دا باسی نامەیەکی شەهید د. سەعید دەکات کە گۆیا کاک کەریم ئاماژەی پێ کردووە. نامەکەش لەسەر فاروقی کەیخوسرەوییە کە گۆیا د. سەعید دەڵێ: "بە شەق دەری بکەن، بیبەن تا دەگاتە نێو پاسداران و مەهێڵن بگەرێتەوە" دەپێشدا کاک جەلیل پێیوایە کە بوختانە، دوواییەش لە خوارتر دەنووسێ: "بەشێک لەوەی د. سەعید لەمەر فاروق یا هەر کەسێک لەوکاتەدا گوتوویەتی راستە..". کاک جەلیل لەبابەت وەدەرنانی کاک کەریم لە حیزب و چاوپێکەوتنەکەی دەگەڵ ئەو لە پاریس وا بە وردی وتووێژەکەی هێناوەتەوەو وشەی دارشتووە کە هەر دەڵێت تۆمار کراوە! لە بابەت حیزب و رژێمە داگیرکەرەکان کاک جەلیل دەنووسێ: "کاک کەریم ئەوەندەی لەسەر حیزب و رێبەرایەتی حیزب نووسیوە، نیوەی ئەوەشی لەسەر رژێمە داگیرکەرەکان نەنووسیوە . کاک جەلیل وا خۆی لە چوارچێوەی حیزبایەتیدا قەتیس کردۆتەوە، وادیارە ئەو گۆڤارو رۆژنامە کوردیانەی کە لە دەرەوەی ولات و تەنانەت لە کوردستانیش چاپکراون ناخوێنێتەوەو چاوی بە مەقالەکانی کاک کەریم لەسەر رژێمە داگیرکەرەکان نەکەوتووە!

کاک جەلیل ئیشارە بە پەرتووکەکەی "لە پێناوی چی" کاک کەریم دەکاو بە توندی رەخنەی لێ دەگرێ. ئەم پرسیارە دێتە گۆرێ کە باشە کاک جەلیل بۆ روونی ناکەیەوە لە پێناوی چیدا حیزب لەتکراو ئەو هەموو جنێوو سووکایەتیە و بە کوژدانی رۆڵەکانی کوردو بەڵگەی نارەواتان بە بێ (ئیزنی حیزب و سەرکردایەتی)لە سەر یەکتری دەرکرد!

لە کۆتاییدا دەتوانم بڵێم کە نە تەنیا کاک جەلیل بەڵکو هیچ کەسێکی دیکەش ناتوانێ نەخشی نووسینەکانی کاک کەریم لە مێژووی خەبات و ئەدەبیاتی کوردیدا بسرێتەوە. ئینجا زۆر بەڵگەوو نامەی دیکە هەن کە کاک کەریم لەبەر بەرژەوەندی جوولانەوەی کورد و تەنانەت حیزبی دیمۆکرات چاپی نەکردوون.

هەزاران سلاو لە گیانی پاکی کاک کەریم

کەمال حسامی - ناسر ئیبراهیمی

## سەرەتایەک بۆ کۆتایی بیرەوەرییەکانم

لە بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانمدا ئاماژەم بەوە کرد بوو کە ئەگەر تەمەن مەودا بدا، بەشێکی دیکەی سەربردەی ژیانم لە ئاوارەیی و دەر بەدەریدا دێنمە سەر کاغەز و ئەگەر توانای چاپکردنیشم بۆ رەخسا، هەر چەندە گوڵێکی سیسیش بێ با لە گوڵزاری ئەدەب و نووسینی کوردیدا، بخرێتە بەر دەستی خۆێنەرانی کوردەوە. بیریشم لە وە دەکردەوە کەسێکی بە ناچاری لە نێو گەل و نەتەوەی خۆی دوور کەوتبێتەوە و لە کۆڕی خەبات و تێکۆشانی نێو وڵات دوور خرابێتەوە و لە شایی و شینی گەلی خۆی لە وڵات دا بەشدار نەبێ، دەبێ باسی چی ژیانی خۆی بکا و نووسینەکەی بۆ خۆێنەران و بۆ بەرەی دوارۆژی کورد سود و تام و چێژی چی هەبێ ؟

بەڵام هێندێ جار بزۆزیش مروڤ هاندەدا کە بگەڕێتەوە سەر وتەی پێشینان کە گوتوویانە : « شەڕ لە بێکاری باشترە» هەر چی بێ دادڕینی تیتۆڵێک لە ژیانی دەر بەدەری و لە هەڵس و کەوتی ژیانی ڕۆژانە و خەم و خەفەتی بیستنی دەنگ و باسی داخداری کوردستان و خۆشیی دیدار و دانیشتن لە گەل دۆست و برادەرانی هاو نیشتمان و هاو بیر و وەرگرتنی نامە لە دۆست و ناسیاران و هێنانە سەر کاغەزیان، لە وانەیە لە قوژبنێکی کتێبخانەی کوردیدا وەک خاڵێکی بچوک جێگای خۆیان بکەنەوە.

بەڵام ئەوەش بۆ بیر کردنەوە دەبوو کە لە کوێوە دەست پێبکەم؟ لە ماوەی ئەم دە ساڵەی کە بیرەوەرییەکانم نووسیوە و دە بەرگیان لێ بڵاو بۆتەوە، گەلێ کەس لە نووسەران و دۆست و ناسیاران، کورت یا درێژ لە سەر ئەم دە بەرگەی بیرەوەرییەکانم نووسیویانە و منیش لە جێی خۆیدا بۆ رێز گرتن لە هەڵوێست و بۆ چوونی ئەو دۆستانە لە بەرگە چاپکراوەکاندا بڵاوم کردوونەوە. باسی ئەوەش ناکەم کە هێندێ کەس بە گوێرەی خەسڵەتی کەسایەتی خۆیان پاشملە ئەوەندەی دەرفەتیان بووبێ، بە وتە و لۆمە و لەقەمی بۆرە پیاوانە باسیان کردوە. غیرەتی ئەوەشیان نەبوە کە بە نووسین، بە بەڵگە و بە شێوەیەکی بابەتی و ڕووناکبیرانە کەم و کوڕی و ناتەواوییەکانی نووسینەکانم بخەنە ڕوو، بەم کارە

یارمەتی بدەن کە بە نووسینەکانمدا بچمە وە و ئەگەر هەڵە وناراستییەکیان تێدا بوو بێت ڕاستیان بکەمەوە و لەم پەندە بە نرخەی مامۆستا مسعود محەممەد دەرس وەر بگرن کە دەڵێ:«.. **ئەگەر کەسێک لە نووسیندا هەڵەیەک دەدۆزێتەوە، بۆی بلوێ بە نووسەرێ ڕاستی کاتەوە، بەوە خزمەتێکی گەورە دەکا بە ئێستاو دوارۆژی میللەتەکەی، بەڵکوو هەموو ئادەمیزاد. بە سڕینەوەی هەر هەڵەیەک لە مێشکی خەلق پەڵە هەورێکی ڕەشی جەهالەت دەرەوێتەوە و چرایەکی حەقناسی هەڵدەکرێ.»** جائەگەر ئەم جۆرە کەسانە نەهاتوون بە بەڵگە و دۆکومێنت ئەگەر هەڵە و ناتەواویەکی لە بیرەوەرییەکانمدا بەر چاویان کەوتبێ بیهێننە سەر کاغەز و بە ویژدانەوە ڕاستیان کەنەوە ، زاناو نووسەری دیکە هەبوون بەسەر بیرەوەرییەکانمدا هاتوونەوە ورەخنە و بۆ چوونی خۆیان بۆ ناردووم و لێرەشدا بڵاوم کردوونەوە. دیارە کورد کوتەنی« چەم بێ چەقەڵ نابێ.» دەبێ کابرایەکی وەک مەلا عەولای حەیاکی ببێتە حەسەنزادە و پاش دوکتۆر قاسملو ئەرکی سکرتێریی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە جێ بگەیێنێ و هەر وەک لە مزگەوتی گەورکان بە دوو تمەن تەلاقی قوربەسەرێک چاک بکاتەوە و یابە مریشکێک و درو هێلکە نوشتوو بۆ پیرێژنێک بنووسێ، لە نووسینی حکایەتێکدا کە ناوی « مێژووی »لێناوە، نیزیکەی سێ هەزار لاپەڕە بیروەرییەکانی من بە دوو فەرمایشتی سکرتێر ئاسایی هەڵسەنگێنێ و یەکسەر بنووسێ:« بیرەوەییەکانی کەریمی حسامی بە هیچ جۆر سەرچاوەیەکی جێگای متمانە نین..» و هێندێ فەرمایشتی دیکەشیان لێ زیاد بکا.

ئەوانەی پاشملە بە قسە و قسەڵۆک ڕەخنە لە نووسین و بۆچوونی خەڵک دەگرن، نە مەبەستیان ئەوەیە بە ڕاستکردنەوەی هەڵە و ناتەواویەکان خزمەت بە دوا ڕۆژی میللەتەکەیان بکەن و نە غیرەتی ئەوەشیان هەیە ئەگەر شتێکی ڕاستتریان پێ شک دێت، بیهێننە سەر کاغەز و (چرایەکی حەقناسی هەڵبکەن.) ڕەنگە ئەو کەسانە خۆیان ڕاگرتبێ بۆ سەرنانەوەی نووسەر. پاشان قەڵەمیان( ئەگەر هەیان بێ) وەکار بخەن. چونکە بەڕاستی کورد بۆ هەڵبەستنی درۆی پاش مردوو، دەستێکی باڵای هەیە. نموونەی بەرچاوی ئەم ڕەفتارە ڕەبازێنی غەنی بلوریانە لە مەزرا و مەیدانی چۆلی بێ قاسملویدا، کە دەبینین پاش نەمانی دوکتور قاسملو دەست دەداتە بەرچیغ و هەرچی دیزە و گوزەی ڕەشی بزووتنەوەی کوردە، دە سەری قاسملوی کوژراوی دەستی پاسدارانی

حکومەتی ئیسلامیدا دەشکێنێ و بە یارمەتی خەڵکی تر( ژیاننامەی سیاسی) خۆی بە شێوەی وەرتنە پێ دەرازێنێتەوە. لە خوێندنەوەی ( ژیاننامەی سیاسی) غەنی بلوریان، مرۆڤ نووسینی ژەنراڵەکانی ناپلیۆنی وەبیردێتەوە، دەڵێن:« پاش نەمانی ناپلیۆن ژەنراڵەکان دەستیان کرد بە نووسینی بیرەوەری خۆیان. ئەو شتانەیان دەنووسی کە گۆیا لە کاتی خۆیدا بە ناپلیۆنیان گوتوە، ئێستا پاش مردنی ئەو وەبیریان هاتۆتەوە بینووسن.»

ئێستا شتێکی دیکەش بۆتە باو. هێندێ کەس سەربردەی ژیانی خۆیان دەنووسن و یا نووسیویانە بەڵام تا خۆیان لە ژیاندان بڵاوی ناکەنەوە. پاش مردنیان هێندێ دۆست و هاوبیر و یا هاوکاری سیاسیان، خۆیان لێ دەکەنە دەمڕاست و دڵسۆزتر لە ژن و منداڵیان،بەڵام بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان و کەلک وەر گرتن لە نووسراوەی کابرای خوا لێخۆشبوو بە قازانجی خۆیان بڵاوی دەکەنەوە. جا وەرە. خۆیان و( ویژدانی پاکی خۆیان.) با نموونەیەکی دیکەش باس بکەین:

لەم دواییانە دا بیرەوەرییەکانی ئەردەشیسی ئاوانسیانم کەوتە دەست کە لە تاران لە لایەن (نشـر نگره) وە چاپکراوە. دەمێک بوو حەزم دەکرد ئەو بیرەوەریانە چاپ بکرێن و بیانخوێنمەوە. چونکە کاتی خۆی کە پێکەوە لە چێکوسلۆڤاکی دەژیاین و لە گەڵ دوکتور قاسملو و کاک حەسەنی قزڵجی بە خەرجی حیزبی توده ڕۆژنامەی کوردستانمان دەر دەکرد و ( مەلا عەولای حەیاکیش بە گوێرەی ڕەوشتی ڕاستگۆیی خۆی لە حکایەتەکەیدا ، دەیکاتە ڕۆژنامەی قاسملو) حیزبی توده ئاوانسیانی کردبوە بەر پرسی ڕۆژنامەی کوردستان کە یەک وشەی کوردی نەدەزانی، بەڵام هەرچی باسمان کرد بایە، دەیگوت: « من در کتاب خودم نوشته‌ام» ( واتە من لە کتێبی خۆم دا نووسیومە ) هەر بۆیە زۆر بە ئاوات بووم چاوم بە کتێبەکەی بکەوێ بزانم ئەم تێکۆشەرە لە کتێبی خۆیدا چی نووسیوە.؟

بڵاو کەرەوەی کتێب کە ناوی خۆی نە هێناوە، پێشەکیەکی ٣٢ لاپەڕەی بۆ نووسیوە و ئەوەندەی لە توانای دابوە، بە سەر و گوێلاکی یەکێتی سۆڤیێتی پێشوو و حیزبی توده و چەپی ئێران و یەکە یەکی ڕێبەرانی حیزبی توده دا هاتۆتە خوار و دەنووسێ: « بیرەوەرییەکانی ئەردەشیر ساڵی ١٩٥٨لە لایەن

حیزبی توده وه له ۹۰ لاپەڕە دا چاپکرا و لە بەر هێندێ ملاحظاتی حیزبی زۆر شتیان لێ دەرهاویشت. پاشان سەر هەڵدانی ناکۆکی و دەستە بەندی حیزبی وایکرد ئەردەشێر نووسینەکەی دەستکاری بکا و پێیدا بێتەوە. ساڵی ١٣٦٩(١٩٩٠) له چوار سەت لاپەڕە دا له لایەن حیزبی دێموکراتی مردمی ئێرانە وە لە ئەڵمان چاپکرا. ئێو ئاخنی بریتی بوو لە پەلامار دانی بەشێکی حیزب و لە قاودانی ناوه رۆکی دژی مەردومیی کەسایەتیەکانی حیزب و بڕوا نه بوون به مارکسیزم لێنینزم. نووسەری ئەم دێڕانە لە سەر ئەو باوەڕەیە ئەگەر ئیمڕۆ زیندوو بایە بێگومان مەتڵەبی تازە تر و قسەی نوێتری بۆ گوتن هەبوو. چونکە زۆر لە ڕاستیەکانی بە دەر نەبڕاوی و بە نە نووسراوی هێشتەوە و لە ئەرمەنستان به تەنیایی سەری نایەوە. بابەکی ئەمیر خسرەوی بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە لە سۆڤێت و لە قاو دانی جەوهەری ڕێبەرایەتی حیزبی توده کە خۆشی سەر دەمێک لە ڕێبەرانی حیزبی توده بوە، لە ١٧ لاپەڕە دا پێشەکی بۆ نووسی» ( خاطرات اردشیر أوانسیان. نشر نگره. تهران، ١٣٧٦. ل ، ٢٠- ٢٩. کابرا ڕاست دەکا، هەتا ئەردەشیسی ئاوانسیان زیندوو بوو، بابەکی ئەمیرخسرەوی یاد داشتەکانی بڵاو نەکردەوە. بەڵام پاش نەمانی ئەردەشیس، بابەکی ئەمیر خسرەوی بۆ سوک کردنی هاو بیروهاو کارانی پێشووی خۆی، ( هەر وەک خەسڵەتی گەلێک بە ناو خەباتگێرانی بێ ویژدان و هەلپەرستە) دەستی داوەتە ئەم کارە و بێجگە لە پێشەکیەکی ١٧ لاپەرەیی کە بە قەولی کابرای بڵاو کەرە وە بە سەروگوێی سۆڤێتی پێشوو و ڕێبەرانی حیزبی توده دا هاتۆتە خوار، لەو شوێنانەی کە بە کەیفێی نە بوە، هەڵی ئاواردوە و بە سەریدا ڕۆیشتوە.

مەبەست لەم بەرکوڵە ئەوە بوو ئەو بیرەوەریانەی پاش مردنی خاوەنەکەیان بڵاو دەکرێنەوە، زۆر نابنە جێگای بڕوا چونکە هیچ دوور نیە کابرای بڵاو کەرەوە بە گوێرەی ویست و سەلیقەی خۆی دەستی تێوەر دا و سەر وکلکی هەڵپاچێ، وەک ئەو نموونانەی باسکران. بەڵام لە سەر یەک نووسینی بیرەوەری و سەر بردە و بەسەرهاتی کۆمەڵگای کوردی، لە لایەن هەر کەسێکەوە بنووسرێ و هەرچی بینووسن بە بۆ چوونی من سودی هەیە و کەلێنێکی نە زانراو و نەناسراو لە ڕووداوەکانی پڕلە گرێ و گۆڵی کۆمەڵی کوردەواری دەر دەخات و ڕوون

دەکاتەوە.گەلێک ڕووداو و شتی نەزانراو دەخاتە ڕوو، بەو مەرجەی ئیدی کابرا شووی لێ هەڵنەکێشێ و کۆمەڵێک درۆی شاخدار بە ناوی(... ڕاستی)بە خەڵک خورد نەکاتەوە. نووسینی بابەتی ڕاست لە ئەنجامدا دەبتە مادەی خاو و پارمەتی بۆ مێژوو نووسانی بێلایەن و سەر بەخۆی مێژووی سەر دەمی کورد. بە ڕاستی ئەگەر بیرەوەرییەکانی نوشیروان مستەفا نە نووسرابان ، خەڵک لە کوێ دەیزانی کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان چۆن دامەزراوە و چۆن کەوتۆتە ژێرگوشاری دەزگای ئیداری سوریا چۆن ئامانج و ئارمانی سەرەکی « دیموکراتی بۆ عیراق و خۆد موختاری بۆ کوردستانی عیراق بوە و.... ». بەخۆڕایی نیە نوشیروان مستەفا دەنووسێ: « یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە کاتی دامەزراندنی داسوریای کرد بە بنگەی سەر کردایەتی و شوێنی خۆ ڕێکخستن و مەشق پێکردنی هەندێ لە کادر و پێشمەرگەکانی و چاپ و بڵاو کردنەوەی ئۆرگان و بەیاننامەکانی. ڕاستیەکەی ئەگەر دامەزراندنی یەکێتی و هەڵگیرسانەوەی شۆرش دوای ئاشبەتاڵ، بە سەروەرییەکی گەورە لە مێژووی کوردا حیساب بکرێ، ئەبێ لەم سەر وەرییەداکورد بە ڕێز لێ نانەوە چاکەی سوریا، بە تایبەت هی سەرۆک حافظ ئەسەدی لە بەر چاو بێ». یان کێ دەیزانی کە یەکێتی نیشتمانی لە جیاتی شەڕلە گەڵ حکوومەتی بەعسی عیراق هەزار پێشمەرگە لە کوردستانەوە دەخاتە ڕێ بۆ ئەوەی قیادە موەقەتە لە کوردستانی تورکیا بنە بڕبکا، بەڵام بە داخەوە ١٠٠ کەسیان ئەگەڕێنەوە کوردستان. یا ئەگەر نوشیروان مستەفا بیرەوەرییەکانی نە نووسیبایە کێ دەیزانی کە یەکێتی نیشتمانی لە جیاتی خەبات بۆ ئازادی کوردستان لە گەڵ حکوومەتانی دوژمنی کوردلە گەمە و ساز و سەودا دابوە و شەڕی سەرەکی دژی هێزەکانی کورد بوە. یا ئەگەر بیرەوەری ڕێباز و سەید کاکە نە نووسرابان، کورد لە کوێ دەیزانی کە ئەوانەی بە ناوی شۆڕشی کورد و کوردستانی و کوردایەتی چوونە چیاو ساڵەهای ساڵ بەم ناوە پڕو ڕیاگاندەیان کردوە، بەم جورە ملیان دەبەر ملی یەکتر ناوە و شەڕی کورد کوژی و کورد قڕانیان کردۆتە ڕێبازی خۆیان و ئەوەندەی دژی دوژمن خەباتیان کردوە، گەلێک زیاتر خەریکی شەڕی یەکتربون و ئەوەی هەولیان بۆ داوە لە بەینبردنی لایەنێکی کورد و کوشتاری کورد بوە نەک ئازادی کورد و کوردستان . ئەگەرکاک محەممەدی حاجی مەحمودی

بیرەوەرییەکانی خۆی بە ناوی « ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک» نە نووسیبانەوە، چۆن خوێنەرانی کورد لەو هەموو کارەساتە داخدارەی نێو بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی عێراق بە ناوی« شۆڕشی نوێ» ئاگادار دەبوون. ئەم بیرەوەری نووسینانە بیرو ڕای کۆمەڵانی خەلک لە سەر ڕووداوەکانی کوردستان و سیاسەتی هێزە کوردییەکان ڕوون دکەنەوە و بە ڕای من خزمەتی گەورە بە تێگەیشتنی خەڵک و بە تایبەت بەرەی تازە پێگەیشتووی کورد و ڕوونکردنەوەی کارەساتەکانی کورد کوژی دەکەن و دەبنە کەرەسەیەکی بە کەلک بۆ مێژوو نووسانی دواڕۆژ کە بیانەوێ مێژووی کوردستان وەک هەیە ئاوا بە ڕاستی و بێلایەنی بنووسنەوە.

پاش بڵاو بوونەوەی بەرگی دەی بیرەوەرییەکانم، دیسان گەلێک نووسین و بیر و ڕای تازەم سەبارەت بە بیرەوەرییەکانم پێگەیشتوە و بە پێویستم زانی سەرەتای ئەم بەرگە بە بڵاو کردنەوەی ئەونووسراوانە برازێنمەوە وپاشان بچمە سەر باسی سەربردەی ژیانی ڕۆژانەم لە ئاوارەییدا.

**نامە و وتاری د. ئەمیری حەسەنپور**

بەر لەوەی بێمە سەر باسی نووسراوەکانی ئەم دواییە، بە پێویستی دەزانم بگەڕێمەوە بۆ نامە و نووسراوەیەک کە ساڵی ١٩٩٣ ڕێزدار دوکتور ئەمیری حەسەنپور بۆی ناردووم و نووسیبووی جارێ بڵاوی نەکەمەوە تا وتارەکەی ئەو کە بۆ گۆڤاری(Abstracta Iranica)نووسیوە، بڵاو نەبێتەوە. پێچوو، تا لەم دواییانە دا دەقی وتارەکەی بۆ ناردم کە بە ئینگلیسی لە گۆڤاری ناو براو دا بڵاو کراوەتەوە و نووسیبووی:« ئەوە مەتنی چاپکراوی ئەم نووسراوەیە کە لە ساڵی ١٩٩٢دا نووسیم و ئێستە بڵاو بۆتەوە. مەتنی وەرگێڕاوی کوردییەکەشم بۆ نارد بووی.»

لە گەڵ سوپاس بۆ دوکتور ئەمیری حەسەنپور نامە و نووسراوەکەی ئەو دەکەمە پێشەنگی ئەم نامە و نوسراوانە کە لە سەربیرەوەرییەکانم نووسراون و یا دۆستانە بۆیان ناردووم.ئەمەش نامە و نووسراوەی دوکتور ئەمیری حەسەن پور:

«... کاک کەریمی بەڕێز سڵاوێکی گەرم و گوڕت لێدەکەم. هیوام وایە خۆت و

برازنم ساغ و سلامەت و بە کەیف بن. بێ سەر و شوێن چونم، دوای گەڕانەوە لە سوید، زۆرترلە بەر گرفتاری لە ڕادە بە دەر بوە. دوو مانگ سەفەری هاوینێ بە جارێکی لە ئیش و کار وەدوای خستووم.

لەو ماوەیەدا ئەوەندەی دەرفەتم بوو بێ لە بیرەوەرییەکانم خوێندۆتەوە. بەلام هێشتا نەم توانیوە بە کەیفی خۆم و بە وردی بیان خوێنمەوە و وەک کتێبی فەقێیان خۆشیان بکەم. دوو مانگ لە وەی پێش کورتە ئەبستراکتێکی( هەلێنجاوەی) بەرگی ۱-٦م نووسی و ناردم بۆ گۆڤاری سالانەی (Abstracta Iranica) کە لە پاریس دەر دەچێ و لە وانەیە لە ژمارەی داهاتو دا بلاوی بکەنەوە. ئەو گۆڤارە چاپەمەنی تازەی سەبارەت بە ئێران و ئەفغانستان و کوردستان دەناسێنێ و سەرچاوەیێکی زۆر گرنگە بۆ ئەوانەی خەریکی لێکۆلینەوەی ئەو ولاتانەن. لە هەر ئەبستراکیتکدا(ئەمن پێی دەلێم هەلێنجاوە) دەبێ ناوەرۆکی کتێب یان نووسراوە یەک بە کورتی باس بکرێ و - بە دەردی هاو ولاتیانی گەرمێنێ دەلێن- بنرخێندرێ. هەلێنجاوەکە نابێ لە لاپەڕەیێک زیاتر بێ ( لاپەڕەی چاپ کراو). دیارە هەلێنجانەوە وهەلسەنگاندنی ٦ بەرگ کتێبەکەی ئێوە لە لاپەڕەیێکدا ئەرکێکی هاسان نیە.( باسی بەرگی حەوتم نەکردوە لە بەر ئەوەی ئەبستراکتەکەم لە سالی ۱۹۹۲دا نووسی و بەرگی ۷ تاریخی ۱۹۹۳ی لە سەرە). جا ئەبستراکتەکەت بۆ وەر دەگێرم بزانە چۆنە.»

ئەوەش ئەبستراکتەکەیە:

«.... حوسامی کەریم. لە بیرەوەرییەکانم........

بیرەوەرییەکانی کەریمی حیسامی(لە سالی ۱۹۲٦لە گوندی بەیرەم، مەهاباد لە دایک بوە)، تێکۆشەری سیاسی، وەرگێر، نووسەر و ئەندامی بە ڕێوەبەری حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێرانە. بەرگی یەک باسی دەورەی مندالی (۱۹۳۰) هەتا سالی ۱۹۵۷ دەکا. ئەو بەرگە زانیاری سەبارەت بە ژیانی لادێ لە سالانی ۱۹۳۰ و ۱۹٤۰. ڕووداوەکانی دوای سەرە ونخون بوونی ڕەزاشا لە ۱۹٤۱، دامەزراندنی ح . د. ک و کۆماری کوردستانی ۱۹٤٦، ڕاپەڕینی جوتیارانی ۵۳-۱۹۵۲ لە موکریان، و باری سیاسی دوای کودیتای سیاسی ۱۹۵۳ تێدایە.

بەرگی ۲ تا ۵باسی ژیانی نووسەر و چالاکی سیاسی وی دوای چوونی بۆ

کوردستانی عیراق و دوایە ئەورووپای ڕۆژ هەڵات دەکا. ئەو بەرگانە زانیاری دەستی هەوەڵی تێدایە سەبارەت بە پێوەندی نێوان ح. د. ک ی عیراق و ئێران، ح. د. ک و حیزبی تودەی ئێران، تەئسیری ناکۆکی ئێران و عیراق لە بزووتنەوەی کوردایەتی، ڕاپەڕینی چەکدارانە ٦٨-١٩٦٧ لە کوردستانی ئێران، تێوە چوونی سۆڤێت و ئورووپای ڕۆژ هەڵات لە چالاکیەکانی حیزبی دێموکرات و حیزبی تودە و زۆر شتی تری تێدایە. نووسەر بەڵگە و نامەیەکی زۆری سەبارەت بە چالاکیەکانی حیزبی دێموکرات بڵاو کردۆتەوە، بەڵگەکانی ڕاپەڕینی ٦٨-١٩٦٧ بە تایبەتی گرنگن.

بەرگی ٦ تەواو تەرخانکراوە بۆ ڕووداوەکانی ١٩٧٩،ئەو کاتەی ڕابەرایەتی ح. د. ک، وێڕای نووسەر، دەگەڕێنەوە کوردستانی ئێرانێ و دەبنە یەکێک لە بەشدارانی بزووتنەوەی ئۆتونۆمی. بەرگی ٧ کە قەرارە لە ساڵی ١٩٩٢دا بڵاو بێتەوە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٨٠-تا ساڵی١٩٨٢ دەگێڕێتەوە. ئەو کتێبە لە لایەن ئەوانەی کە ڕوانگەی نووسەر پەسند ناکەن، وەڵامێکی مەنفی دراوەتەوە. ئەو کتێبە وەک هەموو ئەدەبیاتی ئۆتۆبیۆگرافی، بە ڕوونی مۆری بۆ چوونی سیاسی و ئیدەئۆلۆژیکی نووسەری پێوە دیارە. لە گەڵ ئەوەشدا سەرچاوەیێکە سەبارەت بە ژیانی سیاسی کوردستان بە تایبەتی مێژووی ح. د. ک کە ناتوانی وەلای بنێی(Indispensable). ئەم چەشنە ئەدەبیاتە کەلکی تایبەتی هەیە بۆ تێگەیشتنی خەباتی نەتەوەی کورد کە لە شەرت و مەرجی نهێنی و سەر کوتانی توندا بەڕێوە چوە. لەو شەرت و مەرجەدا، بەڵگە و بڵاو کراوەکانی حیزبی کە زۆربەیان فەوتێندراون بە زەحمەت دەگەنە بەر دەستی تێکۆشەرانی سیاسی و مێژوو نووسان. نووسەر کە زۆر ساڵان لە ئورووپای ڕۆژ هەڵات ژیاوە، توانیویەتی بەڵگە و نامەی ناو خۆیی ڕابگرێ. کتێبەکە هەر لە ئێستاوە لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی وەڕێ خستوە. یەکێک لەوانە نووسراوەیێکی حەمەدەمینی سیراجی، یەکێکی تر لە ئەندامانی بە ڕێوە بەری ح. د. ک ە( بەرگی ٥، لاپەڕەکانی ٣٦٨تا ٣٨٦).»

**ڕەخنە و هەڵسەنگاندن ، یا جنێو فرۆشی؟**

یەکی تر لەو کەسانەی کە گۆیا لە سەر بیرەوەرییەکانی منی نووسیوە، کاک ڕەسوڵی ئارییایە کە لەژیانیدا جگە لە و جنێو نامەیە هەر گیز بە لای نووسیندا نەچووە هیچی دیکەی نەزانیوە و هیچیشی نەنووسیوە. بەڵام دەبینین لە ئورووپا لە پڕ لە جیاتی ئەوەی دەبەرگی بیرەوەرییەکانم بە شێوەیەکی شارستانیانە و بابەتی و ڕەخنەی زانستی هەڵسەنگێنێ و هەڵەکانم ڕاست کاتەوە، بە شێوەی کولتوور و فەرهەنگی تایبەتی خۆی چەند لاپەڕەیەکی بەرگی یەکەمی بیرەوەرییەکانم دێنێتە سەر کاغەز ولە ئاست تێکۆشانی سیاسی و خەبات و زیندان و دەرد و خەفەتی مردنی باب و ژن و مندالم چاوی دەنووقێنێ و لە ڕووشی هەڵنایە کە لە چاپخانەکان بە چاپی بگەیێنێ ولە ناوەندێکی کولتووریدا بیناسێنێ و بلاوی بکاتەوە و بۆ خۆشمی بنێرێ.

برادەرێکی تر جنێو نامەی ڕەسولی ئاریای بۆ ناردم و بۆی نووسیبووم تکایە نە کەی جوابی بدەیەوە و خۆت بێنیە ڕیزی ئەو کابرا جنێو فرۆشە. من ئەو بۆ چوونەی بەڕێز ماموستا مەسعود محەممەدم خوێند بۆوە و لەبیرم مابوو کە دەڵێ: « من قەت خۆم ناهێنمە ڕیزی جنێو فرۆش و کابرای جنێو فرۆشیشم زۆر پێ نزمە » من لە سەر ڕاسپاردەی ئەو برادەرە خستمە پشت گوێ و نە کابرا و نە نوسینەکەیم بە شایانی ئەوە نەزانی کەباسی بکەم. تا لە کۆبوونەوەیکی دۆستانەی چەند کەسیدا، برادەرێک پرسیاری کرد و گوتی:« کاک کەریم وەڵامی ئەو کابرایە نادەیەوە» لە وەڵامدا گوتم: من خۆ ناهێنمە ڕیزی کابرای جنێو فرۆش ئەو کەسانە بە ناوی نووسین هێندێ لاپەڕە ڕەش دەکەنەوە و وڕێنە دەکەن بۆ ئەوەی یەکێک وەڵامیان بداتەوە و لە م ڕێگایەوە ناویان بێتە نێو ناوان. ئەوانە بۆ وەڵامدانەوە نابن ،ئەگینا بە قەولی شاعیری عارف و ناسراوی کورد محوی:

**« لە پاداشی قسەی ساردا هەمە ئاە و هەناسەی گەرم**
**ئەوەی شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی تێدەگرم.»**

سەیر ئەوەیە ئەو ماوەیەی کە من لە مەهاباد بەر پرسی تەشکیلاتی حیزبی دێموکرات بووم و لیستە و ناوی تەواوی ئەندامانی حیزبی دێموکراتم لە

ناوچەی مەهاباد لە لا بوو، ناوی ئەو کاک رەسولەم لە نێو لیستەی ئەندامانی حیزبدا بەر چاو نە کەوتبوو نەمزانیبوو کە ئەندامی حیزبیش بێت و نەشمدەناسی. کە هاتمە ئوروپا موهەندیس ئاریابە تاریخی ١٩٨٥/٦/٢ ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ نارد بووم ونوسیبووی :

«... برای خۆشەویست کاک کەریمی حسامی. سلاوت لێدەکەم و دەستەکانت دەکوشم. . مەبەست لەو نامەیە ئەوەیە هێرشم بۆ هاتوە، پەنام هێناوە. رسولی برام لە عیراق وەزعی زۆر شەپرێوە... هێرشی بۆ هاتوە. لە عیراق هیچ مەیدانی هاتو و چۆیان نیە و جێگەشیان زۆر ناخۆشە. بە راستی ناهومێد بوە. نە کارێک نە داهاتوێک ئەگەر هیچی بۆ نەکەین دەچێتەوە لای ئیمام. ئەویش لە زیندان هەلاتوە رەنگە وەک ئەوانی دیکە لێی خۆش نەبن و ورەی زۆرانیشی پێ کز دەبێ و بە ڕاستی بۆ خۆشم بە سەر شۆڕی دەزانم. جا تکام ئەوەیە کە بە هۆی حیزبی کۆمونیستی عیراق و کاک عەزیز محەممەد کە ئەتۆی خۆش دەوێ و لە ڕێگەی ئەوانەوە یارمەتی بدەن بە سوریە دا بێتە ئەڵمانی شەرقی لە وێڕا دەتوانین بۆ سوید بۆی جێ بە جێ کەین. بە ڕاستی وەک برایەکی دڵسۆز ئەوەی لە دەستت دێ دریغی مەفەرموو، پێشەکی زۆرتان سوپاس دەکەم.»

وەک گوتم هەر چەند لە مەهاباد، قەت ئەو برادەرەم لە حیزب و لە ڕیزی ئەندامانی حیزبدا نە دیبوو، بەلام سەبارەت بە دۆستایەتی لە گەڵ موهەندیس ئاریای برای، زۆرم هەوڵ دا و تکاشم لە کاک عەزیز محەممەد کرد کە بە گوێرەی ئیمکان یارمەتی بدەن. کە دەربازیش بوو هاتە سوید بۆ بە خێر هێنانی پێیەوە چووم .

ئەو کەسانەی کە جنێو نامەی کاک رەسولی ئاریایان بینیبوو و نەیانخوێند بۆوە و خستبوویانە زبڵدانەوە، لای من نەفرەت و بێزاریان لە نووسینی ئاوا دەر دەبڕی و بە زمانی پاشملە تف و لەعنەتیان دەکرد. سەیر ئەوەیە کە جنێو نامەی کاک رەسولی ئاریا زۆربەی ئەو کەسانەشی دەگرتەوە کە سەر دەمێک ئەندامی سەرۆکایەتی حیزبی دیموکرات بوون و رەسولی ئاریا بە ( دانشگا دیتووی قەلا دزە ناوی هێنابوون). بەلام ئەوانە نەک هەر بۆ بەرگری لە خۆیان، تەنانەت بۆ پاراستنی وشە و فەرهەنگی کوردیش قەڵەمیان نەچوە سەر کاغەز و دەنگیان لە بەر نە هاتە دەر. ئاخرەکەی نووسەرێک و تێکۆشەرێکی ناسراو کە نەیتوانیبوو

لە ئاست سووک کردنی وشە و ئەدەبی کوردی بێدەنگ بێ، لە وەزعی سیاسی من و کاک رەسولیش ئاگا دار بوو، یەک دوو لاپەڕەی لە سەر نووسیبوو نارد بووی بۆ گۆڤاری گزنگ کە نووسینەکانی هەمیشە لە لاپەڕەکانی گزنگدا جێگایان دیار بوو. بەڵام خاوەنی گزنگ کە سەر دەمێک گۆیا بۆ دێموکراسی و سوسیالیزم رەگەڵ کەوتبوو، وتارەکەی بڵاو نە کرد بۆوە. بە هەڵکەوت نووسینەکەی مامۆستا دار تاش کەوتە دەستی من. لە گەڵ سوپاس بۆ ئەمەگداری نووسەر لە ئاست بەرگری لە کولتور و وشەی خاوێنی کوردی، دەقی نووسینەکەی وا لێرەدا بڵاو دەکەمەوە:

**وتاری ک. دارتاش**

## وەراوە یا بیرەوەری)ی کاک رەسولی ئاریایی، رەخنە گرتن یان شەرە شەق ؟

ئەم چەند دێڕەی کە دەکەوێتە بەر چاوی پرسەرنجی خوێنەرانی گۆڤاری گزنگ **، نە وەڵام و پەرسێڤی منە بۆ کاک رەسولی ئاریایی و نە لاگری و لایەنگری و لە سەر وەجواب هاتنیشە کە دەر هەق بە کاک کەریمی حسامی هاتبێتە سەر لاپەڕەی کاغەز. چونکە نووسینەکەی کاک رەسولی ئاریایی لە کتێبە نا پوختەکەیدا( لە باری رێنووس و رێزمان و شێوەی رەخنە گرتن و چۆنیەتی تایپ و شێوازی چاپەمەنی)، بیر و بۆ چوون و چێژی تایبەتی خۆی دەگەیێنێت. کاک کەریم- یش خۆی خاوەن قەڵەمە و دەتوانێ لە سەر خۆی بە جواب بێ. کە وایە من مەتەرێزی خۆم ڕوو بە هیچ لایەکیان ڕاناگوازم و بە پێی چێکڵدانەی لێکدانەوەی خۆم لە سەر ڕاستی و واقعیەت بە جواب دێم. ئەوەش بڵێم کە لەباری بیر و باوەڕ و رێبازی فیکرییەوە، من و دوو لایەنی شەڕە شەق، واتە کاک رەسولی ئاریایی و کاک کەریمی حسامی، تا ئێستا ئاومان بە جۆبارێکدا تێنەپەڕیوە. بەڵام ئەوەی کە هاندەری من بوە و ڕەنگە بۆ چەند کەسێکی تریش هەر هاندەر بێ و بە تەلیفوون روو بە کاک رەسول ڕاوەستا بن و ڕابوەستن. تێکەڵکردن و لێکدان و شێواندنی چەندین بابەتی جیا جیای سیاسی، کۆمەڵایەتی، پیشە و کار، کەسی و کەسایەتی، ئایین و زانستگەلی ڕەوان ناسی و شیمی و مەتماتیک و چەندی تریش. کە نووسەری کتێب لێکی هاڵاندوون و کردوونی بە گۆپاڵی تۆڵە و نێوی رەخنەی بە بەژن بڕیون.

بە داخـەوە لە نێـو ئێـمـەی كـورد دا هونـەری ڕەخنە گـرتن وەكی زۆربەی هونـەرەكـانـی دیكەمـان زەدە دار و نەخـۆش و بریندارە. بێـشك ڕەخنە گـرتن دەرمانی دەردانە، بە ئاگا هێنانەوەیە، چاوی نووساوی قەڵەم كردنەوەیە، ڕێگای هەتڵەی پڕلە كەندالّ نیشاندانە بە ڕێبوار و مردوو زیندوو كردنەوەیە. بەڵام لە نێـو ئێمەدا دەرمان كراوەتە تاڵاوێكی لە گیانان ناخۆش و بە ئەوكی بەر ڕەخنە دا دەكرێ و جگە لە ڕەنجاندن هیچی لێ چێ نابێ. خۆ دیارە ئەوە هـەر كۆسپی سەر ڕێی ئێمەی كورد نیە، زۆربەی گەلانی دەر و دراوسـێشمان هەر بەم دەردە گـرفـتـارن و پێـوەی دەناڵێنن. دەرد و ئازارەكـانیش سـەر چاوەیان خـۆیا و ئاشكرایە و دیارە لـە كـوێوە هـەسـتـاون و لە كـوێوە هاتوون و لە كـوێمـان پێ براون. خۆ دیارە كاڵی و نە پوختـەیی و پێنەگـەیشتنی خۆیشمـان دەردی سـەر باری هـەمـوو دەردانە و نابێ نە دیدەی بـگرین. ڕەنگە پرۆسـێـسـێكی ڕەوت ئاهەنگینی ژێر ئاسـمانی دێموكراسیمـان گەرەك بێ بۆ دەرمانـی دەردەكانمان. بە مـەرجێ كە خـۆمـان لێی بین و بمان هەوێ. بەڵام لە پێشـدا با پڕ بە زمـانی قەڵەمەكەم هاوار بكەم و بڵێم كە مەبەستم لەم ڕستەی سەرەوە، خوای نـەكردە ئەوە نیـە ئـاسـتـی بەرزی گـەل و نیشـتـمـانەكـەمـان كـزكـەمـەوە و بەری ڕووی هەتاوەكەی بە تۆپەڵێك قوڕ وەشێرم. گەل و نیشتمانەكەمان پڕبە هـەمـوو دونیا بەرزە و بە ڕێزە و لە چاو و لە دڵانیشدا گەلێ ئازیزە، بەڵام بە داخـەوە نەخۆشی و دەرد و ئاهۆ و ئازاریشی تێدا هەیە. دەرد و ئـازار و نەخۆشیەكانیشی چونكە لە ئاڵۆزە بازاری سیاسـەت پێ براوە، كە وایە چاری هـەمـوو دەرد و پەرێشانی و بەلەنگازی و پەرێشانییەكانیشی ئۆباڵی ئەستۆی حـەكیم و زاناكانمانە. حـەكیم و چازان و هەتوان پێژی دەردەكانیشمـان ویژدانی سیاسـەتكاران، سـەرۆكانی سیاسی، ماموستایان، دەست بە قەڵەمان و زانایانی گەلەكەمانە.

لە چـاخ و سـەردەمـی نوێ، واتە هـەر بە دوای شـۆڕشی ئوكـتـۆبری ١٩١٧ی وڵاتی شوراكان( سـۆڤێت)،لە زۆربەی وڵاتانی پێ لە بەندی دونیا ولە نێو نەتەوە بەشـخـوراوەكـانی مـەڵبـەندیش دا، بە لاسـاكـاری لە نیشـتـمـانی شـوراكـان، سیاسـەت و حـیزبایەتیـەكی نوێ سـەریان لە هێلكە هێنایە دەر. لە سـەرەتا دا هەموو حیزبە تازە پشكوتوەكان كۆتره سپی ئاشتی و ئازادی و پەیام هێنەرانی بەختەوەری و بەختیاری بوون و هیوای ئەوەیان لێ بە دی دەكرا كە بە یارمەتی

و گەلە کۆمەگیی دایکی مەزنیان، رەنج ، چەوسانەوە و غەدر و زۆرداری بەتونی ئاگردا بکەن و خەمی نان بۆ هەتا هەتایە لە دڵی خەڵکان ببڕن. سیاسەت وبیر و بۆ چوونی پارت و حیزبە تازە دەرکەوتوەکان بە جەستە وبە روح و بە گیان لە پەیکەری دایکێک داتاشرابوو کە هومێدی مەزن بوو. ئاکار و هەڵس و کەوتی رۆڵەکان بە گشتی لاسایەک بوون لە ئاکار و هەڵوێستی دایکی مەزنیان. خۆش ئەوە بوو کە رەورەوەی رەوتی دایک و رۆڵەکان لە سەر چەرخی رەخنە و رەخنە گرتن دەگەڕا . واتە رەخنە گرتن لە خۆ و رەخنە گرتن لە تۆ، دەستێکی بە بێ وەستان بوو کە هومێد دەکرا قەت قەت نە هێڵێ ئاوەکە رابوەستێ و بۆگەن بکا. بەڵام سەقامگیر بوونی پایە و بناغەی نیشتمانی سۆڤیێت و ئەستوور بوونی قولایەی پێی ئەو دایکە میهرەبانە بە سەرئەستۆی رۆڵەکانیەوە، کێشی شیعرەکەی گۆڕی. دروشمی پیرۆز بوونی دایک و هەر مانی دایک، کرایە بەردی بناغەی بیر و باوەڕی رۆڵەکان و رۆڵەکانیش دەستیان لە ملدا کە لە پێناو زیندوو راگرتن و سەقامگیر کردنی ساختمانی سۆسیالیزم دا، وەک ئامراز و ئەسباب دەکار بکرێن و تەنانەت ئەگەر دایکی مەزن بە پێویست بزانێ فیداش بکرێن. ئۆرگانیسمی نیشتمانی دایکی مەزنیش لە لایەن سەرۆک و سەرداران و سالارانێکەوە بە رێوە دەچوو، کە دەگوترا ئەگەر ئەو خاوەن شکۆیانە یەکدەم دەستیان لە بەڕێوە بەرایەتی و سەر پەرشتیکردنی نیشتمانی مەزن کێشابایەوە، نە دایک دەما و زارۆکەکان و هەر هەمووی دەکەوتنەوە گەرووی سەرمایەدارانی ستەمگەر، هەر بۆیە بە پێچەوانەی دروشمە خۆش هەڵپێچراوەکان، سەرۆکایەتیی نیشتمانی مەزن کرایە هەموو شتێک و دایک و زارۆکەکان بوون بەهیچ. دایک و رۆڵەکان بوون بە کەرەسە و ئامرازی دەستی سەرکردایەتی و جێی تاکتیک و ستراتیژی گۆڕا. بە داخەوە چونکە رەگ و ریشەی درەختی حیزبە سیاسییەکانی وڵاتانی پێ لە بەندیش لە کانیاوی فەرهەنگی سیاسیی دایکە مەزنەکەیان ئاویان پێدەگەیشت، کە دایک بە داخەوە بەم دەردە چوو. ریشەی گیانی رۆڵەکانیش بەم ژاراوە سووتا و رۆڵی نوێ شەرعیەتی جیهانی وەر گرت و بوو بە رێبازی سیاسیی ئەستێرە سوورەکانی سەر پشتێنە شینەی دایە سووری. تەنانەت پاش هەڵبەزینەوەی سۆڤیێت و چین لە یەکتر، و پاش دابەشبوونی لایەنگرانی یەکدەستی جاران و تەنانەت پاش

خەت خەت بوونی ڕێبازەکە و پەیدا بوونی دەروێشانی جەزمکراوی سۆڤێت، چین و ئەڵبانی و... پاش وەدیهاتنی خەتی سێ، خەتی چوار، خەتی پێنج و... هەموو پارت و حیزبە لە هێلکە دەر هاتووەکانیش بە هەموو جیاوازی و دژایەتییەکانیشیانەوە، ڕیشە و ڕەگی سیاسەتەکەیان هەر ئەو بۆرە شەڕابەی پێدا دەگرێ، کە ماموستای یەکەمیان بە گەرووی داکردوون.

ئەگەر کراسی دەمار وشکی لە بەر خۆمان دابڕنین و لە دەروونی خۆماندا کڵاوی ویژدانمان(ئەگەر ویژدانێک مابێ ؟!) بکەینە قازی و بە چاوێکی بێ لایەنانە سەیری حیزب و پارت و تاقمەکانی ئیمڕۆی کوردی، ئێرانی، عەرەب، تورک و تەنانەت تەماشای حکوومەتە دیکتاتورەکانی مەڵبەندیش بکەین، دەبینی کە بە پێی ئاوی ڕژاو و بە گوێرەی خەتی دامەزراو، خەڵک مۆرەی بێ دەست و پێی بەر دەستی دەسەڵاتێکن کە ناویان حیزب-ە- لە حیزبەکانیشدا ئامانجی هەرە بەرز، سەرکاران و سەرۆکانی دەزگای بە ڕێوە بەرایەتیی حیزبەکانە. هەر ئەوانن کە دەیبڕن و دەیدروون ودەبەر ئەندامانی حیزب و دەبەر خەڵکانی دەکەن. بە کورتە کەلامێک، قازانج و بەرژەوەندی خەڵک و خاک و نیشتمان کراوەتە بازنەیەک و لە باسکی دەزگای سەرۆکایەتی حیزب کراوە. ویست و خواستی ڕەوای بەر هەق هەر هی ئەوانە. چوونە پێش و بادانەوە و کشانەوەش هەر بە دەستی ئەوانە. دروستکردن و خەڵک خستنە ژێر دەستی دۆست و دوژمنیش هەر لە توانای ئەواندایە. لایەنگر و سەمپاتەکانیشیان لە قابڵەمەی حیزبی کراون و بە گشتی یەخسیری دیواری قابڵەمەکانن. ئاسمانی بەر ڕوانگەی سیاسیی قابڵەمە نشینەکانیش هەر بە قەدرایە ئەو قابڵەمەیە دەبێ کە تێی خیساندراون. بێبەختی هەرە مەزنیش لە مە دایە کە نیشتە جێیانی هەر قابڵەمەش، بە فتوای قابڵەمە بەدەستەکان، دانیشتوانی قابڵەمەکانی تریان بە لاوە لە تور وگێزەر و سیر و پیازیش کەمترە. سەیر تر لە هەر سەیر و سەمەرەیەکی تری سەر ئەم دونیایە ئەوەیە کە ئێستاش کە ئێستایە، ڕەخنە گرتن لە خۆ و ڕەخنەگرتن لە تۆ هەر ماوە. بەڵام ڕەخنە گرتنیش بە هۆی سوڕان و جێگۆڕکێی جەوهەر و قاپێلکی بەتاڵ و بۆشی شتەکە، بە داخەوە سەرە و قون بوە و کراوەتە داری تۆڵە. داری تۆڵەیەک کە هەر بەس لە سەر و گوێلاکی کەسێک کاریگەرە. کە یەکتەن و تەنیا ماوەتەوە و لە دەسەڵاتی سیاسی

و نیزامی بێبەرییە. کێ لە گیانی خۆی تێر بوە با بە (بولقاسم) تێکی سەر کار بێژێت:« پشتی چاوگەلەکەت ئەبرۆ —س !!»
ئەم فەرهەنگە ئاڵۆزکاوە تەشەنای کردۆتە سەر تاکە کەسان و، دانە دانەی خەڵکی کوچە و کۆڵانانیش بەم دەردە گیرۆدە بوون. قازانجی خۆمان و ماڵ و ماڵباتمان بۆ دەمێک بکەوێتە بەر باری نالە باری، دونیا دەشێوێنین. ئەهلی شمشیر و چەک بین، بە چەک تۆڵە دەستێنینەوە. قەڵەمە کوڵەیەکمان هەبێ، قەڵەم تیژ دەکەینەوە و بە قەڵەم هیچی تێدا نامێڵینەوە. هیچ لایەکیشمان نەبێ، هەر بە چەشنی مرۆی هەموو شتێک دۆڕاندوو، پاشملە زمان دەر دەکێشین و هەزار و یەک قسە ساز دەکەین. بەڵام سەر جەمی شیر و تیرکێشانەکان و قەڵەم و زمان وەگەڕ خستنەکان، بە داخەوە، جگە لە دوژمنایەتی و نێوان ناخۆشی هیچ سود و بەهرەیەکی نە داوە و هەربەس بۆتە هەرا. وێنە و نموونەمان زۆرن لەم هەرایانە و لەم کورتە نووسراوەیەدا ناکرێ ناویان بەرین.
کاک کەریم- ی حسامی کە سەر و سەردەمێک لە بەشی هەرە بەرزی سەر کردایەتی حیزبێک دابوە و هەر ئێستا تاک و تەنیا کەوتۆتەوە و خەریکی نووسینی بیرەوەرییەکانی خۆیەتی، هاتۆتە بەر قەڵەمی ڕەخنەی چەند دۆست و ئاشنایەکی هاو خەباتی خۆی و کراوەتە ئامانجی نووکی قەڵەم. کتێبی ( وەڕاوە یا بیرەوەری)ی کاک ڕەسووی ئارییایی کە ویستراوە پەخشانێکی ئەدەبی پڕ لە سینۆنیمی کوردی ڕوو بە کاک کەریمی حسامی ڕابگیرێ، لە یەکەمین لاپەڕەیەوە هەتا ئاخرەکەی هیچ خێر و بێرێکی نە لە بۆ کورد تێدا دەست دەکەوێ و نە لە بۆ نووسەر بۆتە دارێکی کەللە شکێن و نە سەری کاک کەریم - یشی پێ شکاوە. بەس دەکرێ ناوی تۆڵە نامەیەکی ئەزۆکی لە سەر بنووسی و بە باوەشی لە بیر چوونەوەیەکی مردووی بسپێری.
کاک ڕەسوو، بە پێی نووسراوەکەی خۆی هەر لە کتێبەکەی خۆیدا ، لە سەرەتاوە یەکێک لە سەمپات و لایەنگرەکانی ئەو حیزبە بوە کە کاک کەریم و نۆ کەسەکەی تر( بە گوتەی کاک ڕەسوو) بۆ سەر کردایەتی کردنی حیزب لە گەرمێنەوە هاتوونەتەوە ئێران. نووسەری کتێب لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی کە یەکەمین ڕۆژانی دانانی بەردی بناغەی هەڵسوڕانی نوێی حیزب لە مەهاباد دا لە ماڵی کێ و دەگەڵ چ کەسانێک کۆ بۆتەوە و چۆن و چۆنیان هەوڵ داوە کە

ئەندامانی هەڵسوڕێنەری حیزب بگۆڕن و مۆرەی نوێ لە جێی مۆرەی کۆن دابنێن. تەنانەت ئاماژەی بە دۆستانی چەند ڕوویی خۆیشی کردوە و باسی ئەوەشی کردوە کە هاو پەیمانەکانی بۆ گەیشتن بە پلەی بەرزی سەر کردایەتی، ئەویان لە خوارەوە جێهێشتوە و خۆیان بەرز هەڵکشاون. بەڵام کاک ڕەسوو چونکە لایەنگرێکی بە وەفای حیزب بوە، بە ئەندامێکی سادە و ساکاری حیزب قایل بوە و هەتا گیران و بەند و زیندانی بوونی کاک محەممەد ئاریایی (موهەندیسی برای کاک ڕەسوو) و پاشی بەر بوونیشی هیچ گیرمە و کێشەیەکی دەگەڵ حیزب نەبوو. ئەگەر کاک کەریم-ی حسامی کە ئەو سەر دەمە کەسی دووەم یا سێهەمی حیزب بوە، لە کاتی بە جێدا بە فریای کاک محەممەد ئاریایی(موهەندیسی برای کاک ڕەسووی ئاریایی) گەیشتبایە و لە زیندانی (یانەی لاوانی مەهاباد) ڕزگاری بکردایە، نە کاک کەریم ئەمڕۆ دەدرایە بەر تۆپی سەت و بیست و پێنج میلی مەتری سەر شانی کاک ڕەسوو، نەڕەوان ناسێکی بێ ناو ونیشانی ناو دەفتەری کاک ڕەسوو، بە ناوی ئیرەکسۆن ، بۆ لە مەحەک دانی کەسایەتی کاک کەریم دەهاتە سەر کورسی داوەری، نە فیزیک و شیمی و مەتماتیک دەکرانە پێوانەی زانست و نە سەعدی شیرازی و نیزامی گەنجەوی بە گژ حسامی دادەکران، نە کاک کەریم جارێک دەبوو بە ئاخۆران باخۆرانێکی دوو باڵی تودە و دێموکرات( تودە کراتی کاک ڕەسوو) و لە چەند لاپەڕی تردا دەبوو بە دەست و پێ سپیلکەیەکی مێشان خواردوو، نە خوێندکارانی دانیشگای قەلادزێ ناویان دەکەوتە نێو کتێبان. نە ئەحمەد و مەحمود و عەلی و... کە هەمووی و هەموویان دەست بە هەویرانێک بوون وکاک ڕەسووش لە کتێبەکەیدا ڕەدە بەندی کردوون، چەندێکیان بە فەرموو فەرمووی کاک ڕەسووی ئاریایی دەستیان لە دەستی کاک ئەحمەدی شێخ خاوێنتر دەبۆوە و نە هەر تەنێ یەکێکیان دەکەوتە بەر کێردە دەم پاچاوەکەی کاکە ڕەسوو. نە ماموستایەکی بە غیرەت و بە شەرەفی مەهابادی بە فەرمودەی نابەجێی کاک ڕەسوو دەبوو بە هەلپەرست. نە کاک ڕەسووی ئاریایی لە شۆڕشی کوردستانی ڕۆژ هەلات دا شاڕۆڵی هەرە مەزنی دەخرایە ئەستۆ و جارێک لە زیندان و جارێک لە مەیدان دەهاتە هەوڵ و هۆ، و دەیان و دەیان (نە)ی تریش نە دەخولقا. ئەگەر کاک کەریم هەر ئیمڕۆش وەکی جاران لە سەر کردایەتی

حیزبدا مابایە.

کەس نەزانێ و کەس نەیناسێ، من باش دەزانم کە کاک ڕەسووی ئاریایی ماموستایەکی زەحمەتکێشی مەهابادی بوە. زانایە لە دەرسەکەی خۆیدا کە دەرسی مەتماتیکە. هەر ماموستایەکیش - بە گوێرەی یاسای ئەو وڵاتەی کە من و کاک ڕەسوو لێی هەڵاتووین - بۆ وەر گرتنی جەوازی کاری ماموستایەتی، دەبوو سەرەتەقەیەکی لە ڕەوان ناسی منداڵ بکردبایە. بەڵام زانستی ڕەوان ناسی هەر ئەوەندە نیە کە من و کاک ڕەسوو لە خوێندنگەی پەروەردە کردنی ماموستایاندا خوێندوومانە. ئەگەر بە وردی سەرنجێک بدەینە ئەم زانستە و لە دونیای پێشکەوتوودا بایخەکەی هەڵسەنگێنین، تێی دەگەین کە لە هەر وڵاتێکدا چەند گۆڤاری مانگانە، وەرزانە و ساڵانەی تایبەت بەم زانستە لە چاپ دەدرێن و بڵاو دەکرێنەدە. بگرە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی تریشدا گۆتاری تازەی ڕەوان ناسی لە چاپ دەدرێن. بە پێی گەشەی تەکنیک و بە گوێرەی تێهەڵچوونی زانست، زانستی ڕەوان ناسیش توێلکی تەنکی جارانی هاویشتوە و هەتا ڕۆژگاری بە سەردا تێپەڕێ، ئەم زانستەش بە بۆچوونی تازە و تازە ترەوە دێتە بەری مەیدان. گەلێک بیر و بۆچوونی ڕەوان ناسانی پێشوو بەر پەرچ دراونەتەوە و بیر و بۆچوونی نوێ جێی پڕکردوونەتەوە. خۆ ڕەوان ناسی نە گایە لە پێستێکدا پیر ببێ و نەزانستی ( ناب)ی مەتماتیکیشە کە ئاڵ و گۆڕ بە خۆیەوە نە بینێ. چ مرۆڤ لە سەر دنیادا بژی و چ نەژی، فۆرمۆڵەکانی مەتماتیک هەر لە سەر ئەساسی خۆیانن و هەر دەمێنن. بۆ وێنە، دوو جاران دوو، هەر دەبێتە چوار. هەزار ساڵ بەر لەمە لە ئورووپا و لە نێو مەنگوڕان و لە بێساران و لە هیندستانیش هەر دەبوو بە چوار، ئێستاش هەر چوارە و نەبۆتە پێنج. بەڵام زانستی ڕەوان ناسی، زانستێکە گرێدراو بە مرۆڤ و کۆمەڵانی ئینسانی دەتوانێ لە بیچم و سیستەمە کۆمەڵایەتیە جیا جیاکاندا ڕەنگی جیا جیای هەبێ. بۆ وێنە ئەگەر بگەڕێینەوە دەوری حەفتا ساڵ بەری ئێستای شارەکەی من و کاک ڕەسوو، شاری مەهاباد، شاری چی ؟ گوندێکی کەمێک پڕ حەشیمەت! پیشە و کاری خەڵکەکەی چ بوو؟ شێوەی بەڕێچوون و گوزەرانیان چۆن بوە؟ بێشک نە کارگەیەک لە گۆڕێدا بوە و نەپیشە سازی و بازرگانی و سات و سەودایەکی ئەوتۆ کە بکرێ ببێتە هۆی جیاوازیەکی مەزنی چینایەتیی

نێوان خەڵک. لە دێ و دێهاتەکانی دەور و بەریشیدا دیارە چۆن بوە. نۆمادیسم و کەلک وەر گرتن لە بەرهەمی ساکار و لە بەر دەستانی ناو خۆڕست، هەڵکۆڵینی شاخ و ساز کردنی چوار دیواری کورت و کەم بالا بۆ حاوانەوەی شەوانە، گەلە کۆمەگی و هەرەوەز کردنی کۆمەڵایەتی، کوڕ بە قەرز دان بۆ کار بە یەکتر، کچ بە بزن و مریشک گۆڕینەوە، ژن بە ژنە و هەزاران شتی تریش ڕووەمەت و ڕواڵەتی ژیانی خەڵکی ئەو سەر دەمەی وڵاتەکەمان بوە. شێوەی عاملاندنی منداڵیش لاسایەک بوو لە شێوەی ڕاهێنان و پەروەردەکردنی ئیسلامی کە ئەویش خۆی لاسایەک بوە لە شێوەی تەربیەتی ئەرەستوویی(ئەرسطاتالیس)ی یونانی. واتە بە سەر دادان، جەزرەبە دان، سوکایەتی پێکردن و عاملاندن. ئەم ڕەسم و نیزامە هەر بۆ کەریم و ڕەحیم - ە کان نەبوە، ئاسمانێک بووە و بە سەر دونیای هەموو خەڵکی ئەو سەردەمەی قەڵاتەکە ماندا کێشراوە. ئەگەر من لە گوندی خۆمانەوە ڕەوانەی گوندێکی تر کرابم، کاک ڕەسوو پێی وانەبێ لە قاسمە ڕەشەوە نارد را بێتمە ستۆکهۆڵم. پێی وانەبێ ڕەحیم شەربەت و شەکراوی بە گەروو دا دەکرا و من تالاو! منداڵی نێری ئەو سەر دەمە یاریدەری باری ئابوری ماڵی خۆیان بوون. لە کۆمەڵی ئەو سەر دەمەدا، بنە ماڵەی بێ بەرخی نێر بە وەجاخ کوێر ناسراوە. ئەو سەر دەمەی کە هی وەک کاک کەریم دەورانی منداڵی تێدا تێپەڕ کردوە، کوڕ بە قەرزدان بۆ کار شتێکی زۆر ئاسایی بووە. لێدان و سەر کوتانەوەش ئاسایی بووە. باوک، دایک، خاوەن زەوی، مەڕدار، پیشەوەر، مەلا، ماموستا و هەمووی و هەمووی کوتەک بە دەست چوونە جەستەی منداڵەوە. کوتەک - بە قوربانی نەبم - دەیانگوت لە بەهەشتەوە هاتوە. لە کاتی توڕە بوونی هەر یەک لە وانەی کە ناومان بردن، هەم کوڕی خۆیانیان بێزار دەکرد و هەم یارمەتیدەرەکەیان دەکوتا. ئەو هەست بە سەر کزی کردن و شکانەوەی کەسایەتیی کە ئیرەکسۆنەکەی کاک ڕەسوو فەرموویەتی، لە کۆمەڵێکدا پێک دێت، کە کۆنە دەوارێک، وەک پینە گەوتبێتە سەر گەوای مەخمەری خەوانێنێک و وەک ڕۆژی ئاسمان خۆیا و ئاشکرا بێ. ڕەنگە ئەگەر کاک ڕەسوو ئەو ئیرەکسۆنە بخاتە ناو شەمەنەفەرێکی خەیاڵی و بەرە و کوردستانی حەفتا ساڵ لە مەو بەری بنێرێت، حەکیم باشی لە گەڕانەوەیدا گەلێک گلەیی لە کاک ڕەسوو بکا و بڵێ :«

ئەو نوسخـە و ڕێسێپتـەی کە لۆ نەخۆشی ئۆرووپیم نووسیوە، تۆ بە چ هـەقێک لە بۆ خەڵکی کەس نەکێڵ وبەردەڕەقانی حەفتاساڵ لە مەوبەرت دەکار هێناوە ؟!

لە نێو کۆمـەڵی مـامۆستـایانی شـارەکەمـاندا، مـامۆسـتـای زانا و شـارەزا لە کاری دەرس گوتنەوەمـان کەم نەبوون. یەکێک لەو مامۆستـایانەدا کاک ڕەسووی ئاریایی بوو. ئەوەندەی کە من بیناسم و ئەو ناسینەش لە سەر دەمی منداڵییەوە دەست پێدەکا و سەراسەری ژیانی پیشـەیی تا ئێستای ناو براو دەگرێتەوە. ئەوم هەر بەس وەک مـامۆستـایەکی شـارەزا لە کاری دەرس گوتنەوەدا ناسیوە. دیارە لە سـەر دەمی ڕاپەڕینی سـەر تاسـەریی خـەڵکەکـانی ئێـرانیـشـدا کـە سیـاسـەت ببوە شـتـێکی بێ زیان لە بۆ پەز، کاک ڕەسوولیش هەر وەکی خۆی نووسیویەتی بۆرە چاو پێکەوتنێکی دەگەڵ ئەم و ئەوێک دەست کەوتوە. بەڵام بۆ چی کاک ڕەسوو نەیتوانیوە ڕێی بکەوێتە بەشی سەر کردایەتیی حیزب و هەر وەک ئەندامێکی سادە و ساکار ماوەتەوە.؟ پێم وایە هۆیەکەی ئەوە بوە کە ئەو بە تەواوی قۆڵی لە سیاسەت هەڵنەمالیوە و هەم دڵی بە ماڵی دونیاوە بەند بوە و هەمیش بە قیامەت. ڕەنگە لە جوابم دا بڵێ:« نە خێر وانیە وهۆیەکەی ئەوەیە کە من کرووبی سـەر کردایەتی حیزبم بە دڵ نەبوە بۆیە خۆم نەداوەتـە بەر.» منیش ناچارم بڵێم:( دەی خۆ ئەو دەم گەلێ دوکانۆکەی سیـاسی دیکەش هەبوون، ئەدی بۆ دەسـتت لەو لا هەڵنەگـرت وتە هاتیتـە باوەشی یەکێکی پڕ بە پێستی خۆت). دیسان ڕەنگە لە جوابمدا بڵێ:« خۆ بیر و باوەڕ کراس و کەوا و کڵاو و پشتوێن نییە کە وەک هەندە چۆخ سیاسەتبازێکی ناو خۆمان، ڕۆژیان لێ نوێ بێ و حیزبیان لە نوێ بێ و بە پێی ڕۆژ جلکی سیاسی بگۆڕن».

لە کتێبـەکەی کاک ڕەسـوو دا شتێکم زۆر بە لاوە لێڵ و شاراوە و ونە، ئەویش ئەوەیە کـە لە سـەر دەمی وتو وێژی هەیئـەتی نوێنەرایەتی گـەلی کـورد دەگـەڵ هەیئەتی دەوڵەت دا، ئەگەر چی کاک ڕەسوو قەت یەکێک لە ئەندامانی هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد نەبوە و بە گوتەی خۆی ئەندامێکی سادەی حیزبیش بووە و تـەنانەت بۆ دانی هـەقی ئەندامـەتیی حـیـزبیش دەبوایە پسـوولە ڕەش بکاتەوە، نازانم بۆ چی لە (ساختمانەکانی سەددی مەهاباد) دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت بۆ وتو وێژ دانیشتوە!! شایانی باسە بڵێم کە شوێنی کاری دەبیرخانەی هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد( ساختمانەکانی سەددی مەهاباد) بوو. هەر

وەها ئەمەش بڵێم کە هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد بۆ وتو وێژ دەگەڵ ناردراوەکانی ئیمام، بریتی بوو لە نوێنەری هەموو حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی ڕۆژ هەڵات کە حیزبی سەرەکیی کوردستانی ئەو سەر دەمە ( بە قەولی خودی حیزبی دێموکرات)، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانیش چەند نوێنەری لەو هەیئەتەدا بوو کە کاک کەریمی حسامی - ش یەکێک لەوان بوو.

ئەندامانی دەبیرخانە - نەک هەموو ئەندامانی هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد - هەموو ڕۆژێ لە ساختمانەکانی سەددی مەهاباد خەریکی کار بوون و ئەوەی کە کاک ڕەسوو ئاماژەی پێکردوە، تێی هەڵەنگوتون و نەیان بینیوە. لە نووسراوەکانی کاک ڕەسوو( ئەگەر ڕاست بن)، وادەر دەکەوێت کە حیزبی دێموکرات بۆ وەدەستهێنانی مافی خود موختاری، لە تاکتیکی جوراو جور کەلکی وەرگرتوە و بە یارمەتی وەرگرتن لە ئەندامانی ژێرای هەرە ژێراشی و، بە نهێنیش بۆ وتو وێژ دادەکشاوە. هەر چەند کە بە پێی ئەزموونی وەدەست هاتومان ئەوە نە کارێکی باشە، بەڵام هەر چی هەیە و هەر چۆنێکە، بە هیواین ڕابردوو ببێتە چرایەکی ڕوناکیدەری داهاتوومان و چیدی لە تاریکیدا دەست بە چاوی بەستراومانەوە نە گرین. هەر وەها هیوادارم کاک ڕەسوو-ش قەڵەمی ڕەخنە گرتن بگرێتە دەست ولە شەڕە شەق خۆ بپارێزێت. کێشەی شەخسی و بنە ماڵەیی بۆ کتێب ڕەشکردنەوە نابێ و نای هێنێ تەنانەت چاویشی پێدا بخشێنی. لە شۆرشی تێدا چووی کوردستانی ڕۆژ هەڵاتدا تاکە کەسێک خستنە ژێر شوشەی بلووری ئاگرابیسمان و هەزار و یەک جوێن و نە شایست و نە بایست ڕێز کردن، کوا کەی دەرمانی دەردی ئەو میللەتەی لێ چێ دەبێ و کێهە تاوانکاری پێ سزا دەدرێت ؟ پێم وایە ئەگەر کاک ڕەسوو نیاز و نەزەری خزمەت بە گەل و نیشتمانی کوردان بوایە، کەوشی ئاسنی دەکردە پێ و گۆچانی ئاسنی دەگرتە دەست و سەری خۆی هەڵدەگرت و بە دوای لێکۆڵینەوەی دەرد و ئازار و نەخۆشیەکانی ئەم چارە ڕەشە دا دەڕۆیی. دەرمانی دەردی ئەم گەلە، لێکۆڵینەوە و دۆزینەوە و دەر خستنی دایک گەرای نە خۆشینەکانە، نەک ( ئەی نەنە من غەریبم) ی کاکە ڕەسوو.

کۆتەرەی دارێک بکەیتە لەمپەری بەر ڕوانگەی قەڵەم، دارستان و لێرەواری

مەزنت لە بەر چاو بزر بێت. دارستانەکە قەوغایە و دەیان داری خوار و سەتان درەختی ڕاستی تێدایە. کین و ڕکە بەریەتی شەخسی لە دڵ بشۆرەوە و سیلەی چاوی قەڵەمەکەت لەم تاکە دارە بگوێزەوە و ورد سەیری لێڕەوارەکە بکە، ئەگەر نیازی خزمەت بە دونیای دارستانەکەتت لە دڵ دایە و دەتەوێ دارستانەکە لە نەمان بپارێزی، ئەم چاویلکە ڕەشە لە بەر چاوی قەڵەمەکەت وەلابەرە وسیستەمەکان بەرکەوانی هەللاج بدە و موو لە ماست دەر بکێشە، ئەگینا نووسراوەکەت بە چارە نووسی بڵقی سەر ئاو دەچێت و دەبێتەوە هیچ.

---

** قەرار بوو ئەم نووسراوەیە لە گۆڤاری گزنگدا چاپ بکرێت. بەڵام کاتێک ئەم نووسراوەیە گەیشتە دەستی سەر نووسەری بە ڕێزی گۆڤاری گزنگ، سەر نووسەر بە تەلەیفون پێی گوتم کە ئەوا خەریکە بە گۆڤارەکەدا دەچێتەوە و گۆڤارەکە جێی چاپکردنی ئەم نووسراوەیەی نە ماوە و بۆ ژمارەی داهاتوش چونکە کتێبەکەی کاک ڕەسووی ئاریایی بە شێوەیەکی شەخسی بڵاو کراوەتەوە، کە وایە گۆڤاری گزنگ ئوباڵی ئەم نووسراوەیە بە ئەستۆی خۆی ناگرێ و واباشترە بە شێوەی شەخسی لۆ دۆست و ئاشنایان ڕەوانە بکرێت. ئەوا منیش دەگەڵ سوپاسێکی زۆر بۆ گزنگ و سەر نووسەرەکەی پاش پێدا چوونەوە و نەختە دەست پێدا هێنانێک، بۆ چەند دۆستێکی دەنێرم.

کد.ارتاش.

**نامەیەکی دۆستانە کە لە لای منەوە بێ وەڵام مایەوە**

مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی.

۲۵/۱۱/۷۳

بە ڕێوە بەرانی بە ڕێزی بڵاو کراوەی سەر دەمی نوێ

بە سلاوێکی شایان ڕێزێکی بێ پایانەوە ! لە دوورەوە دەستی گەرمی پڕ لە میهری ئەدەبدۆستانە و فەرهەنگخوازانەی یەک بە یەکی ئێوەی خۆشەویست دەگوشین و ئاواتە خوازی سلامەتی و ژین خۆشی هەمووتانین لە پێشگای خوای مەزندا.

دۆستان و هاوکارانی خۆشەویست و دڵسۆز! ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیء ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی، بەو پەڕی شانازی و سەر فرازی یەوە، تێپەڕ بوونی دەیەمین ساڵی تەمەنی خۆی لە پێناو خزمەتکردن بە فەرهەنگ و ئەدەبی هەموو کوردەکانی جیهان بە گشتی و کوردەکانی ئێران بە تایبەتی، ڕادەگەیەنێ.

ئەم ناوەندە بە تێبینی یەوە لە سەر ئەو باوەڕەیە کە سەر کەوتنە نیسبی یە وە دەستهاتوەکانمان سەبارەت بە ڕاگرتن و ڕێز گرتن لە بنە ما و بایەخە فەرهەنگی ـ ئەدەبی یەکانی گەلی کورد و هەر وەها بەرز کردنەوە و پەرە پێدانیان، بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە سەر هاو کاریی بە بێ گەرد و هەمە لایەنی یەکانی هەموو زانایان، هۆنەران، نووسەران، مێژوو نووسان، توێژکاران و هونەر مەندانی بەڕێز و خۆشە ویستی خەڵکی کورد لە سەرانسەری جیهاندا. بەم بۆنەوە بەڕێوە بەرانی ئەم ناوەندە ئەرکی سەر شانی خۆیان دەزانن لەم هەلە ڕەخساوە دا، لە هەموو ئەو بە ڕێزانەی کە لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوو دا، بە هەر شێوەیەک یاریدەیان داوین، لە ناخی دەرونەوە سپاس بکەین و هەقناسینی خۆمانیان پێشکەش کەین و ڕێزی دوو بارەی خۆمانیان پێ ڕابگەیەنین.

گومانی تێدا نیە، لە جهانێکدا کە بە داخەوە دیمەنی دزێوی گێرە و کێشە، سەر کوتکردن، خوێنڕشتن، ناتەبایی و نا باوەڕی بە شێوەیەکی پڕژ و بڵاو

هەموولایەکی گرتۆتەوە، تێکۆشان و هەڵسوڕان لە سەر کار و باری فەرهەنگی و زانستی و لە سەر هەموویاندا خزمەتکردن بە ئەدەب و کەلە پوری گەلانی بەشخوراو ـ لەو نێوە دا گەلی کورد ـ نەک هەر بە نرخ و پیرۆزە وگرنگی تایبەتی هەیە، بەڵکوو ئەم کارە دەتوانێ دیاری کەر و بوار پێکهێنەری دامەزرانی عەدل و داد و بەرابەری فەرهەنگی لە نێوان گەلە جۆراو جۆرەکاندا بێ ولە لایەکی دیکەشەوە هەڵگری پەیامی هاو دڵی نەتەوەیی و نێو نەتەوەیی و هەر وەها پردی زانست و تێگەیشتن لە پانایی دونیا دا بێ. ئەم خاڵانە لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەکی دامەزراندنمان و سەر دێڕی بەرنامەکانمان لە بە ڕێوە بردنی ئەم ئەسپاردە فەرهەنگی یە دا پێکدێتن.ئەسپاردەیەک کە وەدەستهێناتی سەر کەوتنە داهاتوەکانی، دیسان لە گرێوی هاریکاری لێبڕاوانە و بێدرێغی نووسەران و ڕووناکبیرە گەلی یەکانی کورد دایە. لە کۆتاییدا بە خۆمان ڕێگا دەدەین سەبارەت بەو کەم لوتفی یەی کە دەر هەق بە ئێمە لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوو دا بە شێوەی هەڵبڕینی پەیوەندیتان لە گەڵ ئێمە و خۆ پاراستن لە بەرێکردنی بەرهەمەکانتان بۆ ئێمە ( بریتی لە گۆڤار وکتێب)خۆی نواندوە، گلەیی و سکاڵای دۆستانەتان لە گەڵدا بکەین، و بە گەرمی داواتان لێ بکەین کە دەرکی دەست ڕاگەیشتن و پەیوەند گرتنمان لە گەڵ یەکتر، لە سەر دامەخەن، کارێک بکەن کە هیچ نە بێ لە وەڵامی نامەکانماندا یان ئەو گۆڤارە مانگانە کە دەنێرینە خزمەتتان، ئێوەش بە سەرمان کەنەوە و جار و بار لە ڕێگای هەناردنی نامە و بڵاو کراوەکانتان بۆ ئێمە منەتبار و بەختەوەرمان بفەرموون. لێگەڕێن با بە هاو دڵی و هاریکاری دوو لایەنە لە پێناو بەرز کردنەوەی پلەی هاو کاری یە فەرهەنگی یە بە نرخەکەماندا هەنگاوی گورج و گۆڵ هەڵێنینەوە. بەڕێزەوە ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی.»

بە داخەوە ئێستا کە ئەم نامەیە لێرەدا دەنووسمەوە هەست بە هەڵە ی خۆم دەکەم کە بۆ چی وەڵامی نامەکەم نەداوەتەوە و نووسراوەکانی خۆم بۆ نەناردوون. خۆ من بە پێچەوانەی هێندێ حیزب و ڕووناکبیری کورد لە سەرەتاوە هەنگاوی مامۆستا هێمنی ڕەحمەتیم بۆ دامەزراندنی گۆڤاری سروە بە هەنگاوێکی پیرۆز و جێگای سوپاس و تەقدیر زانیوە و گۆڤاری سروەشم پێ

ئەستێرەیەکی پرشنگدار بوە لە ئاسمانی ئەو ساو ئێستای ئەدەب وزمان و کەلەپوری کورد لەکوردستانی ئێراندا و خزمەتێکی لە رادە بەدەر گەورەی بە بوژانەوەی وشە و ئەدەب و کلتوری کوردی کردوە. هەزاران لاوی کوردی نەک فێری زمانی کوردی کردوە، بەڵکوو شاعیر و نووسەر وپەیجووی شارەزاو هەڵکەوتووی لەم بەشەی نیشتماندا پێگەیاندوە و بە کۆمەڵی ناساندوون. جا من کە ناتوانم بڵێم بۆ چی نامەی وانم بێ وەڵام هێشتۆتەوە و خۆم بە خەتا بار دەزانم و داوای لێ بووردنیان لێدەکەم. جێگای سوپاسە، ئەوان بێ لە بەر چاو گرتنی هەڵە و کەمتەرخەمی من، بە رێک و پێکی گۆڤاری سرەوەی ئازیزیان بۆ ناردووم و لە بیریان نەبردوومەوە.

### نامە و نووسینی مامۆستا دوکتۆر جەمال نەبەز لە سەر بیرەوەرییەکانم

لە رادیۆکانەوە ئاگادار بووم کە کۆڕێک لە سەر بار و دۆخی کوردستان بۆ دکتور جەمال نەبەز ساز کراوە. من کە لە مێژ بوو بە خزمەت مامۆستا نەگەیشتبووم و لە کاتی خۆیدا لە بەغدا ساڵەکانی ١٩٦٠-١٩٥٩ ئێمەی لێقەوماو زۆر جار بە خزمەتی دەگەیشتین و بەو ئیعتیبارە کە ئێمە کوردی ئاوارەین و ئەویش سوتاوی کوردستان و کوردایەتیە، رێزی لێ دەگرتین و لوتفی هەبوو. دەرفەتێک هاتبوە پێش کە هەم لە باسەکەی کەلک وەر بگرم و هەم دیدارێک تازە بکەمەوە. دەگەڵ چەند برادەرێک چووینە کۆڕەکە و دوای تەواو بوونی چوومە خزمەتی و یەکترمان ناسییەوە وچاک و چۆنیەکی دۆستانەمان کرد و داوەتم کرد کە بە سەردانی ماڵێ سەربەرزمان بکا و سەر جەمی بیرەوەرییەکانیشمی وەک دیارییەکي ناقابیل پێشکێش بکەم. مامۆستا فەرمووی: زۆر بە پەلەم و هەر ئێستا دەبێ بگەرێمەوە بۆ بیرلین. زۆرم پێخۆشە کتێبەکانت ببینم و ئەگەر بۆم بدەی بە کاک بورهانی مام توفیق مەمنون دەبم. گوتم سوپاست دەکەم ئەگەر پاش خوێندنەوەیان شتێکیان لە سەر بنووسێ تا لە دوا رۆژ دابۆ نووسینیەکانی دیکەم ببێتە رێنوێن و دەرسی لێ وەر بگرم. مامۆستا گوتی: « پاش خوێندنەوەیان لە سەریان دەنووسم کە لە پێشەکی

بەرگی دەیەمدا بڵاوی بکەیەوە.

من ٩ بەرگی بیرەوەرییەکانم تەسلیمی کاک بورهانی مام تۆفیق کرد کە بۆی بنێرێ. پاش ماوەیەک ئەم نامەیەی مامۆستا جەماڵ نەبەزم پێگەیشت

«.... بەرلین ١٩٩٥/٥/٢٥ کاک کەریم گیان.

پاش سڵاوێکی گەرم و چاک وچۆنی یەکی خۆمانە، سوپاسێکی پڕ بە دڵ بۆ دیاری یە بە نرخەکەت. هەر نۆ بەرگەکەی « بیرەوەری یە کان» تم بە هۆی هاورێ ی خۆشە ویست کاکە بورهانی مام تۆفیقەوە پێگەیشت. جا لە بەر ئەوەی ئەدرەسەکەت نازانم، تکام لە کاکە بورهان کرد کە ئەم نامەیە بگەیە نێتە دەستت. بەڵێنی دا کە ئەو کارە خێرە بکات، ماڵی ئەویش و تۆیش ئاوا بێ. لە خوێندنەوەی« بیرەوەری یەکان» دا جارێ گەیشتوومەتە بەرگی شەشەم. بەڵام بە خوێندنەوەیان یەکجار دڵم خۆش بووە، چونکە ئەمانە هەر« بیرەوەری» تۆ نین، بەڵکوو لاپەرەیەکیشن لە مێژووی، لە گەلێک لاوە بە ژێر خۆڵەوە کراوی نەتەوەی کورد، کە تۆ تۆمارت کردوە و لە گەڵ خۆت نەتکردوە بە ژێر خۆڵەوە. ئافەرمت لێ بێ. خۆزگە ئەوانەی نێوت بردوون و بەشداری ئەو کارانە بوون کە باستکردوون، ئەوانیش- ئەگەر هێشتا ماون- دەستیان دەدایە پێنووس و کارێکی وایان بە ئەنجام دەگەیاند، ئەو سا بە بەراورد کردنی بە سەر هاتی گشت لایەک ، دیرۆکی سەردەمێکی پڕلە کارەساتی بزووتنەوی کوردایەتی ڕۆشنتر دەبوومەوە. وا لە سەر فەرمودەی خۆتان بڕیارم دا پاش لێبوونەوەم لە خوێندنەوەی بەرگی نۆیەم، پێشەکی یەک بۆ بەرگی دەیەم بنووسم، لە وێ دا باسێکی ئەو سەر دەمەش بکەم کە لە خوارووی کوردستان یەکدیمان ناسی و دوایی لە دوکانەکەی مامۆستا بەشیر موشیرلە بەغدا زوو زوو چاومان بە یەک دەکەوت. جا تا ئەو کاتە بە شادیت دەسپێرم و هەر بژیت. برات جەمال نەبەز.»

پاش ئەم نامەیە ماوەیەکی زۆری پێچوو هیچ خەبەرێک لە مامۆستا ونووسینەکەی نەبوو. منیش بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانم تەواو کرد و لە بولغارستان چاپکرا. پاشان ڕۆژێک کاک بورهانی مام تۆفیق تەلیفۆنی کرد و گوتی: نامەیەکی دوکتۆر جەمال-م بۆ هێناوی. زۆر شاد بووم و چووم وەرم گرت. پاکەتێکی قەبە و نامەیەک و٢٣ لاپەڕەی دەستنووسی مامۆستای تێدا بوو. گورج دەستم کرد بە نووسینەوەیان لە داتا و لە گەڵ نووسراوەیەکی خۆم

بۆ ئەوەی پێیدا بچێتەوە و نەکا هەڵەی چاپی هەبێت، بۆم ناردەوە. وا لێرەشدا دەقی نامەکەی دوکتۆر جەمال نەبەز و نووسراوەکەشی کە بۆ پێشەکی بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانمی نووسیوە بڵاو دەکەمەوە.:

«.... بەرلین ١٩٩٦/٦/٦ .... برای بەڕێز و خۆشەویست مامۆستا کەریمی حیسامی.

سڵاوێکی برایانەت لێ بێ و هیوام وایە تەندروست و بێ وەی بیت. بە هۆی برای خۆشە ویست کاکە بورهانی مام تۆفیقەوە ئەوە چەند لاپەڕە دەنێرمە خزمەتت کە بۆ پێشەکی بەرگی دەیەمی «بیرەوەری یەکان» ت نووسیومە. هیوام وایە بیر و ڕاکانمت بە دڵ بێ و تکای برایانەشم ئەوەیە پاش تایپ کردن و ئامادەکردنی بۆ چاپ جارێکی دیکە ڕەوانەی بکەیتەوە تا ئەگەر هەڵە و ناتەواوییەکی تێ کەوتبێ، بتوانم ڕاستیان بکەمەوە. هەڵەی چاپی، جار و بار مانا دەگۆڕن و دڵ تێک دەدەن.

نازانم بەرگی دەیەمت تا ئێستا تەواو کردوە ، یان جارێ هەر خەریکی نووسینەوەیت. تکایە ئەگەر بەرهەمێکی دیکەشت بە دەستەوەیە بۆچاپ، ئەوا لە گەڵ دەرچوونی لە ژێر چاپ، دانەیەکی بنێرە بۆ برای خۆت.

هەر بژیت و سەر کەوتوو بیت.     برات جەمال نەبەز.»

**ئەمەش دەقی نووسینەکەی مامۆستایە : « لە جیاتی پێشەکی »**

«... پاش ئەوەی برای بەڕێز مامۆستا کەریمی حسامی نۆ بەرگی «بیرەوەری یەکان» ی خۆی بە چاپ گەیاند، ڕووی دۆستانەی لە من نا، پێشەکی یەک بۆ بەرگی دەیەم بنووسم. بێگومان حەزم دەکرد دەستنووسی بەرگی دەیەمیشم بدیایە، ئەو جائەم پێشەکی یەم بنووسایە. بەتایبەت ئەو بەرگە کاتێک دەر دەچێ کە بارو دۆخی کوردستان و خۆر هەڵاتی ناڤین پاش جەنگی عێراق و کوێت و دامەزراندنی« هەرێمی ئاسایش» لە باشووری کوردستاندا، و لێک نیزیکبوونەوەی عەرەب و ئیسرائیل، لە هێندێک ڕووەوە گۆڕاوە، و هەلو مەرجی نێو دەوڵەتانیش پاش هەرەسهێنانی رژێمی سۆڤێت، لە شێوەی جاراندا نەماوە. بەڵام داخەکەم دەستنووسی بەرگی دەیەمم لە بەر دەستدا نەبوو. هەرچی چۆنێک بێ، هەر نۆ بەرگەکەم بە کاوە خۆ و بە هوردی خوێندەوە. ئەوەش

کاتێکی زۆری برد، بەڵام خۆشی یەکی زۆریشی دا پێم.
مامۆستا کەریمی حیسامی یەکێکە لە برا کوردەکانی ڕۆژهەڵات کە لە کۆتایی پەنجاکانەوە دەیناسم. ڕاستی یەکەی سەرەتای ناسیاری پەیدا کردنم لە گەڵ براکوردەکانی ڕۆژ هەڵات دەگەڕێتەوە بۆ دەستپێکی پەنجاکان. لە پێش هەمووشیاندا بە ڕێز غەنی بلوریانم ناسی، چونکە لەو سەر دەمەدا بە نێوێکی خواستەمەنی یەوە( کە لە بیرم نەماوە) بە دزی یەوە هاتوو چۆی سلێمانی دەکرد و سەری مامۆستا برایم ئەحمەدی دەدا. کە منیش هاتو چۆیم دەکرد، و پێکەوە( واتە لە گەڵ مامۆستا برایم) لە ڕێ و شوێن دەگەڕاین بۆ پێشخستنی زمانی کوردی. ئەو جا لە بەغدا و لە نیوەی یەکەمی پەنجاکاندا بە هۆی مام جەلالەوە خودێ لێ خۆشبوان حەسەن زیرەک و ئەوڕەحمانی هەژاریشم ناسی. حەسەن زیرەک لە هوتێلێکدا لە شەقامی ڕەشید کە خاوەنەکەی کورد بوو، بە نێوێکی خواستەمەنی یەوە کاری جێ ڕاخستنی دەکرد. هەژاریش بە نێوی خواستەمەنی« ئەزیز» ەوە لە گەڕەکی فەزل « الفضل » لە بەغدا، لە گەڵ جەلال بێتووشی دا، دوکانێکی وێنە گری هەبوو. لە کۆبوونەوەیەکی نهێنی دالە « بەغداد جدیدە» بۆ ئاشتکردنەوە و لێکدانەوەی باڵی هەمزە عەبدوڵلا لە گەڵ باڵی برایم ئەحمەد لە نێو پارتی دا، کە بە دەستپێشکەریی من ساز کرابوو، خودێ لێ خۆشبوو ئەوڕحمانی زەبیحیشم ناسی( کە نێوە خواستەمەنی یەکەی قادر) بوو. لەو سەردەمەدا لە یانەی شەوانە-ملهی- عەبدوڵلا سنەیی کاری دەکرد، ئەو یانە شەوانەیەی کە مامۆستا گۆران لە هۆنراوەکەی دا« شەوێک لە عەبدوڵلا» باسی دەکات. لەو کۆبوونەوەیەدا مامۆستا برایم ئەحمەد( کە ئەو کاتە خۆی لە میری شارد بووەوە، لە بەر ئەوە شێوەی خۆی کەمێک گۆڕیبوو) غەنی بلوریان و حیلمی عەلی شەریف و زەبیحی و من بەشدار بووین. لە ساڵی ١٩٥٦دا، کاتێک کە مامۆستا بووم لە قوتابخانەی نێوەندیی موسەڵلا لە کەرکووک، شەهید ئەوڕەحمانی قاسملو، لە سەر ڕاسپێری خودێ لێ خۆشبوو، مامۆستا حەمە توفیق ووردی، بە دزی یەوە هات بۆ لام. هاتنەکەی بۆ پێوەندی دروستکردن و کۆ کردنەوەی پارە بوو بۆ بۆ دەر کردنی ڕۆژنامەی کوردستان، کە دوایی بە یارمەتی ئێمە چەند ژمارەیەکی لێ دەرچوو، و کەوتە نێو خەڵک. پاش کۆدەتای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بە سەرۆکایەتی جەنەڕاڵ عەبدولکەریم قاسم، و

گۆڕینی ڕژێمی شایەتی، و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری لە عێراقدا، جمو جۆڵێکی ڕامیاری ( سیاسی) کەوتە باشووری کوردستان ، ولە ئەنجامی ئەوەوە ڕژێمە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستان، بە تایبەتی ڕژێمی شای ئێران، ترسیان لێ نیشت، و کەوتنە پەلە قاژە و دەست وەشاندن لە خەڵکی کوردستان، و بە تایبەت لەو کوردانەی کە چالاکی یەکی ڕامیاری یان پێ شک دەبردن. لە ئێران دار و دەستەی ساواک کەوتنە بگرە و بەردە و گەڕ و گێچەل کردن بە خەڵکی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان، و ژمارەیەکی زۆریان لێ خستنە زیندانەوە، و ژمارەیەکیش لە ترسی کوشتن و بڕین، کەوتنە ڕەڤین و خۆیان گەیاندە خوشک وبراکانیان لە باشووری وڵاتەکەیاندا، کە پێ یان وابوو ئەو بەشە لە سایەی « ئازادیخوازان» ی عەرەب و( کاکە کەریم قاسم» ی « سەرۆکی کورد و عەرەب» ە وە، « ڕزگار» ی بووە.

ڕاستی یەکەی ژمارەیەک لەو برا کوردانەی ڕۆژ هەڵاتم هەر بە هۆی مامۆستا ووردی یەوە ناسی. یەکێک لە وانە خودێ لێخۆشبوو ئەوڵای ئیسحاقی بوو، کە نێوە خواستەمەنیەکی« ئەحمەد توفیق» بوو، و بە هۆی ئەویشەوە عەبدوڵای عێزەت پوور و قاسمی سوڵتانیان(کەماڵ) و مامۆستا کەریمی حسامی-شم ناسی، بەڵام نەک وەک کەریمی حسامی، بەڵکوو وەک « سالح تۆفیق» کە ئەوە نێوە خواستەمەنیەکەی بوو. لە پێشدا وام دەزانی کە « سالح تۆفیق» برای باوک و دایکی« ئەحمەد تۆفیق»ە و نایەوێ لای من بیدرکێنێ. پاش کۆدەتای قاسم، کارەکەم وەک مامۆستا لە قوتابخانەی نێوەندی زوبێر( الزبیر) لە بەسرە (بصرە)، کە لە ساڵی ١٩٥٧ دا لە کەرکووکەوە بۆ ئەوێ دوور خرا بوومەوە، پاش چەند و چۆنێکی زۆر کە ئەوەش چیرۆکی خۆی هەیە، گوازرایەوە بۆبەغدا بۆ قوتابخانەی نێوەندی جەعفەری یە(الثانویە الجعفریە الاهلیە) کە قوتابخانەیەکی ئەهلی شیعەکان بوو، « سالح» ئەو کاتە لە بەغدا بوو، وەک هەرکوردێکی دیکە« بەشیریست» بوو، واتە دڵسۆزی مامۆستا بەشیر موشیر بوو، و جار و بار دەهاتە خزمەت مامۆستا بەشیر موشیر، لە وێ چاومان بە یەک دەکەوت. ئەو کوردانەی ڕۆژ هەڵات کە لە شاری سلێمانی گیرسا بوونەوە، هەر یەکەیان لە ئاوارێکی دەخوێند. ڕۆژێکیان لە سلێمانی ئەحمەد تۆفیق هات بۆ لام وگوتی:« ڕەوشمان (حاڵمان) زۆر خەراپە و هەر یەکەمان پەڕیوینەتە

لایەک، بەڵکوو تۆ یارمەتیەکمان بدەیت خۆمان کۆ کەینەوە» بە ڕێکەوت لەو ڕۆژانە دا ماڵی کاکە ڕەزای کوڕی میرزا سەعیدی مارف( کە بنە ماڵەی ئێمە و ئەوان لە باو و باپیرەوە تێکەڵیمان هەیە) لە سلێمانی یەوە دەیانگواستەوە بۆ بەکرە جۆ، چونکە کاکە ڕەزا بووبوو بە بەڕێوە بەری کێڵگەی بەکرە جۆ، لە بەر ئەوە خانوەکەیان چۆل دەکرد. خانوەکە بریتی بوو لە کۆشکێکی هەشت ژووری و هەیوان و گەرماو و ناندێنێکی گەورە و باخێک، لە کاکە ڕەزام وەر گرت و دامە دەست ئەحمەد تۆفیق. ئەوانیش کردیانە «کۆمۆنە». بەڵام داخەکەم نەک هەر لە گەڵ یەک ڕێک نەکەوتن و بەس، بەڵکوو کردیشیان بە شەڕ و هەرالە نێو خۆیاندا و لە ئەنجامدا هەندێکیان گواستیانەوە بۆ شوێنی دیکە و هەندێکیشیان نەمزانی ملیان بۆ کوێ نا. ئەو خانوە خۆشەم بە کەلاوەیی دایەوە دەست کاکە ڕەزا. وەک لە مەو بەر گوتم لە گەڵ مامۆستا کەریمی حسامی بە زۆری لای مامۆستا بەشیرموشیر یەکدیمان دەدی. لێرەدا چیرۆکێک دەگێڕمەوە کە لام وایە مامۆستا حسامی یان بیری چووە بینووسێ، یان هەر لە بیری نەماوە. چونکە لە بیرەوەری یەکانیدا باسی نە کردووە. لە بەغدا لە گەڵ کوڕێکی سنەیی بوو بوومە دۆست کە لە قوتابخانەی نێوەندی و دوا نێوەندی ئێرانیەکان کە نێوی « دبستان و دبیرستان شرافت ایرانیان» بوو، و لە حەیدەر خانە چەند مەترێک لە دوکانی مامۆستا بەشیرەوە دوور بوو، کاری دەکرد. پاش ئەوەی مامۆستا حسامیم پێ ناساند وەکو کوردێکی پشدەری، ڕۆژێکیان ئەو برادەرە گوتی:« فەرموون وەرن بۆ قوتابخانەکەمان. بە ڕێوە بەرەکەشی پیاوێکی باشە، خۆی فارسە. بەڵام ژنەکەی خزمی ماڵە کوردێکە، و ئەویش خۆی بە دۆستی کورد دەزانێ. لە گەڵ مامۆستا حسامی پێکەوە چووینە قوتابخانە، کابرای بە ڕێوەبەر بە خێر هاتنێکی زۆر گەرمی کردین و چایی و ماستاوی بانگ کرد بۆمان. پاشان باس هاتە سەر باسی کورد و ئێران. دیارە برادەرە سنە یەکەم هەر دووکمانی وەک « کوردی عێراق» بە بەڕێوە بەر ناساند بوو. ئەویش زۆری پێخۆشبوو کە هەر دووکمان بە فارسی یەکی باش قسە دەکەین لە گەڵی. لە نێزیک کابرای بەڕێوە بەرەوە گەنجێکی سمێڵ بابڕی دەمو چاو ڕێوی دانیشتبوو، هیچ قسەی نەدەکرد. هەر گوێی دەگرت و جار و بارێکیش پێکەنینێکی ژەهراوی لێدەر دەکەوت.

مامۆستا کەریم گوتی:« حکوومەتی ئێران لە گەڵ کورد زۆر خەراپە دەکات. کورد هیچ خەراپەیەکیان نەکردوە بەرامبەر بە ئێران. بەڵام ئێران وەک دوژمن هەڵسو کەوت دەکا لە گەڵ کورد.» لەو کاتەدا هەستم بەوە کرد کە کابرای بەڕێوە بەر ڕەنگی تێکچوو. پاش ماوەیەک ئێمە ڕۆیشتین، بۆ سبەی برادەرە سنەیی یەکە هات و گوتی : « ئەوە چیتان کرد؟ بەڕێوە بەرەکەم دەڵێ ئەو کابرایەی لە ژووری بەڕێوە بەر دانیشتبوو( کابرای سمێڵ بابڕ) هەر دەستبەجێ چووە بە کۆنسولی گوتوەوە کە بەڕێوە بەری قوتابخانە لە گەل کوردی جیابوونەوە خوازی ڕاکردووی ئێراندا نێوانی هەیە. دوێنێ کۆنسول خۆی هاتووەتە قوتابخانە بۆ لێپرسینەوەی کارەکە. بەڕێوە بەر و من( کابرای سنەیی) گوتمان ئەوانە کوردی عیراقن. بەڵام کۆنسول باوەڕی نەکرد و گوتی : «کوردی عیراق فارسی نازانن. بیشی زانن بەو جۆرەی نازانن. ئەوانە هەر دووکیان سەر و زمانیان وابووە کە لە گەڵ فارسی زماندا هەر لە کۆنەوە هەڵسو کەوتیان بوو بێ.» بە ڕێکەوت چەند ڕۆژێک دوای ئەوە مامۆستا حسامی وون بوو. کە لە ئەحمەد تۆفیقم پرسی، ئەوە « سالح » ی برات لە کوێ یە گوتی: «ئەوە برای من نیە. ئەوە کەریمی حسامی بوو. سەر بە حیزبی تودەیە و هەر بە فەرمانی حیزبی تودەش ملی ڕێی نا و چوو بۆ ئورووپا». ماوەیەک دوای ئەوە برادەرە سنەیی یەکەم هاتە دوکانی بەشیرموشیر و گوتی:« بە سایی تۆ و برادەرەکەتەوە( واتە مامۆستا حسامی) بووم بە کۆڵکێش( حەمباڵ)، « گوتم چۆن؟» گوتی : «ئێستە ڕێ نادەن دەرس بڵێمەوە، گوتیان مانگانەکەت وەر بگرە، بەڵام تەنێ هاتو چۆی بازاڕ بکە و شتومەک بکڕە بۆ خێزانی مامۆستاکان و کار بە دەستانی کۆنسولخانە. نابێ ئیتر دەرس بڵێیتەوە. ئێستە کاتەکەی زۆر خەراپە. تودەی یەکی زۆر ڕایان کردووەتە بەغدا و بەغدا بووە بە بنکەی جیابوونەوە خوازی کورد و تودەیی یەکان» ئیتر لەو کاتەوە مامۆستا حسامیم تەنانەت لە ئورووپاش نەدیوە، تا لە ستۆکهۆلم لە سیمینارێکدا کە لە ١٩٩٥/٣/١٨دا برادەرەکانم لە وێ سازیان کردبوو بۆ باسی « ئەوڕۆی نەتەوەی کورد و وتو وێژ لە سەر بار و دۆخی خوارووی کوردستان» چاومان بە یەک کەوتەوە، و فەرمووی « حەز دەکەم پێشەکی یەک بۆ بەرگی دەیەمی بیرەوەری یەکانم بنوسیت» گوتم: « بە سەر چاو، با بیرەوەری یەکان هەموو بخوێنمەوە،

ئەوجا ، ئەویش هەر نۆ بەرگەکەی ناردبۆم. ڕاستی یەکەی لە پێشدا دەمویست سەرەتایەکی کورت بنووسم بۆی، بەڵام دوایی بیرم لە وەکردەوە کە بەرهەمەکەی حسامی زەحمەتێکی زۆری لە گەڵ کێشراوە، و ئەوە دەهێنێ کە کەمێک بە کووری( قوڵی) بخرێتە بەر چاوی خوێندەواران.

ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا لە بیرەوەری یەکانی مامۆستا کەریمی حسامی دا ئەوەیە کە لە بیرەوەری یەکانیدا بە زۆری هەر بە سەر هاتی خۆی و بیر وڕای خۆی تۆمار کردووە، کەمتر بە لای ئەوەدا چووە، وەک دیرۆک نووسێک کە لە نامە خانەکەیدا دانیشتبێ و لە بەر ڕۆشنایی چەند سەر چاوە و بەڵگە نامەیەکی ئامادە کراو، یان قسەی ئەم و ئەو و دەستی دووەم، بکەوێتە لێکۆڵینەوە. ئەویۆ خۆی وەک سیاسەتکارێکی چالاکی کورد کە لە ماوەی پەنجا ساڵی چالاکی نەپساوی خۆیدا لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان، خەریکی حیزبایەتی بووە و سیاسەتکارانی دەوڵەتە جۆر بە جۆرەکانی دیوە، و بە گەلێک وڵاتی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوادا گەڕاوە، و پێوەندی فراوانی یە گەلێک لاوە هەبوە، و خۆی شایەتی گەلێک وتو وێژی پشت پەردە و پێش پەردە بووە، و بەشداریی گەلێک لە و بە سەرهات و ڕووداوانەشی کردوەوە، کە بوونەتە پارچەیەک لە مێژووی نەتەوەی کورد. بیرەوەری یەکانی بریتین لە ریزێک بەڵگەنامەی دیرۆکی رامیاری کوردستان و کۆمەڵگەی کوردەواری لە سەر دەمێکی چڕ و پڕی بزووتنەوەی کوردایەتی دا کە ئەمانە هەمووی چاوگەی دانسقەن بۆ لێکۆڵینەوەی زانستانەی زۆر بە نرخ، کە ئەوەش لە دواڕۆژ دا لاپەڕەکانی مێژووی نەتەوەی کورد فرە تر و دەوڵەمەندتر دەکەن. لە بەر ئەوە کارەکەی جێگای سوپاس وپێزانینە و ماڵی ئاوا بێ.

بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی پڕن لە زانیاری گرنگ و هێندێ هەواڵی وا کە لە هیچ جی یەکی دیکە دا دەست ناکەون، کە ئەو لە نەمان و تونا بوون پاراستوونی و ئازایانە خستوونیەتە بەر دەست. لە بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی دا دەخوێنینەوە کە چۆن داگیر کەری بەشێکی کوردستان لە دژایەتی کردنیدا بەرانبەر داگیرکەری بەشێکی دیکەی کوردستان لە کوردی بندەستی ئەو داگیرکەرەی دیکە سوودی وەر گرتوە و ڕێبەرانی کوردی ئەو بەشەی بە نێوی دۆستایەتی و هەڤاڵبەندی یەوە، وەک دەسکەڵای دەستی خۆی لە دژی

دەوڵەتە داگیر کەرەکەی دیکە و لە دژی کوردەکانی بندەستی خۆی بە کارهێناوە. بەڵام هەر کاتێکیش ئەو داگیر کەرە بە ئامانجی خۆی گەیشتبێ، یان کوردە « هەڤاڵبەندەکان» ی بەر هەڵستێکی گچکەیان کرد بێ، یان هەڵسو کەوتێکی سەر بە خۆ دەرکەوتبێ لێ یان، ئەوا بێ سڵکردنەوە و سێ و دوو، هاورێی حیزبیان لە سێدارە داون، و ئەندامانی حیزبیان زیندانی کردوون (بەرگی پێنجەم ل ١٧٤- ١٧٥) واتە پێوەندی هەر یەکێک لەم دەوڵەتانە بە کوردی ژێر دەستی دەوڵەتە داگیر کەرەکانی دیکەوە، پێوەندیی دەستبڕین و دادۆشین و ئاغا و نۆکەری یە، نەک دۆستایەتی و هەڤاڵبەندی.

لە بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی دا ئەوە دەخوێنینەوە کە چۆن ڕێکخراوی سیاسی بەشێکی کوردستان بە هۆی پێوەندی یەکانی یەوە بە داگیرکەرانی بەشێکی دیکەی کوردستان، لە ترسی تێکچوونی پێوەندی یەکەیان، لە ئاست قڕ کردنی خوشک و براکانیان لەو بەشەی داگیر کەرانی کوردستاندا بێدەنگ بوون.( بەرگی هەفتەم ل١٣١: ١٣٢)

لە بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی دا فێڵ و تەڵەکە بازی و ناپاکی و نامەردی داگیرکەرانی فارس و هاوڕێ عەجەمەکانیان( ئازەری یەکان) دەخوێنینەوە، کە لە پشت پەردەی موسوڵمانەتی ی سیاسی ی ساختە دا بە ئامانجی شۆڤێنیستانە خوێنی کورد بە ناڕەوا دەڕێژن. بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی ئەوەمان پێشان دەدا کە چۆن سەرکردە کوردەکانی ژێر دەستەی دەوڵەتێکی داگیرکەر بە فیت و هاندان و بەڵێنی داگیرکەری بەشێکی دیکەی کوردستان، لە کاتی شەڕ وەستاندن و وتو وێژ کردندا لە گەڵ داگیرکەری بەشەکەی خۆیان، بە هیوای پشتگیری دەوڵەتەکەی دی ، پێ یان قورس داگرتوە، ولە وەوە هیچ ڕێک کەوتنێک نە هاتووەتە کایە، تا شەڕ تازە بووەتەوە، و ئەو جار داگیرکەرەکەی بەشەکەی دی کە خۆی بە « هەڤاڵبەند»یانداوەتە قەڵەم، بەڵێنیەکانی خۆی بە جێ نەهێناوە و فتی کردوون.

لە بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی دا ئەوە دەخوێنینەوە کە چۆن ڕژێمی بەعسی عێراق داوای لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران کردوە ببێتە دەسکەلای دەستی بەعسی دژی شۆڕشی باشووری کوردستان و سەرۆک بارزانی، بەڵام حیزبی دێمۆکرات هەڵوێستێکی مەردانەی پێشان داوە وبە

قسەی بەعسی نەکردووە.

بیرەوەری یەکانی حسامی ئەو ڕاستی یەمان بۆ دەردەخا کە ئەز سالانی ساڵە باسی دەکەم و دەبێژم: داگیر کەرانی کوردستان بۆ چارە سەر کردنی مەسەلەی کورد هەر یەک بەرنامەیان هەیە و بەس، ئەوەش بەکار هێنانی هێز و دەست وەشاندنە بۆ لە نێو بردنی کورد. خۆ ئەگەر ئەوە سەری نەگرت، ئە وا پەنا بردنە بەر درۆ و دەلەسە( پڕ و پالانتە).

لە لاپەڕەی (٤٠) بەرگی حەوتەمی بیرەوەری یەکاندا ئەوە دەخوێنینەوە کە شەهید قاسملو تەنانەت بە « خود موختاری ئیسلامی» ش ڕازی بووە، بەلام حکوومەتی ئێران هەر هیچی نەکردووە.»

لە بیرەوەری یەکانی مامۆستا حسامی دا ئەوە دەخوێنینەوە کە چۆن حیزبە چەپاژۆکانی ئەو ولاتانەی کوردستانیان داگیرکردوە، بە تایبەت حیزبی تودەی ئێران، دەستیان خستووەتە نێو مەسەلەی کوردەوە، هەوڵیان داوە کورد هیچ جۆرە ڕێکخراوێکی سەربەخۆی نەبێ، نە ڕامیاری (سیاسی) و نە فەرهەنگی(کولتوری). لە مەشدا هێندێ کورد یارمەتی داون. مامۆستا حسامی باسی ئەوە دەکات کە چۆن حیزبی تودەی ئێران بە بورس( پارەی خوێندن) بە هێندێ خوێندکاری چالاکی کورد، ویستوویەتی لە کوردایەتی دووریان بخاتەوە و بیانلکێنێ بە خۆیەوە و ڕێکخراوە کوردی یەکان بە دەستی ئەوانە هەلوەشێنێتەوە.( بەرگی دوەم ل ١٢٦:١٢٧)

بێگومان ئەو هەوالانە شتێکی تازە نین کە نەمانبیستبێ، یان باسمان نەکردبێ، بەلام گرنگی لێرەدا ئەوەیە کە مامۆستا حسامی خۆی وەک شایەتی دەستی یەکەم و بینەری بەسەرهات، بەڵگە دەخاتە سەر مێزی دادگەی مێژوو.

مامۆستا کەریمی حسامی لە بیرەوەریەکانیدا، و بە بۆنەی هێندێ ڕوو داوەوە، پەنجە بۆ گەلێک کەسایەتی ناسراوی کورد درێژ دەکات، کە یان لە حیزبدا لە گەڵیان بووە، یان لە دانوستاندنی ڕامیاری، یان لە تایبەتیدا پێوەندی پێ یانەوە هەبووە. هێندێک لەم کەسایەتی یانە کۆچی دوایی یان کردوە ، کە دیارە ناتوانن بیر و ڕای خۆیان بەرامبەر بەو باسانەی حسامی دەر ببڕن، وەک شەهید دوکتۆر قاسملو و دوکتۆر شەرەفکەندی و ئەحمەد تۆفیق( ئەولای ئیسحاقی). بەلام زۆربەی زۆری ئەوانەی دی، بە سایەی خودێ وە ماون،

تەنانەت ئەوانەی نەشماون، کەسو کار و هاوڕێی حیزبی و دۆستی تایبەتی یان هەن، با ئەوانیش دەست بدەنە قەڵەم و بیر و ڕای خۆیان بابەتانە و ئازایانە لەم بارەیەوە بخەنە سەر کاغەز. ئێدی کەس لەم لاو ئەولا بە پسکە پسک نە بێژێ حسامی شتەکانی بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە وخۆی کردووە بە پاڵەوان وئەوانی دیکەش گوناهبار. « فەرموون! ئازا گۆ و ئازا مەیدان!» ئەو« ڕاستییە»ی کە لە لایانە و حسامی « شاردونی یەتەوە» پێمان ڕابگەیێنن، بەوە خزمەتێکی مێژوو ناسی کورد دەکەن. لێرەدا دەمەوێ ژمارەیەک لەو کەسانەی نێویان هاتوون بە نموونە بهێنمەوە. ئەمە هەر نموونە و هیچی دی: کە مامۆستا حسامی باسی مامۆستا شێخ عێزەددینی حسێنی دەکات، دەبێژێ: « گومانم نەما کە مامۆستا لە بڕیارەکانیدا بە تەواوی سەر بە خۆ نیە»(بەرگی شەشەم، ل ١١٠) لە جێ یەکی دیکەدا، و لە بارەی کوشتنی مامۆستا مەلا کەریمی شاریکەندی یەوە لە ١٩٨٣/٣/٢٢دا دەبێژێ: « ڕۆژی ١٩٨٢/٣/٢٢ خەبەری شەهید کردنی مامۆستا مەلا کەریمی شاریکەندی بڵاو بووەوە. دوکتور سەعید وتارێکی توند و جوانی بەم بۆنەوە نووسی و لە گەڵ مەحکوم کردنی ئەم جنایەتە بێ شەرمانەیە داوای لە مەلا شێخ عێزەددین کرد کە بە مەحکوم کردنی ئەم جنایەتە بەیاننامەیەک بڵاو بکاتەوە، چونکە خەڵک نیشانەیەکی دەستی ئەو لەم جنایەتەدا دەبینن. وتارەکە دوو سێ جار لە ڕادیۆ خوێنرایەوە. بە داخەوە مامۆستا خۆی لەم جنایەتە کڕ کرد و هیچی لە سەر بڵاو نەکردەوە.» (بەرگی حەوتەم، ل ٢١٨)

لە لاپەڕەی ٢٣٣ی بەرگی نۆیەم دا هەر لە بارەی مامۆستا عێزەددینی حسێنی یەوە کە مامۆستا حسامی لە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٢دا چووەتە خزمەتی، دەبێژێ:« بە مامۆستام گوت: « تۆ وەک ڕێبەرێکی مەزهەبی سەبارەت بەو کارەساتە سامناکەی هەڵەبجە هیچت نەگوت، بەیاننامەیەکت بڵاو نەکردەوە. خەڵک چاوە ڕوانە جەنابت لە کاتی ڕوو داوی ئاوا گەورەدا هەڵوێستت هەبێ، بە تایبەت کارەساتی هەڵەبجە بۆ لێ بێدەنگبوون نابێ.» مامۆستا فەرمووی:« کاک کەریم خۆت دەزانی لە هەموو کات وبار و دۆخێکدا ناکرێ پیاو وەدەنگ بێت.»

کە باسی دوکتور حەسەنی شەتەوی دەکات پەنجە ڕادەکێشێ بۆ بوختان کردن بۆ مامۆستا حسامی لای بەعسی یەکانی عێراق و بە گرتن دانی»( بەرگی

حەوتەم، ١٢١)

کە باسی دوکتۆر عەبدوڵلای مەردۆخ دەگێڕێتەوە، ئەوە باس دەکات کە فیلمی تەلەفیزیۆنی شاردوومەتەوەو، لە گەڵ خۆی بردوونی و لە مەهاباد ڕای کردوە. (بەرگی حەوتەم ل ٤٤)

کە باسی غەنی بلوریان دەکات، دەبێژێ:« غەنی گوتی:» لە وەزعی ئێستادا، نابێ بە خاتری مەسەلەی کوردستان شەڕ بکەین، دەبێ بە خاتری ئێران شەڕ بکەین» ( بەرگی شەشەم، ل ١١٧) لە شوێنێکی دیکەدا بە ڕێز غەنی بلوریان و خودێ لێ خۆش بوو هێمنی شاعیر بە « هەڵگەڕاوە لە حیزبی دیمۆکرات و ڕوو کردە حیزبی تودە باس دەکات»(بەرگی حەوتەم ل ٧٥-٧٨)

کە لە بارەی بە ڕێز سەلاح بەدرەدینە وە دەدوێ، وەک پێوەند کار( رابط)ێکی نێوان خۆی( مامۆستا حسامی) و رژێمی سوریا( دەزگەی ئاسایش و هەواڵگوزاری) دەیخاتە بەر چاو. ( بەرگی حەوتەم ل ١٤٣-١٤٤ م ل ١٤٦)

کە باسی بە ڕێز سامی عەبدولرەحمان( سامی رەحمان) دەکات، دەبێژێ؛ « لە ڕۆژی ١٩٨٤/٨/١٠دا سامی لە کۆنگرەی یەکێتی ی لاوان و خوێندکارانی کوردستان دا، لە وتاری خۆیدا» زۆر بە جوانی ڕێبازی پێشکەوتوخوازی بزووتنەوەی کوردی ڕوون کردەوە و ئەمەندەش بەلای مارکسیستی دا کەوت کە دەستی هەموو کۆمونیست و چەپێکی لە پشتەوە بەست.» (بەرگی هەشتەم ل ١٦٧)

کە باسی دوکتۆر عێزەددین مستەفا دەکات دەبێژێ:« عێزەددین مستەفا رەسول لە گەڵ عەزیز الحاج چووبوو دژی حیزبی کۆمونیستی عێراق» کە باسی بەڕێز حەمەی عەزیز دەکات دەبێژێ:« حەمەی عەزە دۆم ویستی کوردی ڕۆژ هەلات بدرێتەوە دەست حکومەتی ئێران.» کە باسی دوکتۆر ئەورەحمان قاسملو دەکات، لە پاڵ پەسندان وباسی تایبەتکاری باشی دا، کە لێی دەگێڕێتەوە، دەبێژێ؛« دیکتاتۆر» بوو. مامۆستا کەریمی حسامی نامەیەکی رۆژی ١٩٧٨/١/١٦ی دوکتۆر مەحمود عەلی عوسمان بڵاو دەکاتەوە کە تێیدا هاتوە: « ئێمە بە پێویستی ئەزانین کە بزووتنەوەی کوردستانی عێراق و بە تایبەتی کە ئێستا شێوەی چەکداری وەر گرتوە سیاسەتێکی پێشکەوتنخواز و دژ بە ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی هەبێت و ستراتیژیەکی ئەو تۆی هەبێ

دۆست و دوژمن بە ڕوونی لە یەکتر جیا بکاتەوە ودژ بێ بە ئیمپریالیزمی ئەمریکی و ئێران و صهیونیەت و بە ( ماڵی مەلا) کە کلکی ئەم لایەنانەن، و دۆست بێ بە کامپی سۆشیالیست و بە تایبەت یەکێتی سۆڤێت و...هتد» (بەرگی پێنجەم ل ١٩٨)

ئا لێرەدا هەر بۆ خزمەتی مێژوو دەخوازم شتێک تۆمار بکەم کە لە شوێنی دیکەشدا تۆمارم کردوە. دوکتۆر مەحمود عەلی عوسمان لە کۆتایی پەنجاکاندا سەر بە پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو. پاش کۆدێتای قاسم، ماوەیەک بوو بە لایەنگری مامۆستا هەمزە عەبدوللا. دوای ئەوەی سەرۆک بارزانی توانی بە سەر باڵی هەمزە عەبدوللا دا زاڵ بێ و هەمزە لە گۆڕە پانی سیاسەت لابدات، دوکتۆر مەحمود گێری گۆڕی، و چووە بنە و پاڵی بارزانی، و لەو دەمەوە بە درێژایی ساڵانی ساڵ وتا« ئاش بەتاڵەکە»، هەر بە بارزانیدا هەڵدا، و هەر خۆشی دووەمین کەس بوو لە سەر کردایەتی شۆڕشدا، و هەر چی یەک لە نێو شۆڕشدا ڕووی دەدا، تاکاتی« ئاشبەتاڵ» لە ١٩٧٥، دەستی ڕاستەو خۆی ئەوی تێدا بوو، تا ئەو کاتە بەرانبەر هەموو خەراپە و هەڵە و تاوانێکیش کە لە نێو شۆڕشداڕووی دابێ، دەست لە دەستی ساواکدا، ورتەی لێوە نەهات، و تا ئەو کاتەی دەیزانی« ماڵی مەلا » دەسەلاتدارن، « ماڵی مەلا » ی بە کابەی کورد نێو دەبرد. ئەوجا کە هەرەسەکە ڕوویدا، ئەویش ئاشبەتاڵی ڕاستەقینەی کرد و کەوتە بوختانکردن و قسە هەڵبەستن بۆ بارزانی، بۆ شاردنەوەی شوێن پێی دزانەی خۆی و کەوتە خۆ نێزیک کردنەوە لە مام جەلال و یەکێتی نیشتمانی کوردستان وبە نێوی کۆمیتەی ئامادە کردنی کۆنگرەی« پارتی» یەوە ماوەیەکیش جوان ڕایبوارد، کە بۆی دەرکەوت ئەوان باش دەیناسن و ریشی خۆیان نادەنە دەستی، ئەو جا بوو بە « حسیک». پاش ئەوەش و چەند جارێک خۆ پێشکێش کردن بە سەدام و بە دەستی ڤالا گەڕانەوە لە بەغدا دیشکەمی لە هەموو لایەک کرد و ڕووی کردە ئەوروپاولێی دانیشت وئێستەش لە دەم هەراشی خۆی نە کەوتوە و نێوی خۆی ناوە« سیاسەتمەدار »!ترەماوەزاران ترهالە « سیاسەتمدار»ی ئاوها!! هەر بەو بۆنەیەوە دەمەوێ ئەوەش بێژم کە ئەم دوکتۆر مەحمود عەلی عوسمانە دەم هەراشە. هەر ئەو پیاوەیە کە لەساڵی ١٩٦٩دا، کاتێ بە هۆی برادەرەکانمەوە لە کوردستان نامەم بۆ سەرکردایەتی

شۆڕش نووسیبوو، داوای ئەوەم کرد بوو ڕێم بدەن بگەڕێمەوە کوردستان بۆ شوێنی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بە نیازی خزمەتکردن، جەنابی دوکتۆر مەحمود کەسی دووەمی شۆڕش پاش سەرۆک بارزانی فەرموو بووی:« بە هیچ جۆرێک نابێ ڕێی بدرێ بێتەوە.» وەک کوردستان ماڵی باوکی بێ و جەماڵ نەبەز مافی ئەوەی نەبێ لە وێ بژی. چونکە دوکتۆر مەحمود لە لایەکەوە لەوە دەترسا ئەگەر یەکێکی وەکو من بچێتەوە کوردستان سر و تری دەربکەوێ و لە لایەکی دیکەشەوە لە بەر ئەوە بوو چونکە ئەو کاتە دوکتۆر مەحمود بە فەرمانی ساواک دەچوو بە ڕێوە و، ساواکیش منی وەک دوژمنی ڕژێمی شاهەنشا دەستنیشان کرد بوو. کە شا خۆی ئەمەی بە خودێ لێخۆشبوو میرکامەران عالی بەدرخان(١٨٩٥-١٩٧٨) گوتبوو، و مامۆستا کەریمی حسامی-ش لە بیرەوەری یەکانی ( بەرگی چوارەم ل ١٤٤) لە زمانی شەهید قاسملوەوە دەیگێڕێتەوە. خۆشم لە بیرەوەری یەکانی « ڕۆژانی ئاوارەیی مدا لە سویسرە» پەنجەم ڕاکێشاوە بۆی و بەم زوانە لە شوێنێکی دیکەدا بڵاو دەکرێتەوە.(سەرنج:لە ساڵی ١٩٩٩دا لە سلێمانی بڵاو کرایەوە)

کە مامۆستا حسامی بە بۆنەی باسی ڕۆژنامەی « سەر دەمی نوێ» وە کە خۆی سەر نووسەری ڕۆژنامەکە بووە باسی فەرهاد شاکەلی دەکات، دەبێژێ شاکەلی ڕۆژنامەی« سەر دەمی نوێ»ی بەمجۆرە لە قەڵەم دابوو: « ڕۆژنامەیەکی سۆسیالیستی یە و شەقڵ ونیشانەی شەرقی پێوەیە.» لەوەوە سەر دەمی نوێ لە لای کاربەدەستانی سوێد کەوتبووە« لیستەی ڕەش.» دیارە بە پێچەوانەی ئەو شتانەوە کە فەرهاد شاکەلی بڵاوی دەکردنەوە و پارەیەکی یەکجار زۆری لە حکوومەتی سوێد وەر دەگرت، ڕۆژنامەی« سەردەمی نوێ» هیچ جۆرە یارمەتی یەکی پێ نەگەیشتووە. هەر لەم بوارەشدا مامۆستا حسامی دێتە سەر باسی حەمەی مستەفا (ازادی پاسۆک) و لە ل.٢٣٣-٢٣٤ی بەرگی نۆیەم دا دەبێژێ: « ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٢٢ کاک ئازاد مستەفای ڕەحمەتی تەلیفۆنی کرد و گوتی: پێم خۆشە چاوم پێت بکەوێ. کە چووم گوتی:« یاد داشتێکمان نووسیوە دەمانەوێ بۆ باڵیۆزخانەی سۆڤیتی بنێرین، پێمخۆشە تۆش بیبینی» گوتم: کارێکی زۆر باشە. لام وایە لە بار و دۆخی ئێستادا لە هەر ڕێگایەکەوە بێ، پێویستە تێکۆشان بۆ ڕوونکردنەوەی کۆڕ و کۆمەڵی سیاسی جیهان و لە

قاودانی جنایەتی سەدام گورج و گۆڵ بکرێ. لە گەڵ باسکردن گوتی: « ئێمە دەستمان داوەتە کارێک. سەنەد و بەڵگەی زۆرمان کۆ کردووەتەوە. برادەرێکمان لە بەریتانیا لەم بوارەدا کاری زۆری کردوە و خۆشم ئەوەی لە توانامدا بووبێ نووسیومە. دەمانەوێ بۆ پاک کردنەوەی پاسۆک لە هێندێ بیر و باوەڕی چەوت و وشکەڕۆ کتێبێک بڵاو کەینەوە. بەڵام ئیمکانی چاپکردنمان نیە. داخوا سەر دەمی نوێ دەتوانێ یارمەتیمان بدات؟ یارمەتی دەبێ بە ڕاستکردنەوەی سیاسەتی حیزبەکەمان.» گوتم: بۆ یارمەتی بە حیزبەکەتان و سەبارەت بە شەخسی تۆ، ئێمە هەزار دۆلار یارمەتیتان دەکەین. زۆر پێ شاد بوو. گوتی:

« حیزبی ئێمە ئەم یارمەتی یە قەت لە بیر ناکات.» دوای چەند ڕۆژ کە چووم چەند برادەری لە کن بوون. بانگم کـــردە دەرێ و پارەکــــەم دایە. ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٢١ کاک ئازاد هاتە ماڵی دوکتور جەمشید و لە نووسینی هێندێ قسەی پڕ و پوچی گۆڤاری ( مامۆستای کورد)زۆر توڕە بوو. وتارێکی توند و خەستی لە وەڵامی گۆڤاری ناو براودا نووسیبوو، بۆی خوێندینەوە و گوتی: بە تەلیفون بە سەر فەرهاد شاکەلی دا هاتووم و پێشم گوتووە وتارێکم نووسیوە دەبێ چاپی بکەی. پاشان کە خۆم لە سەردەمی نوێ دا وەڵامێکی ئەو بوختانە بێشەرمانەم دابووەوە، کاک ئازادی رەحمەتی بە دوکتور جەمشیدی گوتبوو:« من وتارەکــەی خــۆم ســەحب دەکــەمــەوە.» هەســتم کــرد لە بواری ئانتی کۆمۆنیستیدا پێوەندییەکە بە هێزترە. ئیتر من مەسەلەی سەحب کردنەوەم بە چاوی دانەداوە.»

نامەوێ بە سەر ئەم بیرەوەری یەی مامۆستا حسامی دا تێپەڕم، بێ ئەوەی هێندێک ڕاستی نیوە شاراوە بخەمە ڕوو. هاتنی حەمەی مستەفا ( ئازاد) بۆ ئەورووپا لە نێوە ڕاستی هەشتاکاندا بۆ ئاشبەتاڵ پێکردنی « ڕێکخراوی سۆسیالیستیانەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا»(سۆکسە)بوو، کە سەروەت عەلی( کوردۆ) کە ئەو دەمە وەک خوێندکارێکی هەژار لە ڤیەننا دەژیا و ئێستە دەزگەی بازرگانی ئێکسپۆرت- ئیمپۆرتی لە مونیخ( ئەلمانیا) داناوە سکرتێری گشتی بوو و لە کن خۆی دەیویست بیکات بە میراتگری « یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا» نوکسە). سۆکسە sokse لە ســەرەتاوە تا دەست تێخستنی حەمەی مستەفا و دیشکەم کردنی سەروەت عەلی لە ١٩٨٥دا،

چالاکی یەکی کولتوری و رۆشنبیری و سیاسی زۆر باشی هەبوو کە سەرنجی هەموو لایەکی لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان بۆ خۆی راکیشا بوو. سەرەرای ئەوە داو و دەزگەیەکی سەربەخۆ بوو، نە فەرمانی لە کەس وەردەگرت و نە بە نانی کەسیش دەژیا. ئەز هەر چەندە ئەندامی سۆکسە نەبووم، بەلام کرابوومە «برا گەورە» و « راوێژ کەر» و ژیانی رێکخراوەکەش لە پارەی ئەندامەکانی یەوە سەر چاوەی دەگرت و سیاسەتی سۆکسە ئەندامەکانی نەخشەیان دەکێشا، نەک داگیرکەرانی کوردستان یان ئەم حیزب و ئەو حیزب. منیش تاپێم کرا رێ ی راستم پێشان دان، بێ ئەوەی دەست بخەمە کار و باری نێو خۆیانەوە، و چەند سەمینارێکیشم گرت بە بانگهێشتنی سۆکسە، کە ئەوە رێزێکی زۆر و قورسایی یەکی زانستانەی بۆ سۆکسە پەیدا کرد. سۆکسە بوو بە چقڵی چاوی گەلێک لایەن و هەستی خۆ پەرستی و بەر چاو تەنگی هێندێک و، رک و کینەی حیزب حیزبێنەی هێندێکی دیکەی هارۆژاند. یەکێک لەوانە فەرهاد شاکەلی بوو، کە شێتی نێوی خۆی و وێنەی خۆی و گیرفانی خۆیەتی. فەرهاد شاکەلی، پاش ئەوەی ماوەیەک لە ئاشی کۆمونیستی و مارکسیستی کرد و پەیکەری لێنینی لە ماڵەکەیاندا دانا، خۆی خستە نێو یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە. ئەو جا کە دی « یەکێتی بە دڵی خۆ پەرستانەی وی ناجولێتەوە، کەوتە جنێو پێدان و کردنیان بە «جلخوار».کە «جلخوار» زاراوەیەکە کوردی باشوور لە سەر دەمی بەهەشتی شێخ مەحمود دا بە کاریان هێناوە بۆ نێو نانی ئەو کوردانەی دەیانویست کوردستان بکەوێتەوە ژێر دەستی ترکی عوسمانلی. لە سەرەتای هەشتاکاندا زۆر هەوڵیدا دۆستایەتی لە گەڵ من دروست بکات بۆ ئامانجی خۆی، بەلام هەر زوو ناسیم و رێم نەدا. ئەوجا کەوتە دوژمنایەتیم و ئەمجارە خۆی خستە پێستی« نەتەوەیی» یەوە، و لە ژێرەوە کەوتە پێوەندی بەستن بە حەمە مستەفاوە. تەنانەت لەو نامانەدا کە حەمەی مستەفا بۆ سەروەت عەلی( کوردۆ)ی دەنارد دەینووسی: « رێکخراوی نەتەوەیی بێ فەرهاد شاکەلی نابێ.» بەلام سۆکسە دەرگای خۆی بۆ فەرهاد شاکەلی نە خستە سەر پشت دایبدۆشێ، فەرهاد شاکەلیش ئەمەی لە چارەی من دەناسی. لە بەر ئەوە بە هەموو توانستێکەوە پشتی حەمەی مستەفای گرت بۆ رووخاندنی سۆکسە. حەمەی مستەفا سکرتێری « پاسۆک» بوو. ئەو پاسۆکەی کە لە کوردستان بۆ

گاڵتە دەیانگوت:« هەموو ئەندامانی پاسۆک بە مەنجەڵێک یاپراغ تێر دەخۆن.» حەمەی مستەفا دەیزانی پاسۆک هیچ دوا ڕۆژێکی نیە، لە بەر ئەوە ئەم حەمە مستەفایەی کە تیر و شیری لە « یەکێتی» دەسوو، پاش پەلاماری پشت ئاشان لە لایەن یەکێتی یەوە بۆ سەر پاسۆک و چەن ڕێکخراوێکی دیکە کە مەڵبەندەکانیان لە وێ بوو، بەیاننامەی « یەکێتی نیشتمان فرۆشانی کوردستان»ی دەر کرد و جنێوی سارد و سوک ئەما بە « یەکێتی» نەڵێ، مرخی لە وە خۆش کرد بچێتە کۆمیتەی نێوەندی یەکێتی یەوە، بە بەڵێنی ئەوەی کە« دەزگە نەتەویی یەکان » دادەخا و سۆکسەش لە ئورویا هەڵدەوەشێنێتەوە. جا لە بەر ئەوەی منی باش ناسیبوو، دەیزانی ئەز فشە کوردایەتی ناکەم، وای خستبووە مێشکی خۆیەوە کە بە زمانی لووس و بە یارمەتی سەروەت عەلی( کوردۆ) و فەرهاد شاکەلی کە ئەو دەمە خۆیان بە دۆستی من نیشان دەدا ، وام لێبکەن بچمەوە کوردستان ولە وێش لە نێوم بەرن. هەر چەندە خۆم لەو کاتەدا نەمدەویست بچمەوە کوردستان، چونکە نەمدەویست لە پشت پاسدارەوە بڕۆم، بەڵام یەکێک لە برادەرەکانم کە لە نێو یەکێک لەو حیزبانەدا کاری دەکرد، ئەو هەواڵەی ڕاگەیاند پێم و ماوەیەکیش لە مەو بەر ڕۆژنامەی «بارزان» کە لە ئەمریکا دەر دەچێ چمکێکی ئەو پیلانە تاوانبارانەیەی خستبووە ڕوو. جا کە حەمەی مستەفا هاتە بەرلین و لە پێش ئەوەش بە نامە و هەواڵ بۆ ناردن لە ڕێی سەروەت عەلی یەوە بۆ گەڕانەوەم بۆ کوردستان هیچی دەست نەکەوت، ئەوەشم بە قسە نەکرد بچم بۆ ئێران و سوریا و لیبیا لە گەڵ سەروەت عەلی و فەرهاد شاکەلی(سەروەت عەلی چو بۆ لیبیا و فەرهاد شاکەلی چو بۆ ئێران، ئەوەش بابەتێکە باسێکی تایبەتی پێویستە وجێی ئێرە نیە) بۆ جاری دووەم کە هاتەوە بەرلین، لە منی پرسی : تۆ چ ئەڵێیت لە بارەی هەڵوەشاندنەوەی سۆکسەوە، یان هیچ نەبێ دەرکردنی بەیانێک بۆ پشتگری « بەرەی نیشتمانی کوردستانی عێراق و پشتگیری» منظومەی ئیشتراکی» و خۆ دوور خستنەوە لە بیر و باوەڕی چەوت و چەوتی کازێک؟ گوتم: جارێ ئەز ئەندامی سۆکسە نیم. هەڵوەشاندنەوەی سۆکسە بە دەستی من و تۆ نیە. سۆکسە دەزگەیەکی سەر بەخۆیە و ئەندامەکانی دەتوانن بڕیار بدەن. پشتگیری بەرەی کوردستانی و عێراقی دەتوانرێ وتو وێژی لەسەر بکرێ و ئەو وڵاتانەی تۆ پێ یان دەڵێیت

سۆسیالیست، رژێمەکانیان دیکتاتۆری یە. بەلامماردانی بیری کاژێکیش کە وا تۆ بە چەوت و چەوێلی دەزانیت، بە ڕاستی نازانم. تۆش کە خۆت بە مرۆڤێکی نەتەوەیی بزانیت، چۆن دەبێ لە لایەکەوە ڕێکخراوی نەتەوەیی وەک سۆکسە هەڵوەشێنیتەوە و لە لایەکی دیکەوە قسە بە کاژێک بڵێیت. کە زانی هیچی بۆ نەکرا، هەوڵی دا بە یارمەتی سەرومت عەلی سۆکسە هەڵبوەشێنێتەوە. کە بە سەرومت عەلیم گوت - شایەتی ئاگا لێبووم هەیە - ئەو وەک سکرتێری گشتی سۆکسە دەبێ هەڵوێست بنوێنێ، گوتی:

« من هەقم نیە بە سەرەوە، من واز ئەهێنم.» ئامەقیشی نە بوو. سەرومت و حەمەی مستەفا سر و تریان پێکەوە بوو.( چ لە بارەی سوریا و چ لە بارەی لیبیاوە). ئەوجا کە سەرومت عەلی دیشکەمی لێ کرد، زۆربەی زۆری ئەوانەی لە سۆکسەدا بوون لە گەڵ حەمەی مستەفا نەبوون، نەیتوانی سۆکسە نە هێڵێ، حەمەی مستەفا چوو بەیانێکی دەر کرد لە دژی من و بەیانێکیشی دەر کرد بۆ پشتگیری بەرەی نیشتمانی کوردستان کە هەموو خۆکەم کردنەوە و خۆ نزم دانان بوو. لە پاڵ بە باڵا هەڵدانی رژێمیی سۆڤێت و ( منظومەی ئیشتراکی دا). جا لەبەر ئەوەی سۆکسەی تێکداو ئەوانەی نەتەوەیی بوون خۆیان دوور خستەوە لێی، ئەوەی لە گەڵ حەمەی مستەفاش بوون، دوو کەس و لەتێک بوون کە هیچ دەورێکیان نەبوو، ئەوا حەمەی مستەفا بە دەستی بە تاڵ چۆوەوە کوردستان و کورسی یەکەی کۆمیتەی نێوەندی« یەکێتی» یشی دەست نەکەوت.

ئەوجا فەرهاد شاکەلی وەک بنکداری حەمەی مستەفا لە سوێد، کەوتە بلاو کردنەوەی هێندێک لە نووسینەکانی حەمەی مستەفا کە دژی کاژێک و بیری نەتەوەیین و بلاو کردنەوەی بیری نەتەوەیی ساختە. بەرژەوەندی پشت پەردە، حەمەی مستەفا وسەرومت عەلی و فەرهاد شاکەلی کۆ کردبووەوە، و ئەمەتە حەمەی مستەفا نووسینەکانی لە سەرە مەرگدا نەداوە بە ئەندامانی حیزبەکەی خۆی، بەڵکوو داویەتی بە فەرهاد شاکەلی، ئەویش وەک میراتگری حەمەی مستەفا بە ناو و تاوەوە بلاویان دەکاتەوە. بەلام باسی هەڵسو کەوتی خۆی لە سووریا ناکات، کە ئەوەش چیرۆکێکی « خۆشە» !

یەکێک لە ڕەوشتە ناشیرینەکانی فەرهاد شاکەلی ئەوەیە شتێک لە گۆڤارەکە دا بلاو دەکاتەوە لە دژی یەکێک، ئەوجا وتارێکی ئەو کەسەش کە شتەکە لە دژی

بڵاو کراوەتەوە، بڵاو دەکاتەوە، مەبەستی لە مە ئەوەیە لە لایەکەوە دوو کەس بکات بە گژیەکدا و بە هۆی ئەو شەڕە دندوکەوە گۆڤارەکەی بفرۆشێ، و لە لایەکی دیکەشەوە بێژێ« دێموکراتیم» و ڕێ دەدەم بیر و ڕای جیاواز لە تەنیشت یەکەوە بڵاو ببنەوە. بەو شێوەیە دەیەوێ« منافقی» و دوو ڕوویی و دووەکی بە نرخی « دێموکراسی» بفرۆشێ. فەرهاد شاکەلی پاش ئەوەی چەند جارێک هەوڵیدا ببمە ئابونەی گۆڤارەکەی و نەبووم، چونکە بە ڕاستی ناتوانم ببمە ئابونەی( ٥٠ )گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی. ئەوجا هەوڵیدا هیچ نەبێ وتار بنووسم بۆ گۆڤارەکەی. کە ئەوەشم نەکرد، ئەوجا کەوتە نووسین لە دژم، وتارێکی بە نێوی خواستەمەنی یەوە بڵاو کرد بووەوە کە لە وێدا خۆی کرد بوو بە « نەتەوەیی یەکی تۆخ» و منی بە خائین دابوە قەڵەم بەرانبەر بە بیری نەتەوەیی. سەیر ئەوەیە هەر خۆی بێشەرمانە گۆڤارەکەی نارد بۆم تا وەڕامێ بنووسمەوە لە دژی ئەو وتارە لە گۆڤارەکەیدا، تا گۆڤارەکەی بۆ بفرۆشرێ.

ئێستە ئەو قسەیەی کە مامۆستا کەریم حسامی کردوویەتی و دەبێژێ: « ئانتی کۆمۆنیستی» ئەمانە بە یەکەوە پێوەند دەدا،ڕاست نیە. فەرهاد شاکەلی نە کۆمۆنیستە ونە ئانتی کۆمۆنیست. هیچ بیر وباوەڕێکی نی یە. بەرژەوەندی خۆی نەبێ. بە کورتی: کوڕی ڕۆژ و خۆ بژێنە. ئەوجا ئەو وتارەکەی کە لە گۆڤارەکەیدا لە دژی مامۆستا حسامی بڵاو کرابووە، هەر فەرهاد شاکەلی خۆی نووسیبووی. حەمەی مستەفاش کە گوتویەتی وتار لە دژی ئەو وتارە دەنووسێ، و دوایە گۆیا « سەحبی کردووەتەوە» درۆی کردوە. ئامانجی حەمەی مستەفا چاو بەست بووە بۆ ئەوەی هەزار دۆلارەکە لە مامۆستا حسامی وەر بگرێ. چونکە حەمەی مستەفا خۆی لە لای من گوتی :« کەریمی حسامی پارەی کەی ج.بی. زۆری لە باخەڵدایە. بەڵام ئەوەشی گوت:« پارە لە هەر کوێ یەکەوە بێ باشە، بۆ خزمەتی شۆڕشە»!(مەبەستی لەو پارەیە بووکە دەچێتە گیرفانی خۆی)

تاکە نموونەیەک بۆ بێ سەنگ و تەرازوویی فەرهاد شاکەلی لە ئاست بەرژەوەندیی هەلپەرستانە و دەسکەوتی تایبەتی خۆی ئەوەیە، کاتێ کە باسی خوێندنەکەیم لێ پرسی گەیشتوویە چی؟ گوتی:« خەریکی دوکتۆرام». گوتم:« جا پرۆفیسورەکەت لە باسەکەت دەزانێ؟» گوتی:«نا، بەڵام ناچارم ئەگەر وانەبێ

ناتوانم دوکتۆراکەم وەر بگرم.» جا ئێستە ئەگەر کابرایەک بە دەمی خۆی بڵێ:« مامۆستاکەم لە کارەکەم نازانێ»، لە گەڵ ئەوەشدا بچێ دوکتۆرنامە لە بەر دەستیدا بکات، ئەمە مانای وانی یە دەیەوێ بە هەرزان و تاڵان شەهادەیەکی دەستکەوێ؟ ئایا بەو جۆرە کەسانە ناگوترێ:« شرە خۆری زانست» بەڵام لەم بارەیاندا شرە خۆری سیاسەت و پێنووس؟؟؟

دیارە مامۆستا کەریمی حسامی وەک ژمارەیەکی یەکجار زۆر کوردی خوێندەواری ئەو سەر دەمە- بە پێچەوانەی منەوە -دڵسۆزی رژێمی یەکێتی سۆڤیتی بوو. خۆشی لە بیرەوەری یەکانیدا کە هەمووی لە سوێد بلاو کردوونەتەوە، دانی بەمە داناوە. مامۆستا حسامی یەکێتی سۆڤیتی بە «ماڵە گەورە» نێو بردووە و پێی ناخۆش بووە کوردێک ڕەخنە لە«ماڵە گەورە» بگرێ( بەرگی سێیەم، ل٢٤). سەرەڕای ئەم هەڵوێستە دۆستانەیەی مامۆستا حسامی و تەواوی حیزبە هوردە بۆرژواکانی کوردستان، دەبینین مامۆستا هەر خۆی ئەوە دەگێڕێتەوە بۆمان کە چۆن ماڵە گەورە تەنانەت ڕێی ئەوەی نەداون لە کۆنگرەکانی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیت دا بەشدار بن.( بەرگی حەوتەم ل ١٨٠) و سەرەڕای هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی مامۆستا، ڕازی نەبوون میوانداری شەهید ئەورەحمانی قاسملو بکەن لە موسکۆ( بەرگی حەوتەم ل ٢٥٦) تەنانەت کە کوردەکانی سۆفیا ویستوویانە لە ١٩٨١/٣/٢٠ دا جێژنی نەورۆز پیرۆز بکەن» پۆلیس ڕێگەی نەداوە لە نێو شاردا نەورۆز بکەن».(بەرگی، حەفتەم ل ١٤٢)

مامۆستا حسامی هەر خۆی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژی ١٩٨٨/١/١٠دا چووەتە باڵیۆزخانەی سۆڤیت، و بە سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی گوتوە، بۆ چی سۆڤیت وەدەنگ نایە لە ئاست بۆمبارانی کوردستان و جنایەتی حکوومەتی سەدام دا.(بەرگی نۆیەم ل ٢٥٣)، کە چی ئەوان هەر « شێرو ڕێوی یان هێناوەتەوە بۆی»(هەر ئەوێ)

مامۆستا حسامی لە شوێنیکی دیکەشدا باسی ئەوە دەکات کە«ماڵە گەورە» لە ١٩٨١/٢/٣دا جارێکی دیکە ڕازی نەبوون ڕێ بە دوکتور قاسملو بدەن بچێ بۆمۆسکۆ بۆ چاو پێکەوتنیان( بەرگی حەفتەم ل ١٣٣-١٣٤ و ل ١٤٢). تەنانەت کار بەدەستانی ماڵی گەورە ڕێ ی مامۆستا حسامی خۆشیان نەداوە کە بچێتە

کتێبخانەی لێنین(بەرگی نۆیەم ل ٤٩) کە خۆشی دەبێژێ نازانێ بۆچی ( هەر ئەوێ)جا لە بەر ئەوەی ئەو خۆی « تائێستەش نازانێ بۆ چی» ئەوا برای خۆی تێ ی دەگەیێنێ بۆ چی. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە « ماڵە گەورە» و دەست و پێوەندەکانیان کەریمی حسامی یان بە« کوردێکی تۆخ» داوەتە قەڵەم. سەرەڕای ئەوەی کەریمی حسامی یەکێتی سۆڤێتی بە ماڵە گەورە داوەتە قەڵەم و لە سەری کردوونەوە ئەوان حسامی یان هەر لە ڕیزی « شۆڤێنی» و « جیابوونەوە خواز» و پیاو خەراپ داناوە. ئەوەی مامۆستا حسامی لێی تێکچووە ئەوەیە کە« ماڵە گەورە» بە دوای دۆستایەتی ئەودا نە گەڕاون، چونکە پێویستیان پێ نەبووە، بەڵکوو ویستوویانە بیکەنە نۆکەر، ئەویش نۆکەریی نەکردوون. چۆنکە خۆی بە مارکسیست زانیوە. پێی وابوە ئەوە بەسە بۆ ئەوەی ببێتە خزمی« ماڵە گەورە». چونکە مامۆستا حسامی مارکسیزمی بە کوردایەتی داوەتە قەڵەم و « ماڵە گەورە» شی بە «کابەی مارکسیزم» زانیوە. ئەوەتە مامۆستا حسامی دەبێژێ:« بۆ خۆم پێم وایە کوردایەتیەکەم بۆیە تۆخە، چونکە مارکسیستی بە ڕاستیم. لام وایە ئەو کەسانەی خۆ بە مارکسیست و یا کۆمۆنیست دەزانن، ئەگەر بەر لە هەموو شت و لە هەموو کەس زیاتر نەتەوەی خۆی خۆش نەوێ، ڕاست ناکەن، خەڵکی دیکەشیان خۆش ناوێ.»( بەرگی نۆیەم ل ١٥)

ڕاستی یەکەی نە مارکسیزم کوردایەتی یە، و نە مامۆستا کەریمی حسامیش مارکسیست و کۆمونیست بووە. مارکسیزم بریتی یە لە هیپۆتێزی مێژووی شەڕی چینایەتی لە کۆمەڵگەی ئادەمیزاد دا، و ڕەوایەتی دروستکردن بۆ هێنانە سەر کاری ئەو چینەی کە بە «پرۆلیتاریا»ی ناو دەبرێ، لە ڕێ ی بە کار هێنانی زۆر وشکاندنی داو و دەزگەی دەسەلاتی ئەو چینەوە کە پێی دەگوترێ چینی «سەرمایەدار»، لە ئەنجامدا داخۆیانی کردن«اعلان»ی « دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا» بە سەر کردایەتی« پارتی کۆمۆنیست». ئەوە کاکڵی مارکسیزمە. جا ئەوەی بیرەوەری یەکانی کەریمی حسامی بخوێنێتەوە و کەمێکیش وەک مامۆستا بەشیرموشیر دەیفەرموو،« د یماغی» هەبێ، دەزانێ کە مامۆستا حسامی نە مارکسیستانە بیری کردووتەوە و نە مارکسیستانەش جوڵاوەتەوە. کەریمی حسامی خەریکی کوردایەتی بووە، نەک مارکسیزم، و لە هەمان کاتدا ویستوویەتی کوردایەتی بە نرخی مارکسیزم بە« ماڵە گەورە» و دەستو پێوەند

کانی بفرۆشێ، کە ئەوان خۆشیان فریان بە مارکسیتی یەوە نەبووە، ئەو جا بەچی و چۆن؟ بە چەند قسەیەکی خۆش و زمانلووسی و یەک دوو پەسن دانی« ماڵە گەورە» لە سەر رادیۆ و سەکۆی رۆژنامە. کە دیارە ئەو زمانلوسیەش لە ناسیاوە فارسەکانی فێر بوە. ئەگەرنا کە لە کۆتایی پەنجاکاندا ناسیم، زمان لووس نەبوو. وەک لە قسەکانیدا بەرامبەر بە بەرپوە بەری قوتابخانەی ئێرانیەکان لە بەغدا دەر کەوت. راستی یەکەی« ماڵە گەورە» و دەستو پێوەندەکانی ئەو قسە لووسانەیان بە نرخی خۆی کریوە لێی. رێ یان بە کەریمی حسامی و چەند کوردی هەلاتوی دیکە داوە کە لە ولاتەکەیاندا بژین وبخوێنن، و هێندێک داخوازیی سوکەڵەشیان بۆ مامۆستا حسامی جێ بە جێ کردووە وەک دانی ڤیزە بە چەند کوردێک لە بەر خاتری حسامی. بەلام نە چوون رێ یان بدەن لە ولاتەکەیاندا خەریکی سیاسەت بن. یان نەچوون تۆپی فرۆکە شکێن بدەن بە حسامی لە دژی لەشکری شا یان خومەینی بە کاری بهێنن، یان نە چوون دلّی رژێمی ئێران بشکێنن لە بەر خاتری زمانلووسی کەریمێکی حسامی. چونکە مەسەلە مەسەلەی بەرژەوندیی ماددی و مانایی یە و دەستخستنی دەسەلات و پاراستنێتی، نەک مەسەلەی« بەڵێ و قوربان قوربان» وفەرمایشتەکەی جەنابتانە»ی وشک و برنگی کەریمی حسامی. مامۆستا حسامی خۆشی ئەمەی باش زانیوە، چونکە لە ل ١٨٣-١٨٤و١٨٥ی بەرگی حەوتەمی بیرەوەری یەکانیدا دەبێژێ:« هێندێک لە کوردە ناسیۆنالیستە تۆخەکان تەواوی دیزە و گۆزەی ژێر دەستی و بەشخوراوی کورد لە سەری ولاتانی سۆسیالیستیدا دەشکێنن و گۆیا ولاتانی سۆسیالیستی لە بەر خاتری بەرژەوەندی سیاسی و بازرگانی خۆیان یارمەتی بە گەلی کورد ناکەن. ئەو کەسانە لە بەر هەستی دلسۆزی و بێکەسی گەلەکەیان لە لایەک و لە بەر ورد نەبوونەوە لە مەسەلە سیاسیەکان و نە ناسینی سیاسەتی نێو نەتەوەیی ولاتانی سۆسیالیستی لە لایەکی ترەوە تووشی ئەو بۆچوونە چەوتە دەبن و دەیانەوێ هەر وابەئاسانی خۆ لە چنگ بیر کردنەوە رزگار بکەن و بۆ ناسینی هۆیەکانی ژێر دەستی گەلی کورد خۆ ماندوو یا پیاو خەراپ نەکەن. لە نێو گەلانی دواکەوتوودا زۆر باوە بۆ ئەوەی خۆ بە مەسەلەکانەوە ماندوو نەکەن، تاوانی رووداوەکان دەخەنە سەر ئەستۆی بێگانە و خۆیان بە خەتا بار نازانن. خاوەنی

ئەمجۆرە بیر و باوەڕە، یەکەم پێویستە ئەوەندە بزانن کە وڵاتانی سۆسیالیستیش وەک هەموو گەل و وڵاتێک سیاسەتی تایبەتی خۆیان هەیە و پێش هەموو شتێک قازانجی نیشتمانی خۆیان لە بەر چاو دەگرن. دووەم ئەگەر بە ئینسافەوە تەماشا بکەین بۆمان دەر دەکەوێ کە پاش شەڕی دووەمی جیهانی هیچ گەل و نەتەوەیەک نەبووە کە بە بێ یارمەتی وڵاتانی سۆسیالیستی ئازاد بووبێ و لە خەباتی رزگاریخوازی دژی ئیمپریالیستیدا سەر کەوتبێ. ئەم سیاسەتەی وڵاتانی سۆسیالیستی بۆ هەموو کەس روون بۆتەوە گەلی کوردیش بە نۆرەی خۆی تا ئەو دەمەی سیاسەتێکی ڕوون و ئاقڵانەی هەبووە لە یارمەتی ماددی و مەعنەوی وڵاتانی سۆسیالیستی بێ بەش نەبووە. کە وابوو لە جیاتی ئەوەی خەڵکی تر تاوانبار بکەین با غیرەتی ئەوەمان هەبێ پێ لە هەڵە و چەوتی یەکانی خۆمان بنێین، برایانە ڕەخنە لە خۆمان بگرین لە وەزعی خۆمان بکۆڵینەوە و ڕێگای چارە بدۆزینەوە.» دیارە قسەکەی مامۆستا حسامی ڕاستە کە دەبێژێ:«... خاوەنی ئەم جۆرە بیر و باوەڕە یەکەم پێویستە بزانن کە وڵاتانی سۆسیالیستیش وەک هەموو گەل و وڵاتێک سیاسەتی تایبەتی خۆیان هەیە و پێش هەموو شتێک قازانجی نیشتمانی خۆیان لەبەر چاو دەگرن.» باشە کە وایە ئێدی جیاوازی چی هەیە لە نێوان وڵاتێکی سۆسیالیستی و وڵاتێکی سەرمایەداریدا، کە هەردووکیان لە باری سەرنجی« قازانجی نیشتمانی» خۆیانەوە بۆ مەسەلەکان بچن و قازانجی نیشتمانیی گەلانی ژێر دەستە بکەن بە قوربانی دەسکەوتی خۆیان، وەک بە کردەوەش کردیان. ئەوەش ڕاست نیە کە مامۆستا دەبێژێ« پاش شەڕی دووەمی جیهانی هیچ گەل و نەتەوەیەک نەبوە کە بە بێ یارمەتی وڵاتانی سۆسیالیستی ئازاد بووبێ و لە خەباتی ڕزگاریخوازی دژی ئیمپریالیستی دا سەر کەوتبێ... گەلی کوردیش بە نۆرەی خۆی تا ئەو دەمەی سیاسەتێکی ڕوون وئاقڵانەی هەبووە لە یارمەتی ماددی و مەعنەوی وڵاتانی سۆسیالیستی بێبەش نەبوە.» ڕاستی یەکەی تا ئێستە هیچ گەل و نەتەوەیەکی ژێر دەستە نەبووە کە بە یارمەتی وڵاتانی سۆسیالیستی ئازادی خۆی دەستکەوتبێ. تەنێ پاش هەرەسهێنانی ڕژێمی سۆڤێت بوو کە نێزیکەی دە دەوڵەتی سەر بەخۆ لە سەر دار و پەردووی کۆنە سۆڤێت و دەسکەلا ئەورووپایی یەکانی دامەزران. ئەوجانازانم مەبەستی مامۆستا لە « سیاسەتێکی

ڕوون و ئاقڵانە»ی کورد چی یە کە « پارمەتی ماددی و مەعنەوی وڵاتانی سۆسیالیستی وەر گرتبێ.» ئەوەی لە هەموان ئاشکرایە ئەوەیە ٥٠ ساڵی ڕەبەق « ڕۆشنبیران»ی کورد. وەک دەروێشی حاڵ لێهاتوو. چەپڵەیان بۆ یەکێتی سۆڤێت و دەسکەڵا ئەوروپایی یەکانی لێدا، ئەوەتا مامۆستا حسامی خۆشی دەنوسێ کە خۆی و چەند کوردێکی دیکە لە ڕۆژی ١٩٦٧/٥/٩دا« جێژنی تێشکانی فاشیزم» یان لە باڵیۆزخانەی چیکۆسلۆڤاکیا گرتوە( بەرگی پێنجەم ل ١٥٦)لە کاتێکا ئەوە تێشکانی فاشیزم نەبوو، بەڵکوو تێشکانی ڕاپەڕینی گەلی چەوساوە وزەحمەتکێشی چێکو سلۆڤاکیا بوو بە تانگ و تۆپ ولەشکری دەستدرێژکەری سۆڤێت و هێندێک لە دەسکەڵا ئەوروپایی یەکانی.

**( لێرەدا مامۆستا جەمال نەبەز ڕاست بۆ نووسراوەکەی من نەچوە. من نووسیومە:« ڕۆژی ١٩٧٧/٥/٩ باڵیۆزخانەی چێکوسلۆڤاکیا بە بۆنەی ئازادی پراگ و تێک شکانی فاشیزم جێژنی گرتبوو، ئێمەشیان داوەت کرد بوو.» کە وابوو: یەکەم « خۆی و چەند کوردێک( وەک مامۆستا جەمال دە فەرموێ) جێژنیان نەگرتوە.» بەڵکوو داوەت کراون. ئەوەش داب و رەسمێکە و داوەت کردن شتێکی ئاساییە. دووەم: ١٩٤٥/٥/٩ ڕۆژێکی زۆر ئاشکرایە. ڕۆژی تێشکانی فاشیزمی هیتلەری یە و ڕۆژی براەنەوەی شەڕی دووەمی جیهانی یە نەک ڕۆژی تێکشکانی ڕاپەڕینی گەلی چەوساوە و زەحمەتکێشی چێکوسلۆڤاکیا» وەک مامۆستا دەفەرموێ. هەموو ساڵێش نەک هەر وڵاتانی پێشووی سۆسیالیستی بەڵکوو وڵاتانی سەرمایەداریش ئەم ڕۆژە یاد دەکەنەوە.» - حسامی )**

بەڵام ئەوەتە ماڵە گەورە ئەوەشی لە بەر چاو نەبووە کە مامۆستا حسامی و چەندکوردێکی دیکە بۆ ڕاگرتنی دڵی کردوویانە. بە کورتی: یەکێتی سۆڤێت پاداشی پەنجا ساڵ بە بە ژن و باڵدا هەڵدانی لە لایەن خوێندەوارانی کوردەوەی بەمانەی خوارەوە دایەوە. چونکە سیاسەت بەرژەوەندی یە نەک ماستاو سارد کردنەوە:

١- داننانی ڕەسمی لێنین بە حکوومەتی دیکتاتۆری ئەتاتورک لە ساڵی ١٩٢١دا، بەر لەوەی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بە ڕەسمی دان بە بوونی دابنێن.

٢-بوختانکردنی بە شۆڕشی کوردو سەرکردەکەی شێخ سەعیدی

مەزن،وەکەدەستنده خۆری بەریتانیا» له سالّی ١٩٢٥دا.

٣-هەڵوەشاندنەوەی کۆماری ئۆتۆنۆمی داری« کوردستانی سوور» له سالّی ١٩٢٧دا ولکاندنی به ئازەربایجانەوە،که ئێستەش هەر دانەمەزراوەتەوە.

٤- پشتگیری کردنی رژێمی ترک بۆ کوژاندنەوەی شۆرشی ئارارات له سالّی ١٩٢٨دا

٥-خەڵەتاندنی کورد له کاتی کۆماری کوردستاندا به سەرۆکایەتی پێشەوا قازی محەمەد له بەر خاتری نەفت له سالّی ١٩٤٦ دا و رۆخانی کۆمار هەر لەو ساڵەدا به هۆی ئەو ناپاکی یەوە.

٦- پشتگیری کردنی شای ئێران به هەوالگوزاری له سالّی ١٩٥٤ دا و ، رێ نەدانی به سەر کەوتنی کۆدەتا دژی رژێمی شا لەو ساڵەدا.

٧- پشــتگیــری کــردنــی رژێمی بەعــسی عـێــراق به چەک وتێکنۆلۆژی و دیپلۆماسی له سالّی ١٩٧٠ وە تا روخانی رژێمی سۆڤێت

مامۆستا حسامی هەر خۆی دەنووسێ که « ولآتانی سۆسیالیستی و حیزبه سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان» حکوومەتی بەعسی عیراقیان به حکوومەتێکی پێشکەوتوو ناسیوە.( بەرگی پێنجەم ل ١٩٣) ( **مامۆستا جەمال لێرەشدا به باشی سەرنجی دەقەکەی نەداوە. ئەم برگەیە نووسینی دوکتور قاسملوی شەهیدە به ناوی( بەرنامەی کار) بۆ کۆبوونەوەی رێکخراوە کوردستانیەکان که دەبێژێ: « له دەرەوش حکوومەتی عیراق له لای ولآتانی سۆسیالیست و حیزبه سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان به حکوومەتێکی پێشکەوتە ناسراوە.» حسامی)**

جا ئەگەر حکوومەتێکی وەک حکوومەتی بەعس لای وان« پێشکەوتو» بووبێ، دەبێ رژێمێکی« دواکەوتوو» لای وان چۆن بووبێ؟

مامۆستا حسامی هەر خۆی دەبێژێ:« له نێو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا، حیزب و رێکخراوی میللی و پێشکەوتو خواز و لایەنگری سۆسیالیزم کەم نین. به داخەوە یارمەتیان پێ ناکرێ و پێوەندی یان له گەڵ ناگیرێ. ئەم سیاسەتە دەبێتە هۆی ئەوە کە ناوەندی بریاردان بکەوێتە دەست کەسانی هەلپەرست و بزووتنەوەش بۆ رۆژئاوا بکێشن.» (بەرگی هەشتەم ل ١٨٤-١٨٥)

بەلآم سەیر ئەوەیه کە مامۆستا حسامی ئەم هەڵوێستە ئیمپریالیستە بازرگانانەیەی یەکێتی ی سۆڤێت و دەوڵەتە « سۆسیالیستەکانی خستووەتە

سەرئەستۆی حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، بۆ وێنە حیزبی تودەی ئێران، وەک ئەوەی حیزبی تودە سەر کردەی یەکیەتی سۆڤێت بوویێ، نەک نانخۆر و نۆکەری ئاڵقە لە گوێی سۆڤێت. مامۆستا حسامی لە لاپەڕە١٨٥- ١٨٦ی بەرگی هەشتەمدا دەنووسێ :« بە پێویست دەزانم کوردستان وەک نموونەیەکی کۆنکرێت باسبکەم. لە ساڵی ١٩٧١وە کە حیزبی دێمۆکرات بە پرۆگرامێکی پێشکەوتخوازانەوە تێکۆشانی خۆی زیندوو کردەوە، سەرە ڕای ئەوەی هەوڵێکی زۆر درا کە لە گەڵ حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤێتی پێوەندی بگیرێ، هیچ ئاکامێکی نەبوو. دوای ڕووخانی ڕێژیمی شا لە ئێران، حیزبی دێمۆکرات بوو بە گەورەترین حیزبی سیاسی ناوچە. دەبوایە یەکیەتی سۆڤیەتی بۆ ناسین و یارمەتی دان و ڕاوێژ کردن لە گەڵ حیزبی دێمۆکرات هەنگاوی نابایە. بە داخەوە سیاسەتی چەوتی حیزبی تودە، کار بەدەستانی سۆڤیەتی توشی هەڵوێستی چەوت کرد و مەسەلەی ناسین و یارمەتیدانی حیزبی دێمۆکراتی خستە پشت گوێ. نەک هەر ئەوە ڕێبەرایەتی حیزبی تودە بۆ پشتیوانی لە حکوومەتی کۆنە پەرستی ئاخوندی، ڕێگای دوژمنایەتی لە گەڵ حیزبی دێمۆکراتی گرتە پێش و چەند کەسی بێ ئەزمون و ساویلکە وفریو خواردووی لە حیزبی دێمۆکرات جیا کردەوە و ڕێبەرایەتی حیزبی دێمۆکراتی بۆ لایەکی دیکە پاڵ پێوە نا. لەم بار و دۆخە دژوارەدا کە خەڵکی کوردستانی ئێران توشی هاتبوو، وڵاتانی سۆسیالیستی دەفریای ئەم میللەتە لێقەوماوە نەکەوتن. یارمەتی بە ئاوارەو دەربەدەری کورد نەکرا. دەزگای خەبەری وڵاتانی سۆسیالیستی لە ئاست جنایەتی حکوومەتی خومەینی لە کوردستان دەنگی لە بەر نەهاتە دەر. چاپەمەنی وڵاتانی سۆسیالیستی خەبەری کوشتاری زەحمەتکێشانی کوردستانیان بڵاو نەکردەوە. تەنانەت گۆڤاری ئاشتی و سۆسیالیزمیش کە ئۆرگانی حیزبە کۆمونیست وکرێکارەکانی جیهانە وئەرکی ئینسانی و ڕاستە قینەی دیفاع لە مافی میللەتانی ژێر دەست و خەبات دژی زوڵم وزۆرداری یە. تاقە جارێکیش جنایەتی ڕێژیمی خومەینی یان لە قاو نەدا. تەنانەت نامەیەکی منیشیان لە بارەی بار ودۆخی کوردستان و گەلی کوردەوە بڵاو نەکردەوە. ئاشکرایە کە زەحمەتکێشانی کورد ناتوانن ڕەزامەندی خویان لە ئاست ئەم سیاسەتە دەرببڕن. ئەنجامی سیاسەتی ناڕاست و لالوتی

سۆڤیێت سەبارەت بە بزووتنەوەی کوردستانی ئێران بوو بە هۆی ئەوە کە ڕێبەرایەتی حیزبی دیمۆکرات بەرەو عێراق و بەرەو ڕۆژئاوا و بەرە سۆسیال دیمۆکراسی بڕوا کە بۆ گەلی کورد لە نامرادی بەدەر ئەنجامێکی نابێ. بەداخەوە بزووتنەوەی ئێستای ڕزگاریخوازی کورد توشی قەیران بوە. ناکۆکی دوژمنانە لە نێوان هێزە کوردستانیەکان، شەڕی براکوژی فشاری لە ڕادە بەدەری حکومەتە جنایەتکارەکانی ئێران و عێراق و تورکیا، یارمەتی نەدانی وڵاتانی سۆسیالیستی بزووتنەوەی کوردی یان توشی نسکۆ و هەڵەنگوتن کردوە. وڵاتانی سۆسیالیستی و بە تایبەت یەکێتی سۆڤیێتی بە گوێرەی سروشتی داد پەروەرانەیان، لە بەرانبەر چارەنووسی نەتەوەی کورد دا بەر پرسی یان لە ئەستۆیە. کاتی ئەوە هاتوە کە لە گەڵ ڕێبەرانی حیزب و جوڵانەوەی ڕزگاریخوازیی کورد پێوەندی بگیرێ و یارمەتی ماددی و مەعنەوی یان پێبکرێ و لەم ڕێگایەوە ڕێبازی پێشکەوتنخوازی و سۆسیالیستی نەک هەر لە کوردستان، بەڵکوو لە ڕۆژ هەڵاتی نێوە ڕاست بەرەو پێش بەرن ، ٢٥ میلیۆنی بندەست و بەشخوراوی کورد لەم قۆناخە ناسکە دا هەقیەتی ئەم نووسراوەی ڕۆژنامەی پراڤدا وەبیر ڕێبەرانی وڵاتانی سۆسیالیستی بێنێتەوە کە لە ٢٨ی یونی ١٩٦٥دا نووسیبووی: « یەکێتی سۆڤیێتی بە هەموو شێوەیەک یارمەتی بە خەباتی ڕزگاریخوازی میللەتان دەکات، مافی نەتەوەکان لە پێناو ئازادی وسەر بە خۆییدا، چ لە ڕێگای هێمنانە و چ لە ڕێگای خەباتی چەکدارانەوە، خەباتێکی پیرۆزە.»

ئەوەی کە مامۆستا حسامی دەفەرموێ:« بە بۆچوونی من( واتە بۆچوونی مامۆستا حسامی) فەلسەفە و ڕێگای لێنین تاقە ڕێگای ڕزگاری میللەتانە لە چەوسانەوە»( بەرگی هەفتەم ل ٢٢١)، ئەوا کورد ئەو ڕێگەیەی ٥٠ ساڵی ڕەبەق تاقی کردەوە و ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە دیمان. بە بیر وڕای من ڕێی ڕزگاری گەلان، ڕێی خۆ ڕزگار کردنە لە مۆتەکەی بیری خۆ بەستنەوە بە کلکی خەڵکەوە. و گەڕانە بە دوای ڕێ و شوێنێکدا کە لە گەڵ بار ودۆخی گەلەکەی خۆی و هەل و مەرجی دەرەوە بگونجێ. ئەمەم پێش ٤٠ساڵێک گوتوە و نووسیوە و قسەی ئەو ڕۆم نیە.

(بۆ چوونەکانی مامۆستا دوکتور جەمال نەبەز جێگای موناقەشەو لێدوانن.

**مامۆستا دەفەرموێ:«...٥٠ ساڵی رەبەقە « رۆشنبیران» ی کورد، وەک دەروێشی حاڵ لێهاتوو، چەپڵەیان بۆ یەکیتی سۆڤیت ودەسکەلا ئەوروپایی یەکانی لێدا .... بەلام یەکیتی سۆڤیتی پاداشی پەنجا ساڵی بۆ خوێندەوارانی کورد ئەو ٨ خاڵەیە کەوامامۆستا لە لاپەرەکانی پێشوودا باسی کردوون. مامۆستا باسی ئەوەش ناکا کە ٥٠ ساڵیشە کۆمەڵێکی نیکەی رۆشنبیر وسیاسیەکانی کورد دژی یەکیتی سۆڤیت و پەسنی دەوڵەتانی رۆژئاوا شان دەکوتن. ماوەی ٤٠ ساڵیشە مامۆستا کاژێکنامەی نووسیوە، باشە ئەوانە لە چاو رۆشنبیرانی کە مامۆستا بە ( ماستاو سارد کەرەوەیان) ناو دەبا و رەخنەیان لێدەگرێ، چی یان کردوە.؟ کام دەستکەوتیان بەم سیاسەت و بۆچوونانە بۆ کورد بە دیاری هێناوە، ئەوە نیزیکەی دە ساڵیشە ئەو سیستەمەی کە بە قسەی مامۆستا ( بۆتە هۆی چارە رەشی کورد) تەفر و تونا بوە، ئامۆژگاریەکانی چل ساڵەی مامۆستا جەمال نەبەزیش هەر وەک خۆی لە کار دان، کورد لەم دە ساڵەدا بە چی گەیشتوە؟ کام دەستکەوتی وەدەست هێناوە.؟ قسە زۆرن، من لە بیرەوەری یەکانمدا رەخنەم لە هەڵوێستی رابردوو گرتوە. ئێرە جێگای ئەم دەم بەدەمەیە نیە، ئەم کورتە پەراوێزە تەنیا بۆ ئەوە بوو کە بڵێم لام وایە رۆشنبیرانی کورد نابێ هەر بەوە کات بەرنە سەر کە بڵێن رابردوو چۆن بوە و چیم کوتوە، دەبێ بۆ ئێستا پرۆژەیان هەبێ و کاری بۆ بکەن . کورد بە قسە رزگار نابێ.) حسامی.**

سەیر ئەوەیە کە بەرێز غەنی بلوریان کە لەوە پێش دەیگوت:« نابێ بەخاتری کوردستان شەڕ بکەین. دەبێ بەخاتری ئێران شەڕ بکەین»(بەرگی شەشەم ل ١١٧)، هەر ئەو غەنی یە لە ١٩٧٨/١٢/٣٠دا نامەیەک دەنووسێ بۆ مامۆستا حسامی ودەبێژێ:« کۆڕ و کۆمەڵ بیری لێ وەکەن و ڕێبازی دوا رۆژی نەتەوەی خۆ دیاری بکەن. جا بۆ ئەو کارە دەبێ لێزانی سیاسی کاری کورد کۆ وەبن و بیری لێ وەکەن. هەتا زووتر باشتر. بە داخەوە خۆ بەستنەوە بەم و بەو کەلکی براوە. بەلام ئێستا کە هیچ دەگۆڕێدا نیە چار چیە، هەر کەس مەجبور دەبێ بۆ لایەک ڕابکێشێ. بەلام ئەوەندەی کە ئەزمونی ژیان سەلماندوویەتی لام وایە کورد دەبێ بۆ خۆی بێت و لە سەر پێی خۆی ڕاوەستێ و پشت بە کەس نە بەستێتەوە، کەس جێگای متمانە نیە جگە کورد بۆخۆی.»( بەرگی نۆیەم ل ٢٠٧-٢٠٨) ئەو جا ئەو قسانە جیاوازیان چی یە لەو قسانەی کە لە ساڵی

١٩٦١ دا له« کاژیکنامه»دا نووسرا بوون و یەکێک له وانه» پشت به خۆ بەستنه له کاتێکدا ئەو سەر دەمە و سی ساڵێکیش دوای ئەوە» کۆمۆنیست و مارکسیستەکانی کورد» ئەوەیان به بیری « تەسکو تروسکی شۆڤێنیانه دەدایه قەڵەم»؟

لێرەدا دەبێ ئەوەش بخەینه بەر چاو که مامۆستا حسامی، هەر چەنده ئەندامی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران بووە که دروشمەکه « ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی ئێران و دێمۆکراسی بۆ ئێران» بووە ( و ئێستاش هەر ئەو دروشمەیە)، بەڵام له لاپەڕە( ١٣٣ی بەرگی نۆیەمی بیرەوەری یەکانیدا ١٩٨٥) که له ساڵی ١٩٩٥دا له چاپ دراوە دەبێژێ: « ئەگەر دێمۆکراسی لەم وڵاتەدا( ئێران) هەبێ، هیچ پێویست ناکا بۆ خود موختاری ٤٠-٥٠ هەزار کەس به کوشت بدەن. خود موختاری چی دەوێ ؟ هەر ئەوە نی یه که داوا دەکات له جیاتی عەجەمێکی تارانی، با کوردێکی مەهابادی بکرێته فەرمانداری مەهاباد.» بێگومان مامۆستا حسامی لەم قسانەدا له هێڵی حیزبەکەی لایداوە و دێته سەر بیر ورای من که هەر له پەنجاکانەوە یەکێک له ناکۆکیەکانم له گەڵ پارتی دێمۆکراتی کوردستانی ( عێراق) و حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی(ئێران) و هەموو وردە بۆرژوای مارکسیستی کورد ئەوە بوە که ئەوان بۆ ئۆتۆنۆمی ئەو هەموو وزەیان بەخت کرد و ساڵانی ساڵ کاتیان بەو ئاواتە بردە سەر که ئۆتۆنۆمی دەست بکەوێ و، سەد هەزاران کەس لەو پێناوەدا کوژران و هیچیش به هیچ نەکرا. له سەمینارێکدا که له رۆژی ١١/٥/١٩٨٥دا له ستۆکهۆڵم له ژێر نێوی، دۆزی ناسیۆناڵی کورد:« ئۆتۆنۆمی یان کوردستانێکی سەر بەخۆ؟ یان بڕیاری چارە نووس له ئازادی دا بۆ ئازادی» بۆ من ساز درا بوو( دەقی سێمینارەکه هەر له ساڵی ١٩٨٥دا چاپ و بڵاو کرایەوە) به تێر و تەسەلی باسی ئۆتۆنۆمیم کرد و ئەمەم خستە ڕوو که ئۆتۆنۆمی شتێکه نه له باری تیئۆری یەوە به کار ی کورد دێ ونه له باری کردەوەش سەر دەگرێ. ئەوەته دەبینی هێندێک له کۆمەڵه سیاسی یەکانی کوردستان ستراتیژی خۆیان له ئۆتۆنۆمی یەوە کردوە به فیدراسیۆن که هیوام وایه فیدراسیۆنەکه وا نەبڕنەوە که کوتومت وەک ئۆتۆنۆمی بێ.

سەیر ئەوەیه هێندێک لەو بێگانانەی که بار و دۆخی گەلەکەیان له بار ودۆخی

کورد دەچێ ئەمەیان بە مامۆستا حسامی ڕاگەیاندوە. مامۆستا حسامی لە لاپەڕە(١٤٥)ی بەرگی هەفتەمدا دەفەرموێ کە« ئەبو ئەیادی» فەلەستینی پێی گوتوە: « دەبێ حیزبی دێمۆکرات دروشمی خۆی لە خود موختاری یەوە بگۆڕێ و داوای سەر بە خۆیی کوردستان بێنێتە گۆڕێ.»

لەم بوارەدا دەمەوێ بێژم کە لە داواکردنی ئۆتۆنۆمی خەراپتر ئەوەیە کە سنووری ئەو ئاخە(خاک)ەی دەچێتە چوار چێوەی ئەو ئۆتۆنۆمی یەوە بە دەنگی دانیشتوانی دیاری بکرێ، وەک لە پرۆگرامی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دا باسکراوە.(مادەی ٢لە بەرنامەی ٢٦مادەیی خود موختاری دەستەی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد کە لە شەش مادە دا کورت کراوەتەوە: ناوچەی جوغرافیایی کوردستان بە گوێرەی دەنگی زۆربەی دانیشتوانی خەڵکی ناوچە- بەرگی حەوتەم- لە بیرەوەری یەکانم ل ٢٧). بێگومان ئەم بەندە بە دڵی داگیرکەرانی کوردستانە، بۆیە لە« کەلاڵەی پرۆژەی خود موختاری کوردستانی ئێران، کە لە ١٧ی ڕەزبەری ١٣٦٢دا لە لایەن شورای بەرگری نیشتمانی( جبهه مقاومت ملی)« مجاهدین خلق« وە بلاو کراوەتەوە، لە مادەی یەکەم دا دەبێژێ: ناوچەی خود موختاری تەواوی کوردستان دەگرێتەوە. مەڵبەندی جوغرافیایی ئەم ناوچەیە لە ڕێگەی دەنگدانی گشتی خەڵکی ناوچەی کورد نشینی ولاتەوە دیاری دەکرێ«(بەرگی ئەشتەم ل ٢٢١)

دەنگ وەرگرتن لە بارەی زاگۆنی ( قانونی)یەوە بۆ پەیدا کردنی ڕەوایەتی یە ( شەرعیەت)بۆ بار و دۆخێکی نادیار. ئەو بار و دۆخانەی کە خۆ ڕسکێن، ڕەوایەتی خۆیان بە خۆیانەوەیە. بۆ وێنە کە تۆ بەردێکت بەرە و ئاسمان هەڵدا، ئەگەر بەر هەڵستێک نە بێ بیگرێتەوە، دەکەوێتە سەر زەوی. ئەوجا ئەگەر هەموو خەڵکی ئەم جیهانە دەنگ بدەن و بڵێن ناکەوێتە سەر زەوی، ڕەوایەتی بۆ قسەکەیان دروست ناکەن. هەر وەها تۆ کوڕی چ دایکێکیت، بە دەنگ وەرگرتنی تۆ یان هەموو جیهان ڕەوایەتی بۆ ژنێک پەیدا ناکەن ببێتە دایکی تۆ ئەگەر بە ڕاستی دایکت نە بێ. کوردستان ڕاستینەیەکی مێژوویی و جوگرافیایی و ژیاری یە کە بە درێژایی هەزاران ساڵ دروست بووە، بە پێچەوانەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە کە هەموو پاش جەنگی جیهانیی یەکەم بە شێوەیەکی دەستکرد دروست کراون، سنووری کوردستان ٤٠٠ ساڵ لە مەو بەر

له شەرەفنامەی بیتلیسی دا دیاری کراوه کە ئەو کاتە هیچ گەلێک باسی سنووری ناسیۆنالی خۆیان نەکردوە. دوای ئەمەش ئایا هیچ گەلێک تا ئێستە رازی بووە بەوەی بە دەنگ وەر گرتن سنووری ناسیۆنالی خۆی دیاری بکات تا کورد بەوە رازی بێ؟ له ترس یان لە ژێر کارکردی پرۆ پاگاندەی دژ بە کورد و یان لە بەر هەر هۆیەکی کاتیی دیکە با بێژین بەشێک لە کوردستان ناکەوێتە سنووری دەسەلاتی بەڕێوە بەرێتی کوردستانەوە، ئایا ئەمە ڕەوایەتی بۆ جیابوونەوەی ئەو بەشەی کوردستان دروست دەکات؟ کێ دەبێژێ هەر ئەو خەڵکە خۆیان پاش چەند ساڵێک نایانەوێ لە گەڵ کوردستانە « ئۆتۆنۆمی یەکە» یان « سەر بەخۆکە» یەک بگرن. لە کاتێکدا لە وانەیە ئەو هەلەیان جارێکی دیکە دەست نەکەوێتەوە، یان نێوچەکەیان هێندە ناکوردی تێ ئاخنرا بێ، کە لە دەنگداندا زۆربەیەتی نەهێنن! ئەمانە شتێکن دەبێ زۆر بە هوردی بیر بکرێتەوە لێ یان.

نووسینەکەم درێژەی کێشا و دەمەوێ بە سوپاسێکی گەرمی برای بەرێز مامۆستا کەریمی حسامی کۆتایی پێ بهێنم، کە ئەم دەرفەتەی دا بە من، بیرو رای خۆم لە بارەی بەرهەمەکەیەوە کە پوختەی بە سەرهاتی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی پەنجا ساڵەیەتی دەر ببڕم. له دوا وشەدا دەبێژم: « مێژوو بریتی یە لە کۆمەڵێک ڕووداو کە تێپەڕ بوون و کەس ناتوانێ وایان لێ بکات کە تێپەڕ نە بووبن، ئەگەر ئەوانەی لە نێزیکەوە ئاگایان لێ بووە، نەیخەنە سەر کاغەز، ئەوا وەک ئەو گۆرانی بێژانەیان لێ دێ کە لە ژیانیاندا بەخت نەبوومتە یاریان، تا لە بەر دەم دەزگەیەکی تۆمار کەر دا گۆرانی بڵێن. ئەوانە دەنگەکەیان لە گەڵ خۆیان دەبەنە بن گڵ. مامۆستا کەریمی حسامی لە مە دا بەخت بووەتە یاری. ئاهورا مەزدا بێ وەیی کات و تەمەنی درێژ کات. بەرلین ٦/٦/١٩٩٦ جەمال نەبەز.

ئەم نووسینەی مامۆستا جەمال نەبەز درنگ گەیشتە دەستم و پێرا نەگەیشت کە لە بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانمدا چاپی بکەم. مایەوە تا ٧/١/٢٠٠٠ چوومە برلین و چاوم بە مامۆستا کەوت و لە شوێنێکی فرە شازی بەرلین بۆ قاوڵتی داوەتی کردم . تکام لێکرد ڕێگا بدا نووسراوەکەی لە بەرگی یازدەهەم دا بڵاو بکەمەوە. گوتی پێم خۆشە لە گەڵ بەرگی دەیەم بۆم بنێرییەوە، چاوێکی

پێدا بخشێنمەوە و شتێکی کورتیش لە سەر بەرگی دەیەم بنووسم. نووسراوەکە و بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانم بۆ نارد. ئەویش لە گەڵ چاو پێدا خشاندنەوە و بژاری هەڵەکان ئەم چەند لاپەڕەیەشی لە سەر بەرگی دەیەم بۆ ناردمەوە و وا لێرە دا بڵاوی دەکەمەوە:

**پەشکۆتەیەکی پێویست**

ئەم چەند لاپەڕەی سەروو کە لە جیاتی پێشەکی یەک بۆ بەرگی دەیەم نووسیبووم، فریای بەرگی دەیەم نە کەوت و، دەبێتە« بەشێک» لە بەرگی یانزەهەم، جا لە بەر ئەوەی بەرگی دەیەمم نە دیبوو، پێویستە لێرە دا باسێکی بەرگی دەیەمیش بکەم کە نێو ئاخنەکەی لە ساڵی ١٩٨٩ەوە تا ساڵی ١٩٩٥ دەگرێتەوە و، سەر دەمێکی یەکجار گرنگە لە مێژووی نەتەوەی کورد دا چونکە هەمووی ساڵێک لە وە بەر بوو(مارتی ١٩٨٨)کە دەوڵەتی عەرەبی عێراقی داگیرکەر بە سەرۆکایەتی ی سەددام حسەین بە گازی ژەهراوی شاری هەڵەبجەی بۆمباران کرد و هەزاران کوردی بێ گوناهی لە چاو ترووکاندنێکدا کوشت. لە مانگی ئابی هەر ئەو ساڵە دا (١٩٨٨) خومەینی و سەددام جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئێرانیان راوەستاندو، ئەو جا دەستی هەر دوو رژێمەکە بەرەڵڵا بوو بۆ تەفر و تونا کردنی کورد. مامۆستا حیسامی لەم بەرگەدا، لە پاڵ بڵاو کردنەوەی هێندێک هەواڵ و نووچەی سەرنج ڕاکێشدا پەنجە ی بۆ کۆنفرانسێکی نێو دەوڵەتی زۆر گرنگ ڕاکێشاوە کە لە ١٩٨٩/١/٧دا لە پاریس لە لایەن نوێنەرانی ١٤٩ دەوڵەتەوە بەسترا، وەک کار دانەوەیەک بۆ ئەو دڵە ڕاوکەیەی کە گازی ژەهراوی و چەکی کیمیایی ی عێراق خستبوویە دڵی دەوڵەتە گەورەکانەوە کە هەر خۆیان یارمەتی ی سەددامیان دابوو بۆ دروستکردنی ئەو چەکە. حیسامی زۆر بە ڕوونی پەردەی لە دووڕوویی و درۆزنی ئەو دەوڵەتانە لا بردووە کە لە کۆنفرانسەکەدا بەشدار بوون، بەڵام نە عێراقیان تاوانبار کرد و نە باسی کەلکوژی دەوڵەتی عەرەبی عێراقیان کرد بەرامبەر کورد، تا وایان لە سەددام کرد، بێ ترس و لەرز لە مانگی هەشتی ١٩٩٠دا پەلاماری کوێتی دا و بەرژەوەندی ی دەوڵەتانی ڕۆژاوا و هەڤاڵبەندە عەرەبەکانیانی خستە مەترسی یەوە. ئەوجا سەددام لە شەو و ڕۆژێکدا بوو بە شەیتان و دێوو، لە بەهاری ١٩٩١ دا بە هێزی لەشکر لە کوێت دەر کراو،ئەوە

بوو جۆرج بوش، سەر کۆماری ئەمریکا، داوای لە خەڵکی عێراق کرد کە دژی سەددام راپەڕن. کە خەڵکی باشووری کوردستان لە بەهاری ١٩٩١دا گەلێرانە راپەڕین و ٨٠٪ی خاکی باشووریان رزگار کرد، پێ یان وابوو ئەمریکا دەکەوێتە فریایان، بەڵام ئەوە بوو سەددام وەک بەرزەکی بانان لە کۆتایی مارتی ١٩٩١دا گەڕایەوە کوردستان و کەوتەوە قڕکردنی کوردو، لە وەوە گەلڕەوەکە دەستی پێکرد، کە ئەوەش کارەساتێکی جەرگبڕ بوو لە مێژووی ئادەمیزادداو، بوو بە هۆی دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایش» یان «هەرێمی نەفڕین». راستی یەکەی «کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان» کە بڕیاری دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایشی» دابوو، لە وانە بوو گەلێک بڕیاری دیکەی باشتریش بدا، ئەگەر بهاتایە و سیاسەتکارانی کورد هەر وا زوو و بە هەرزان نە چوونایە لای سەددام.

دیارە دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایش» هەلێکی باش بووە بۆ مامۆستا حیسامی کە سەرێکی کوردستان بداتەوە، بۆیە لە ١٩٩٣/١١/١٢ دا لە ڕێ ی ئەستەموڵ و باکووری کوردستانەوە چووەتەوە باشوور و لە وێ زۆر بە ڕێزەوە بە خێر هاتن کراوەو، چاوی بە سەر کردەی حیزبەکان و سیاسەتکاران و نووسەران کەوتوە و، لە بەرگی دەیەمدا چەند نامەیەکی سیاسەتکاران و چەند هەڤپەیڤینێکی بڵاو کردووەتەوە کە رۆژنامەکانی ئەوێ کردوویانە لە گەڵی و، بیر و بۆ چوون و رەخنەکانی خۆشی بێ ڕووپامالی خستووەتە بەر چاو. لە وانەی کە رەخنەی گرتووە لێ یان، بە ڕێز مەلا ئەولای حەیاکی ( ئەولای حەسەن زادە) سکرتێری گشتی ی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران. بەڵام مامۆستا کەریم لە مە دا دەریخستووە کە ناتوانێ دەوری «مەلا بەزێن» ببینێ، چونکە ئەو وەک مەلا ئەولای حەیاکی ومن ( جەمال نەبەز )بەختی ئەوەی نەبووە دەرزی مەلایەتی بخوێنێ. ئەگەنا ئایەتی قورئانی بە هەڵە نە دەگواستەوە نێو«بیرەوەری یەکانی» لە لاپەڕە(٢٧٧/دا دەنووسێ«لیس علی المریض حرجا» راستی یەکەی ئایەتەکە کە لە سورەتی( الفتح)دا هاتووە بەم جۆرەیە:« لیس علی الاعمی حرج و لا علی الاعرج حرج و لاعلی المریض حرج"«نەک حرجاً»

ئێستە بەر لەوەی کۆتایی بەم« لە جیاتی پێشەکی»یە بهێنم خۆم ناچار دەبینم کە سەرنجێکی زۆر کورت بەرامبەر بەوە دەر ببڕم کە مامۆستا لەم جێ یەدا فەرموویەتی:« جەمال نەبەز باسی ئەوەش ناکا کە ٥٠ ساڵیشە کۆمەڵێکی

دیکەی رۆشنبیر و سیاسیەکانی کورد دژی یەکێتی سۆڤیت و پەسنی دەوڵەتانی رۆژاوادا شان دەکوتن....هتد»

بە راستی ئەز بەش بە حاڵی خۆم هیچ کۆمەڵێکی رۆشنبیر یان سیاسەتکارانە کورد ناس ناکەم کە لە ماوەی پەنجا ساڵی پێشوودا پەسنی دەوڵەتانی رۆژاوای دابێ. حەز دەکەم بزانم ئەو کۆمەلانە و ئەو سیاسەتکرانە کێن یان کێ بوون و چ کارە بوون. ئەوەی دیار و رۆنە ئەوەیە هەموو کۆمەڵە و حیزبەکانی کوردستان( رێبازی کاژیکی لێ دەرکەین)چەپڵەیان بۆ رژێمی سۆڤیت لێ دەدا . هەڵوێستەکانی کاژیکیش بەرامبەر بە هەموو هێزەکانی جیهان، چ رۆژ هەلات و چ رۆژاوا هەڵوێستێکی زانستانە وبابەتانە و رەخنەگرانە بووە و بە هیچ لایەکدا دای نەتاشیوە. بەڵگەکانیش هەموو ماون.

ئەو جا ئەوەی کە مامۆستا فەرموویەتی« جەمال نەبەز» چل ساڵێکە کاژیکنامەی نووسیوە...»، دەمەوێ راست بکەمەوە. کاژیکنامە بەرهەمێکی نێو کۆیی یە، کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و دەمە تەقەی دەستەیەک رۆشنبیرەوە هاتووەتە کایە. راستە کاژیکنامە بەشی جەماڵ نەبەزیشی تێدایە، بەلام کارێکی کەلەمپەری یە.

دوا وشەم لەم بوارە دا ئەوەیە، ئەم « بیرەوەرینامە» یەی کەریمی حیسامی سەرەڕای هەموو کەمو کورتی و ناتەواوی یەکی، خزمەتێکی مەزنە بە مێژووی نەتەوەی کورد و رۆژ هەلاتی ناڤین. دەستی خۆش بێ و چاوی رۆن بێ و تەمەنی درێژ بێ. بەرلین ٢٢/٢/٢٠٠٠ جەمال نەبەز

هەر تک بەشی نووسینەکەی دوکتور جەمال نەبەز لێرەدا تەواو دەبن. هەر چەند بە بۆچوونی من مامۆستا جەمال هێندێ بۆ چوون ونەقورچی تایبەتی خۆی خستوونەتە نێو نووسینەکەی کە پێوەندیکی ئەوتۆیان بە هەڵسەنگاندن و یا رەخنەی بیرەوەرییەکانی منەوە نیە، بەلام سەبارەت بە رێز و سوپاسم بۆ زەحمەتەکانی مامۆستا جەمال نەبەز، وا دەقی نووسسینەکەی بلاو دەکەمەوە و هەر وەک خۆشی داوای کرد بوو دیسکی داتاو وێنەیەکی نووسینەکەشی بۆ دەنێرمەوە.

**، هەڵسەنگاندنێک، لە بیرەوەرییەکانم، لە نووسینی مامۆستا کەریمی حسامی**

**جەلال دەباغ**

لە سەر وبەندی دەستپێکی نووسینەوەی ئەم بەرگەی بیرەوەرییەکانمدا، برای بەرێز ماموستا جەلال دەباغ-یش زەحمەتی کێشاوە و پاش خوێندنەوەی سەر جەمی بیرەوەرییەکانم بۆ چوون و بیرو رای خۆی بە رەخنەی دۆستانەوە هێناوەتە سەر کاغەز و بۆی ناردووم. لە گەڵ سوپاس بۆ سەرنج و بۆ چوون و زەحمەتەکانی کاک جەلال کە بە قەولی دوکتۆر جەمال نەبەز نەیویستوە « بە پسکە پسک و پاشملە» بیرەوەرییەکانم بە هیچ دابنێ و باسیان بکا، دەقی نووسراوەکەی خۆی بۆ ناردووم . منیش وا لێرەدا لە گەڵ هێندێ» وردە پەراوێز و روونکردنەوەی خۆم سەبارەت بە هێندێ بۆچوونی مامۆستا جەلال دەباغ کە بە دانانی ژمارەی لاتینی لە ئاخری نووسراوەکەی مامۆستا جەلال دەباغ دا، دیاری کراون بە سوپاسەوە دەقی نووسینەکەی وەک خۆی بلاو دەکەمەوە:

« نووسەری ناسراوی کورد و برادەری بە رێزم کەریمی حسامی لە سالانی ٨٤ تا ١٩٩٦ دە بەرگی بیرەوەرییەکانی بە سەر دێری( لە بیرەوەرییەکانم) چاپ و بلاو کردەوە و دڵ و دەروونی خوێنەری کوردی پێ روون کردەوە. ئەم بیرەوەرییانەی نووسەر لە سەر دەمی منداڵییەوە تا ساڵەکانی کۆتایی ٩٠ دەگرێتەوە.

لە راستیدا( لەبیرەوەرییەکانم ) بۆ یەکەمین جارە نووسەرێکی کورد لە دەبەرگی قەشەنگدا کتێبخانەی کوردی پێدەرازێنێتەوە. گەلێک بابەتی بە نرخ و، داب و نەریتی کۆمەلایەتیی کوردەواری و گەلێک بەسەرهات و قسەی خۆش، بە زمانێکی کوردیی رەسەن و راست و رەوان و پڕ لە پەندی بە نرخ و بە سەر هاتی سیاسی و کۆمەلایەتی و رووداوی جۆر بە جۆر و بەڵگەنامەی گرانبەها، دڵ و دەروونی خوێنەران دەگەشێنێتەوە و مێشکیان زاخاو دەدا..

نرخی بیرەوەرییەکانی پتر لە گشت لە وە دایە کە بە راشکاوی رووداو و

بەسەرهاتەکانی خۆی و دەور و بەری دەگێڕێتەوە و بە زمانێکی ڕەوان، خوێنەران وا لێدەکا کە تێکەڵ بە ڕوو داوەکان بن و وەک خۆیان بەشدار بن وا بۆ خوێندنەوەیان ڕایان بکێشێت.. دیارە ئەمەش ئەوە ناگەیێنێت کە ئەم دە بەرگە بێ کەم وکوڕیین.

جا خوێنەری بەڕێز...! با پێکەوە، داوا لە مامۆستا بکەین، ڕێگەمان بدا گەشتێکی ڕەخنەگرانە، بە ناو ئەم دانراوە بە نرخانەی نووسەردا بکەین و بزانین لە چ دنیا و دەور و بەرێکدا ژیاوە و چۆن بۆ ڕاستی ڕووداوەکان قەڵەمی هێناوەتە زمان و چەند خزمەتێکی گەورەی، لە تێکۆشانی گەل و نەتەوەی بەشخوراوەکەیدا تۆمار کردوە.

بەرگی یەکەمی گەلێک بابەتی بە نرخی گرتۆتە خۆی، داب و نەریت و ڕەسم وعادەتی کۆنی کوردەواری و، پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵی دەرەبەگی-خێڵەکیدا و سەرەتای پەیدا بوونی بۆرژوا و، گەلێک بە سەرهاتی ڕۆژانە کە بۆ لێکۆڵینەوەی بار و دۆخی ئەو سەر دەمەی بەشێکی کوردستان بایەخی خۆیان هەیە. هەروا باس و خواستی سەرەتای ڕێکۆ پێکی سیاسی کورد و باری ئەو سەر دەمەی سەر و بەندی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد.

ژیانی ئەو دەمی لادێ، پەیوەندی کڕین و فرۆشتن، پەیوەندی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵی نیمچە دەرەبەگیدا، ڕەوشت و خوی سەردەم، نە خوێندەواری و نەزانین، هیوا و ئاوات لە دڵی خەڵکیدا. کار و کردەوەی ژاندارم و مەئمور و کار بە دەستان و شێوازەکانی چەوسانەوەی چینایەتی. کار تێکردنی ئایین و ڕۆچوونی بە ناو ڕیزەکانی گەلدا، بە ناو دڵ و دەروونی خەڵکدا لە سەر بناغەی ترس لە دوا ڕۆژ و ئەو دنیا و هێزی نەریت، نەک تێگەیشتن و هۆشمەندی.

توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری لەو سەر و بەندەدا و زوڵم و زۆر داری و بەرتیل خۆری کار بەدەستان و شەرەخۆرانی ڕژێم و هاتو چۆی برینی سنووری دەسکرد و قسەی خۆش و باسی عەشایری ئەو دەمی کورد و ژیانی زەحمەتکێشان، هەمووی ئەو بابەتەن کە لەبیرەوەرییەکانی حیسامیدا بە چێژ و تامێکی تایبەتیەوە باسیان هاتوە.

نووسەر لە بەرگی دووەمی(لە بیرەوەرییەکانم )دا نووسیویەتی :

بیرەوەرییەکانی» کەرەسەیەکن بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ لە ڕوو داوەکانی کوردستان بکۆڵنەوە.» من لە سەری زیاد دەکەم و دەڵێم:» بۆ ئەو کەسانەش کە بیانەوێ لە کۆمەڵی کوردستان بکۆڵنەوە ».

« دەر بە دەری و دووری لە نیشتمان» بە سەر هاتێکە وەک کاک کەریم، سەدان هەزار کەسی ئەم کوردستانە لە سەر دەستی داگیر کەرانی کوردستان تووشی هاتوون، بە دەیان تێکۆشەر و نووسەریش کە ئەو بیرەوەرییانە دەخوێننەوە، وایان بە بیردا دێ وەک باسی خۆیان بێ، هێندە شارەزایانە باسی ڕوو داوەکان دەکا.

کاک کەریم لە گێڕانەوەی قسەی کاک جەلالی بێتوشیدا کە گوتوویە « دەچمە شیمال» نووسیویەتی:» دیار بوو جەلال شیوعی بوو، واتێگەیشتبوو گەربڵێ کوردستان زمانی لاڵ دەبێ»! ئەمە وانیە وئەو بۆ چوونەی ناو براو هیچ پێوەندی بە شیوعییەتەوە نییە، خۆ حیزبی شیوعی عیراق ئەو دەم ڕێکخراوەکانی لە باکوری عیراق ناوی ( لقی کوردستان )بوو. هەروا هەرێمی کوردستان لە ڕاستیدا گەلێک لە« شیمالی عیراق» فراوانتر و زۆر شوێنی ناوەندیش دەگرێتەوە. بە دەیان و سەدان شیوعی نمونەش هەن کە نووسەر و شاعیر و ڕۆژنامە نووس و مامۆستا بوون و لە بەرهەمەکانیاندا ( کوردستان) بە چاکی ڕەنگی داوەتەوە. ڕەنگە بۆ نمونەی ڕاستی ئەم قسەیەش تەنیا گۆرانی شاعیر بەسبێ. لە بەڵگەنامەکانی حیزبدا هەر لە سالانی ٩٤٥ موە و زووتریش وشەی کوردستان بە کار هاتوە. کە وابوو ئەو پلارەی کاک کەریم لە جێی خۆیدا نییە و هەڵوێستەکەی کاک جەلال بێتووشی کە گوتوویە« دەچمە شیمال» لە شیوعییەتەوە هەڵنە قولاوە.» (١)

نووسەر دەڵێ « کاک حەسەنی قزڵجی وکاک عەلی گەلاوێژ لە بەشی کوردی ڕادیۆی پەیکی ئێران کاریان دەکرد، هیچ شتێکیان لە سەر کورد و مەسەلەی کورد بڵاو نەدەکردەوە.» ڕاستیەکی بەو جۆرە نیە. پێش هاتنی نووسەریش بۆ پەیکی ئێران زۆر شت لەسەر کورد و مەسەلەی کورد بڵاو دەکرایەوە. بەڵام لە ئاستی پێویست دا نەبوو منیش کە ئەو کات نووسەر و وتاربێژی بەشی کوردی( دەنگی گەلی عیراق) بووم و لە گەڵ مامۆستا حەسەنی قزڵجی برادەری نیزیک بووین و بە گوێگرتن لە پەیکی ئێران و بە دیتنی بەرنامەکانی ڕۆژانە کە ئاڵو

گۆڕمـــان دەكـرد، دەزانم كــە زۆر شت لە ســەر كـورد و مــەســەلەی كـورد بڵاو دەكرایەوە. (11)

كاك كەریم نووسیویەتی:« نامەكانی د. رەحیمی قازی و عەلی گەلاوێژ گەلێک زۆرن» دیارە بڵاو كـردنەوەی هەمـوویان لە تـوانادا نەبوە و جێگاشـیـان لە وێدا نەبوە و لە ڕاستێدا بیرەوەرییەكانی نووسەر بە بڵاو كردنەوەی زۆر نامەی دوور و درێژ لاسـەنگكراون، بۆیە پێشنیـار دەكـەم نووسـەر گـرنگترین بابەتەكـانی سیاسی و فیكری نامەكانی د. رەحیمی قازی وعەلی گەلاوێژ كە دەڵێ یەكجار زۆرن، لە گەڵ هێندێ نـامـەی تری گونجاو لە بەرگێكی تایبەتیدا بڵاو بكاتەوە. لێرەدا دەمەوێ لە نووسـەر بپرسم: ئاخۆ نەدەكرا تۆزێک دۆستـانە تر باسی د. رەحـیمی قـازی و عـەلی گـەلاوێژ بكرابە؟ یان نەدەكـرا بە هەمـوویان دەورێكی كاریگەرتر و بەرنامە ڕێژترلە ناو حـیزبی تودەدا بگێڕن كە لە بواری سیاسـەتیدا سەبارەت بە مەسەلەی كورد و گەلی كوردستان زۆرتر بهاتایە پێش؟

هەر لە بـەرگی دووەمی ( لە بیـرەوەرییـەكـان)دا لە بـاسی دوكـتـۆر قـاسـملودا هێندێ شت باسكراون خـــۆمـــەڵاس دانیـــان لە دژی پێـــوە دیارە. لە وێدا نووسـراوە:« پاش ئەوەی دەگـەڕێتـەوە تاران سـاڵی ۹٥٥ لە تاران دەگـیـرێ، » پاش چەند ڕۆژ مـــانەوە لە زیندان مـــەعلوم نەبوو چۆن ئازاد دەكــرێ! هـەروا نووسراوە:« لە گـەڵ شـەریـعـەتی و ئیسحـاقی و بلوریان و یوسـفی بڕیار دەدەن هەموو پەیوەندییەک لە گەڵ حیزبی تـودە ببچڕێنن و وەک تەشكیلاتی سـەر بەخۆ كار بكەن. قـاسـملو ئەوەی بۆیە سـاز كردبوو كە بە نێوی حـیـزبی دێمـوكـرات بتوانێ لە ئێران وەدەر كەوێ» دەنا هـەر وەک ئـەندامی حیزبی تودە مابوو. هەروا نووسـراوە: « قـاسملو لە جیـاتی ئەوەی لەگەڵ ئێمـەدا بژی، لە گـەڵ خسـرەو و نیـژاد و هـەمزە عـەبدوڵلا ڕایدەبوارد» هەر لەوێدا نووسـراوە « ئەحـمـەد توفیق دەیگوت رەحـمـان بە حـیـزبی نازانم...» هـتـد بە ڕاسـتـی ئەم نووسـینانە دژی د. قـاسـملو تا ڕادەیەک بێ پێزن. چونكە: مـەعلوم نەبوونی چۆنیـەتی ئازاد كـردنی قاسملو لە ساڵی ۱۹٥٥دا لای نووسـەر شـتێک لە مـەسـەلەكە ناگۆڕێ و لێرەدا ئەمە دێتە كایەوە كە ئایا بۆ چی لە خۆی ئەو پرسیـارە نەكراوە و ئایا ڕابردووی دوای ئەوەی قـاسـملوو بەس نیـە بۆ سـەلماندنی پاكیی ئەو تێكۆشـەرە.؟ ئایا دەر كـەوتنی قاسـملو بە ناوی حـیـزبی دێمـوكـرات لە ئێران و چوونە دەرەوەی لە وڵات

تاوانە ؟ ئایا وەک تودەیی چوونە دەر لە ئێران ئاسانتر نەبوو؟ ئەی بۆناوەکانیتر ( شەریعەتی و ئیسحاقی و بلوریان و یوسفی) کە پێکەوە تەشکیلاتی سەر بەخۆیان دامەزراندوە دەبێ چی بگوترێ؟ لە کاتێکدا لەو سەر و بەندەدا خۆیان لە قاسملو بە کەمتر نەزانیوە. هیچ مەرج نەبوە قاسملو لە گەڵ برادەرەکانی بژی. کە لە گەڵ کەسانی بە رێزی وەک خسرەو ونیژاد و هەمزە عەبدوللا ژیاوە دەبێ کەمایەتی چی تێدا بێ و باسی کام « ڕابواردن دەکرێ؟! ئەحمەد توفیق کە گوتویە رەحمان بە حیزبی نازانم، ئەوە هێندەی تۆزێک لە شان و شکۆی قاسملو کەم ناکاتەوە.؟( 111)

لە بەرگی سێیەمدا هەندێ رەخنە لە سەرکردایەتی حیزبی تودە گیراوە، تێبینیەکی وا دەداتە خوێنەر کە ئەم حیزبە گوایە ڕوو بەڕووی کورد وەمە سەلەی کورد بۆتەوە و ڕاستە و خۆش وانووسراوە. بەڵام باسەکە یەک لایەنەیە. بە تاقە بەڵگەیەک سیاسەتی حیزبەکە خۆی نەخراوەتە بەر چاو کە دەیان وتار لە سەر مەسەلەی کورد نووسیوە و بۆپشتگیری کورد چالاکیان پێشان داوە و کردنەوەی بەشی کوردی ڕادیۆی پەیکی ئێران لەو ڕۆژگارەدا و دانانی رۆژنامەی ( کوردستان) وپشتگیری خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی عیراق، سێ نموونەی بەر چاو ترن لە ناو گەلێک هەڵوێستی تردا کە دەبوو سەرە ڕای هەڵە و ناتەواویەکان، نەخرێنە پشت گوێ. تاقە وشەیەک لە نامە و بەیاننامە و دۆکومێنتەکانی ئەو حیزبە سەبارەت بە مەسەلەی کورد، بۆ نموونە لە کۆڕ و کۆبوونەوە جیهانیەکاندا، نەخراوەتە ڕوو.

ڕاستە نووسەر بیرەوەری خۆی نووسیوە، بەڵام لەو باوەڕە دام کە دەبوو هێندێ پتر بایەخ بە ژیان و تێکۆشانی ئەدیبی گەورە ورۆڵەی ئازا و دڵسۆزی حیزب و گەڵ مامۆستا حەسەنی قزلجی بدرێت کە قارەمانانە شەهید کرا. مایەی شانازیمانە کە بۆ یەکەمینجار ئێمە دوای مەرگی ئەو شەهیدە قارەمانە، بە یارمەتی کاک حەسەنی ماوەرانی لە رۆژنامەکانی خۆماندا( چاپەمەنیەکانی ح.ش.ع) شەهید بوونیمان لە ژێر ئازار دا ڕاگەیاند و بە جوانترین وشە ماڵئاوایی و کۆچی دواییمان ڕاگەیاند. نووسەری بە ڕێز ئاگادارە کە هێندێک شارەزای ئەو قۆناغەی خەبات و ژیانی مامۆستا قزلجی هەم، بۆیە لەو باوەڕە دام کە دەبوو زووتر باسی لێوە بکردایە و بیرەوەریە زۆرەکانی لە گەڵ ئەو پیاوە

دڵسۆزە بخستایە سەر لاپەڕەکانی (لە بیرەوەرییەکانم)(١٧ )
لە نامەی سولەیمانی موعینی دا کە نووسیویە:« تۆ پێویست بوو پێوەندیت لە گەڵ من بە هێزی برایانی فەرعی عیراق گرتبا» ڕاستیەکەی لقی کوردستانە و ڕەنگە بۆ ڕێگە ونی وانووسرابێ. کە ناوی سولەیمانی موعینی شەهید( فایق) هاتە پێشەوە و نووسەر دەڵێ ماوەیەکی زۆر لە گەڵ سیراجی لە سلێمانی ماونەتەوە، بەڵام باسی نە کردوە لە کوێ بوون و کێ یارمەتی داون کە بێگومان ئاگاداریشە... باشە منیش ئەو شایەتیە بدەم- کە ئەو دەم سکرتێری ناو خۆی سلێمانی بووم- لە نیزیکەوە ئاگادارم کە (موعینی و سیراجی) میوانی حیزبی شیوعی بوون، نەک لایەنیکیتر. لە ماڵێکەوە لە نیزیک گەڕەکی برایم پاشا کە شوێنیان باش نە بوو گواستمنەوە بۆ ماڵێک لە گەڕەکی کانێسکان. کاتێکیش زانیمان پەیوەندیان لە گەڵ قادر تەکەرانی گرتوە، پێمانگوتن« ئەو پیاوە سەرێکی هەیە و هەزار سەودا...هتد» و حیزبی ئێمە دەتوانێ زۆربەی داواکانیان جێبەجێ بکات، لە جل و بەرگی پێشمەرگە و جامانە وپێڵاو و شتیوا، هەر وا پەیوەندیمان بە قاچاخچیەکی دۆستەوە گرت کە چەند هەزار فیشەکیان پێویستبوو بۆیان پەیدا بکات، بەڵام لە کاتێکدا من سەفەرێکی بەغدام کرد وگەڕامەوە، تەماشام کرد کاک سولەیمانی شەهید بە هاریکاری «قالە تەکەرانی» دەر چوە وئەوەی بەسەر هات کە ڕوویدا، لە کاتێکدا پێیان وترا بوو کە ئێمە بە هاوکاریی شێخ لەتیفی حفید و پێشمەرگەی خۆمان بۆ هەر خاڵێکی سنوور بخوازن بە ڕێیان دەکەین. پاشان لە هەواڵی شەهید بوونی سولەیمانی موعینی ، کاک کەریم وپەیکی ئێرانمان ئاگادار کرد. ( بڕوانە نامەی جوامێر لە رۆژی ١٩٦٨/٥/٢٩دا: ل ١١٠-١١١ی بەرگی سێیەم (لە بیرەوەرییەکانم)

نامەیەکی کاک ئیدریس بارزانی کە بەناوی باوکیەوە بۆ کاک فایقی نووسیبوو، دوای شەهید بوونی کاک فایق لە ناو بەڵگەنامەکانیدا کەوتە لای ئێمە کە گەیاندمانەوە کاک کە کەریم. بەڵام لە بیرەوەرییەکانیدا ئەو نامە دیار نیە.

لە نامەی سیراجی و لە باسی ئامادەیی هێزەکانی شۆڕشی کورد بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر بۆ چوونە ئێران بۆ لێدانی پێشمەرگەی حیزبی

دێموکراتی کوردستان- ئێران گوتراوە:« نزیکەی ٢٠٠ کەس کە لە سنوورەکاندا مۆڵیان خواردوە و چاوە ڕوانی ئەمری سەرۆکن بۆ لە سەر ڕاخۆ دەنێران کوتانەوە.: دەستەی ملازم ئەحمەد...هتد»

لە ڕاستیدا مەبەست ملازم ئەحمەدی جبووری یە کە بەر پرسی پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی بوو لە سەرچاوەی لای ڕانیە و بۆ کارێکی ئاوها ئامادە نە بوە و لە لایەن بارزانی ئەمرەوە تەکلیفیش نەکراوە. بۆ روونکردنەوەی ڕاستی لە ڕۆژی ٥/ ئەیلولی ٩٧دا قسەمان لە گەڵ هاوڕێی بەرێز ملازم ئەحمەد جبوری کرد، لەو بارەیە گوتی :« هێزی پێشمەرگەکانی حیزبمان لە سەرو چاوە سەر بە بەتالیۆنی بیتواتە بوو کە حەسۆ میرخان فەرماندەی بوو. ئێمە ئاگادار کراین کە لە سەر فەرمانی شۆڕش دەبێ مەفرەزەیەک بۆ ناوچەی پشدەر بنێرین.. بێ ئەوەی کەس پێمان بڵێ بۆچییە.. خۆمان وامان دانا بوو کە بۆ سەر ئاغاکانە.. مەفرەزەیەکی ئێمەش کە خۆم لە گەڵیاندا بووم لە گەڵ چەند مەفرەزەی شۆڕش گەیشتینە ناوچە کە و ماوەی٥-٦ ڕۆژ لە وێ ماینەوە و پاشان گەڕاینەوە ناوچەی خۆمان. نە شەڕ ڕووی داوە و نە کەسمان زانیومانە گوایە بۆ سەر پێشمەرگەی حیزبی دێموکرات بوو بێت.. سیاسەتی حشع لەو بوارەدا ڕوون بووە وسیراجی بۆ خۆشی دەزانێ ئێمە چەند هاریکاری حیزبی دێموکراتمان کردوەە. (٧)

لە نامەیەکدا ناوی کاکە شوان هاتوە کە دیارە مەبەست لە حیزبی شیوعی عیراقە، بەلام ئەوە روون نەکراوەتەوە»

نووسەر بیر وڕای خۆی تا ڕادەیەک بە درێژی باسکردوە. بەلام بیر و ڕای تودە و د. ڕاد مەنش یان هەر دەر نە بڕیوە یان خۆد سەری بڕیون. هەر بڕیارێک درا بێ دوایی بۆ جێبەجێ کردنی وای نیشان داوە کە لە لایەن تەرەفی تودەوە هیچ نەکراوە! بەلام ئەو هەل و مەرجەش بە تەواوی ڕوون نەکراوەتەوە کە ڕەوشی مەسەلە و بە سەر هاتەکان چۆن بوە و لە لایەن حیزبی دێموکراتەوە کارەکە چۆن ڕۆیشتوە، ئەوەشی روونکراوەتەوە بەسە بۆ ئەوەی جۆرە پاکانە کردنێک بێ بۆ سیاسەتی حیزبی تودە. نووسەر دوای دیدەنی د. ڕاد مەنش و سەر دانی لە بارزانی مستەفا نووسیویە: د. ڕاد مەنش لە گەڕانەوەدا بێجگە لە وە کە لە چاو پێکەوتنی مەلا مستەفا ڕازی و دڵخۆش بوو، دەتگوت جەبهەی شەڕی

شکاندوە..هتد» ئەمەش نوقورچێکە نووسەر لە دوکتور راد مەنشی سکرتێری گشتی کومیتەی ناوەندی حیزبی تودەی گرتوە. لە پاداشی ئەوەدا کە وەک بایەخدانێک بە مەسەلەی کورد و شۆرشەکەی هاتۆتە سەردانی بارزانی. لە کاتێکدا نووسەر دەڵێ کە بارزانی داوای سەردانی لە خۆی کردوە نە چوە و گەڕاومەتەوە بۆ سۆفیا.

لە باسی هاتو چۆکانیدا، بە پەیوەندی لە گەڵ حیزبی تودەی ئێران وادەردەکەوێ کە هێندێجار پۆتیان شکاندوە، سەر بە خۆ بە بێ ئاگاداریی و بڕیاری سەر کردایەتی حیزب بەم لاو بەولادا هاتوو چۆیان کردوە کە ئەمەش لە گەڵ ڕێو وشوێن و نەریتی حیزبایەتی و پەیڕەوی ناو خۆی ئەو کاتەی حیزبدا یەک ناگرێتەوە. نووسەر لە زۆر هەڵس و کەوت و چالاکیدا وای پیشانداوە کە ئەندامی حیزبی تودەیە. بەڵام کە بڕیارێکی ئەوانی بە دڵ نەبوە بێ، ئیتر خۆی بە ئەندامی ئەوان نەزانیوە. وەک تودەییەک لە مەدرەسەی حیزب لە چێکوسلۆڤاکیا خوێندوویەتی و لە ڕادیۆکەشیان کارمەندێکی چالاک بوە، بەڵام ئەوەتا کاتێ ڕێبەرایەتی حیزب پێیان ڕاگەیاندوە نەچێتەوە بەغدا دەڵێ: من ئەندامی حیزبی تودە نیم!!

نووسەر لە سەر پشتگیری و میوانداری و هاوکاری کوردانی کوردستانی عیراق شتێکی وای نە نووسیوە. بەڵام لە بەرگی چوارەمدا دانی پێدا ناوە کە دەڵێ:« ئەگەر خۆم لە قەرەی ئەو باسە دابایە، دەبوایە بەرگێکی تەواوی بۆ تەرخان بکەم» خۆ کە هەر نەبێ باشتر دەبوو چەند لاپەڕەیەکی لە سەر بنووسیایە. (٧١)

بارێکی سەرنجی گرنگ ئەوەیە کە بیرەوەرییەکان، بە بڵاو کردنەوەی بەڵگەنامەکان، هێندێکیان دوو جار، واتە بەچاپ لە ناو بەرگ و بە دەقەکەی خۆیان لە پاشکۆدا- لاسەنگکراون. یان چ پێویستە وتاری دەستەی نوێنەرایەتی حدکا بۆ کۆنگرەی هەشتەمی پدک کە هەر بەشداریش نە بوون بڵاو بکرێتەوە؟ گەلێک کار و باری تەشکیلاتی کە نووسەر مەسئولی تەشکیلاتی حدکا بوە، لە بیرەوەرییەکانیدا باسکراون کە ئەمانە نهێنی حیزبین و نە دەبوو ئاوا بە ناو بردن و بە درێژی باسیان بکرێت. ئەمە لە گەڵ کاری نهێنی حیزبی ناگونجێ و دوای دەرچوونی نووسەریش حیزبی دیموکرات هەر نهێنییە.

لە دوو تویی بیرەوەرییەکانیدا، نووسەر جار و بارلە رەخنەی تێپەڕاندوە و گەیشتۆتە رادەیەکی زیاتر دەر هەق بە د. قاسملو و سیراجی و حەسەنزادە و ئەوانیتر، بەلام بە گشتی بیر و ڕاو ڕێبازی خۆی ڕاست پێشانداوە کە هەڵەی تێدا نەبوە. (v11)

زۆر جار نووسەر بە چەشنێکی رەخنە گرانەی سەخت بیر و ڕای ئەم یا ئەو هاوڕێی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی بە هەڵە نیشانداوە. بۆ ئەوەی کرۆکی ڕای ئەوان و هۆیەکەی ڕوونکردبێتەوە. بۆ نموونە بڕیاری کومیتەی ناوەندی کە هەندێ لە هاوڕێیان بگەڕێنەوە بۆ کوردستانی ئێران، بەلام « کاک حەمەدەمینی سیراجی بە تەنیا دژی ئەو بڕیارە بوە» بێ ئەوەی تاقە ڕستەیەک لە درێژی بیر وڕایەکەی بنووسێت کە بۆ چی و لە بەر چی و چۆن دژی ئەو بڕیارە بووە. لەو شوێنەشدا کە بیر وڕایەکەی سیراجی نووسراوە، وادەر دەکەوێ کە دژی گەڕانەوە نەبووە و بەس، بەڵکوو چۆنیەتی گەڕانەوەی دیاری کردوە.(v111

نووسەر هێندێ وشەی بە کار هێناوە کە زۆر سەختە وشەی لەو جۆرە بەرانبەر هاوڕێیان و ئەندامانی سەرکردایەتی بە کار بهێندرێ، وەک وشەی سەر سەری و شتی وا کە لەگەڵ شوێن و مەقامدا ناگونجێن. نووسەر لە کاتێکدا سزای حیزب دراوە، بۆ چاری کێشەکان پێشنیاری کردوە« لە ماوەی حەوتوێکدا کۆنفرانسێک لە کادر و ئەندامانی حیزبی ببەسترێ و چاری ئەم وەزعە بکا»!! کام حیزبە دەتوانێ ئەو پێشنیارە بێنێتە دی؟ دوای حەوتویەک ئینجا پێشنیاری کۆنفرانسی تازەی کردۆتەوە بە بێ دیاریکردنی ماوەیەک. لەو باوڕەدام زۆربەی تێبینییەکانی مینە ١٩٨٩/٥/١ لە جێی خۆیدان و دوور نیە هەر کەسێک لە ڕابەران و هاوڕێیانی حیزب بتوانن کۆمەڵێک سەرنج و تێبینی و ڕەخنە بخەنە سەر بیرەوەرییەکان. تێبینیەکانی نووسەر لە سەر نووسینەکەی مینە تا ڕادەیەک کورتیان هێناوە و دیسان سەرنجەکانی پەسند نەکردوون! ڕاستە نووسەر بیرەوەری خۆی دەنووسێ بەلام دەبێ پەراوێزێکیش بۆ ئەو باسانە بهێڵێتەوە کە خۆی یەک لایەنە ناگادارییانە و کەسانیتریش هەن لە هەندێ لایەنیتر ئاگادارن. ڕوونکردنەوەکانی کاک حەمەدەمین زۆر پێویستن بۆ دەرخستنی ڕاستی. بەلام نووسەر نزیک بە تەواویانی داوەتەوە دواوە کە دەڵێ « یارمەتی نەغد وباش» مانای یارمەتیەکی زۆرە لە لایەن ڕاد مەنشەوە دراوە بە

مینە.. ئیتر بۆ چی نووسەر دەڵێ:« خۆ من باسی زۆر و کەمی یارمەتیم نەکردوە؟!

نووسەر ڕەخنەیەکی قورسی لە صلاح بدرالدین گرتوە، لە بەر ئەوەی لە ترسی تەقە و ڕەقەی ئەو کاتی بیروت لە گەڵی نە چووە بۆ باڵوێزخانە تا ڤیزایەک وەر بگرێت. لە کاتێکدا ئەمە بەڵگەی ترس نیە بەڵکوو خۆ پاراستنە، کەی ڕاستە سکرتێری ڕێکخراوێک لەو ڕۆژگارەی بێروت دا ژیانی خۆی بخاتە مەترسیی و دوای نووسەر بکەوێت بۆ ناو گوللە باران بۆ وەر گرتنی ڤیزا؟

نووسەر لە پێش باردا دەنووسێ:« بەڵام ئێستاش هێندێ کەسی خوێندەواری کورد لای وایە نووسەری بیرەوەری نابێ باسی خۆی بکا و سەر بردە وشێوە بۆ چوون وچەند و چونی بەشداری خۆی بنووسێتەوە. گوایە ئەوە ( خۆ هەڵکێشان و یا بە زەق نیشاندانی دەوری خۆیەتی). لێرەدا نووسەر لە خۆڕا بیر و ڕای « هەندێ خوێندەواری کورد» دەر دەبڕێ، بێ ئەوەی بزانین ئەو خوێندەوارانە کێن و لە کوێدا وایان نیشانداوە کە « نوسەری بیرەوەری نابێ باسی خۆی بکا و سەر بردە و شێوە بۆ چوون و چەند و چۆنی بەشداری خۆی بنووسێتەوە» نووسەر دەتوانێ ئەوەش بنووسێ و تا ڕادەیەکیش دوور بێ لە «خۆ هەڵکێشان و یا بە زەق نیشاندانی دەوری خۆی» نووسەر لە زۆر شوێندا دەڵێ : بۆ ئەو مەبەستە:« بەڵگەم بە دەستەوە هەن و لە وڵات پارێزراون» ئاخۆ نە دەکرا ئەو بەڵگانە دەستکەونەوە؟ خۆ مادام بەڵگەکان لە شوێنێک شاردراونەوە و لە بەر دەست نین نابنە بەڵگە . نووسەر ئەگەر چی شارەزاییەکی چاکی لە زمانی کوردی و پەندی پێشیناندا هەیە، بەڵام نووسیویەتی دەڵێ : « کتێبخانەش بە نان و ئاو دا چوو» ڕاستی ئەمەیە کورد دەڵێ :« بەنان هات و بەئاودا چوو) ڕەنگە لە سولەیمانی وابڵێن.!!

لە شوێنێکی تردا دەڵێ :« چونکە بۆ حیزبی دیمۆکرات فیداکاری و خزمەت بە گەل و نیشتمان ئەوەندە جێگای بایەخدان نەبوو، ماستاو سارد کردنەوە و ڕیایی و مەرایی و دووزمانی برەوی پتر بوو...» جێگەی داخە ئەو هەڵسەنگاندنە دەر هەق بە حیزبی دیمۆکرات بگوترێ. حیزبی دیمۆکرات وەک هەر حیزبێکی تر گیر و گرفت و کۆسپ و تەگەرەی خۆی هەبوە و هەیە. بەڵام ڕاست نیە ئەمە بکاتە ڕاستی ئەو هەڵسەنگاندنەی یەکێک لە ڕابەرانی کە وا وێدەچێ لە کۆشەی

ئازار چەشتنی خودی تاقە کەسی خۆی یا زیاترەوە گەیشتۆتە ئەو هەڵسەنگاندنە.» (1x)

« .. نووسەر زیاتر لە وەی کە پێویست بێ، بەرگی هەشتەمی بیرەوەرییەکانی بە کار وباری تێکۆشانی تایبەتی و دەرکردنی لە حیزبەوە گرتوە... دیارە کورد واتەنی « کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە» هەر لەو بەشەدا دەڵێ:« ئەم سیستەمە لە نێو حیزبی دێموکراتیشدا دەگەڕێتەوە بۆ سیستمی ڕێبەرایەتی ستالینی کە وا ئێستا گەندی دەر هاتوە و بە هەق دنیا زاری لێکردۆتەوە...» لە مەش هەر مەبەستی ئەوەیە« ڕێبەرایەتی ستالینی» ناو بەرێ و ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی پێ بکوتێ! لە کاتێکدا ستالین گوتەنی:« زەمەن زامنە بۆ ئەوەی هەموو ئەو پۆخڵەواتانە ڕامالێ کە دوای مردنی دا هاوێژرێنە سەر گۆڕەکەی» یان هەولی بەدناو کردنی دەدرێ.

هەر وا نووسەر دەڵێ :« چونکە قەوارەی حیزبەکە تەنانەت دوای سەپاندنی ناوی سۆسیال دێموکراتیش هەر « سانترالیزمی دێموکراتیە» واتە ئەو یاسایەی کە دێموکراسی پێ سەر کوت دەکرێ. ئەمە لە لایەن ڕێبەرایەتیەوە، بەڵام لە لایەن ئەندامانی دڵسۆزەوە، پاراستنی یەکێتی بوە لە سەر حسابی پێشێلکردنی دێموکراسی»

لێرەدا چەند بابەتێک جێگای سەرنجە:

یەکەم: جا ئەگەر وابێ حیزبی دێموکرات« سانترالیزمی دێموکراتی» پەیڕەو کرد بێ، چۆن ئەو پەشێویەی توش دەهات کە نووسەر لە بیرەوەرییەکانیدا باسیان لێوە دەکات.

دووەوم : بە پێی لێتێگەیشتنی ئەو باوەڕە چۆن حیزب دەکرێ بە سێ بەشەوە:

ڕێبەرایەتی و ئەندامانی دڵسۆز و، دیارە نا دڵسۆزیش، کێ ئەوە بڕیار دەدا ؟

سێیەم: بۆ چی بە سانترالیزمی دێموکراتی ئەگەر ڕاست وەک خۆی پەیڕەو بکرێت، دێموکراسی سەر کوت دەکرێت؟ پاشان کەی ئەوە یاسایە؟!

چوارەم: بۆ چی دەبێ « پاراستنی یەکێتی» کە کارێکی باش و پەسندە. لە سەر حیسابی « پێشێلکردنی دێموکراسی» بێ؟

ئینجا لەم بەرگەدا نیشانە بە نووسراوی ( ئیگۆر کلیامکین) ناوێک کە گوایە

کەمایەتی لە حیزبی شیوعی سۆڤێت دا سەر کوتکراوە و دیکتاتۆری پرۆلتاریا بە « دیکتاتۆری ستالین» ناو براوە و گوایە« ئەسڵی دیموکراسی لە ژێر ئەسڵی یەکێتی دا پێشێلکراوە» بێئەوەی سەرچاوەی وتارەکە بنووسێت.(X)

. با لێرەدا با بدەینەوە سەر باسی قاسملوی شەهید کە نووسەر چەندان جار ناوی هێناوە. قاسملو کەسێکە وێڕای هەموو کەم و کورتی و ناتەواویەک، شەهید کراو، ژیانی خۆی لە پێناو مەسەلەی ڕەوای گەلی کورددا بەخشی. وێڕای ئەوەی زانا بوو، خۆ ئەگەر تەنیا وەک نووسەر تەماشای بکەین، جگە لەوەی کە ڕابەریشە بۆ ئەوە نابێ وا بە توندی هێرشی ببرێتە سەر کە هەندێجار لە سنووری ڕەخنەی دەر کردوە و گەیشتۆتە ئاستی هێرش و تاوانبار کردن. باسی چەندان ئەندامی حیزبی کردوە کە قاسملو کرد بوونیە ئەندام، وەک بەو کارە هەڵە یان تاوانێکی کردبێ. ئاخۆ نەدەکرا لە کات و شوێنی خۆیدا، ئەگەر بەپێی پەیڕەوی ناو خۆی حیزب وانەبێ ئەو بوارەی نەدرێ وبە ڕێگەی ڕاست ئەندامان وەر بگیرێن. وێڕای ئەوە چەند جار وشەی« قاسملو و نۆکەرەکانی» نووسراوە. ئاخۆ ئەمە زیادە ڕەوی نیە؟ یان ئەوەی دەڵێ: « بۆم دەر کەوت قاسملو خائینە» بێ ئەوەی مەلا رەسوڵ کە ئەوەی نووسیوە ئەو خەیانەتەی قاسملو بسەلمێنێ. _

بەڵام لێرەدا سەرنج دەدرێ کە مەلا رەسوڵ دوو مەبەستی بەرەو ڕووی برای نووسەری بیرەوەرییەکان کردۆتەوە. لە لایەکەوە پێی دەڵێ« دەبنەوەڕا ئاگام لێت بوو هێندێک وردە نەزمت هەبوون» ئینجا دانی پێدا ناوە کە « کێشەی من و تۆش: مەبەست خۆی وکەریمی حسامی یە- زۆر کەمی لەسەر شتی سیاسی بوو»

لە بەرگی نۆیەمدا باسی ئەوەی کردوە کە ڕۆژی ١٠/٧/ دایکی سەلیم (خێزانی کاک کەریم ئەحمەد بەبۆنەی سەر ساڵی شەهید بوونی سەلیمی کوری داوەتێکی گەورەی ساز کردبوو) لێرەدا پێویستە بگوترێ: هاوڕێ کەریم کوڕی نیە بە ناوی سەلیم بەڵکو لە سەر نەزمی عەرەبی کەریم بە ( ئەبو سەلیم) ناو دەبرێ. یان بە ناوی کوڕی گەورە. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە کوڕی دووهەمی هاوڕێ کەریم کە ناوی بۆتان بوو شەهید کرا.

نووسەر نامەی گەلێک کەسی بڵا کردۆتەوە کە هەمووی پڕ لە هێرشە بۆ سەر

حیزبی دیموکرات و بە هەڵە دەرکردنی سیاسەتەکەی. لە کاتێکدا خودی نووسەر و ئەو کەسانەش دەیانتوانی ڕۆڵێکی گرنگ لە خەباتی نێو خۆیدا بگێڕن، بەڵام زیاتر کاتێک دەنگیان بە هاوار و هێرش بەرز کردۆتەوە کە لە دەرەوەی حیزب دابوون . مامە غەنی زۆر ڕاستی هێناوە کە دەڵێ:« پێویستە ئەوەش بڵێم ئێمەش تاوانبارین لە ناو حیزبدا لە جیاتی یەکتر گرتن و ڕێگای چارە دۆزینەوە، گۆڕە پانی وڵاتمان بۆ ئەوان خالیکرد تاکو تیارەبازی بکەن و بە شێنەیی خۆ تەیار کەن و لە ژێرەوە ڕای خەڵک سەبارەت بە ئێمە بگۆڕن» دیارە ئەم بەرگە زیاتر نامەکانی مامە غەنی گرتۆتەوە.(x1)

نووسەر ڕەخنەی ئەوە لە کاک عەبدوللای حەسەنزادە دەگرێ کە « مەلا عەولای حەیاکی کە بۆتە عبدالله حسن زادە» نازانم ناوبراو لەو دوو ناوییە دا و لە گۆڕینیدا- ئەگەر بوو بێ دەبێ چ تاوانێکی کرد بێ؟ نووسەر وەڵامی نووسینەکەی حەسەن زادە دەداتەوە کە بە سەر دێڕی ( نیو سەدە لە تێکۆشان) نووسیویەتی، دەڵێ:« عەولا حەسەن زادە لە ساڵی ۱۹۵۲ وە دەست پێدەکات گۆیا باسی تێکۆشانی حیزبی دیموکرات دەکا کە ئەو دەم نە ئەندامی حیزب بوە و نە ئاگاداری چۆنیەتی تێکۆشانی حیزب» بەڵام ئەگەر لە ڕایەکەی کاک کەریم ورد بینەوە بۆمان دەر دەکەوێ کە تەنانەت ئەندامەتی حیزب مەرج نیە بۆ نووسینەوەی مێژووی تێکۆشان. لە کاتێکدا بە پێی نووسینەکەی کاک کەریم، عەبدولا لە ساڵی ۱۹۵۳ وە ئەندامە، کەسانی وازۆرن کە مێژووی تێکۆشانی چەند حیزب و بزووتنەوەیان نووسیوە و زۆر چاکیش تێیدا سەر کەوتوون، بێ ئەوەی ئەندامی حیزبەکەش بووبن. ئاخۆ عەبدولای حەسەن زادە مێژووی تێکۆشانی خۆی نووسیوەتەوە تا وەک حسامی دەڵێ ۲۸ ساڵ بکاتە نیو سەدە، یا مێژووی تێکۆشانی نیو سەدەی حیزب.».

لە شوێنێکیتردا لە باسی حەسەن زادەدا دەڵێ:«.. کینە و بوغزی حیقدی مەلایانەی خۆی دەر ببڕێ..» بەش بە حاڵی خۆم ئەمەم زۆر پێ سەیر بوو، چونکە تا ئێستا ئەم بیستوە مەلایان« کینەو بوغز و حیقدی مەلایانە» یان هەبێ!(x11)

هەر لەم بەرگەدا ئەوە بیرەوەری کراوە کە لە ناو پاپۆڕدا، توشی چەند کوردێکی دانیشتووی لوند بوە وهەر لەوێ یەکتریان ناسیوە، ئاخافتنەکەیانی

بڵاو کردۆتەوە، بە جۆرێک وەک ویسکی خواردنەوە و یاریکردنە کەیان بۆ کاتی ناو پاپۆڕ بە سەر بردن تاوانبێ.. سەرنجی ئەوەشی نەداوە کە « لە کاتی خواردنەوەدا قسە گومرگی لە سەر نیە» لە وێدا دەڵێ:« لە دەریای بەڵتیکەوە لە قوماری پۆکەر دا ڕێگای چارەنووسی کوردیان دەستنیشان دەکرد و بیر و ڕاو پێشنیاری جۆر بە جۆریان دەر دەبڕی»!! نووسەر هێشتا داخی ئەوەش دەخوا کە دەڵێ:« نە کرا قسەکانیان یاد داشت بکەم و بۆ سەر گەرمی خوێنەرانی بە ڕێز لێرەدا بڵاویان بکەمەوە»!هتد.. لە ڕاستیدا ئەمە کارێکی نەگونجاوە و لە خانەی تانە و تەشەر بڵاو کردنەوە بەو لاوە ناخرێتە خانەیەکی تر.

نووسەر وتەیەکی مامە غەنی نووسیوە کە لە نامەیەکی وەر گرتوە و دەڵێ:« بەیانی حەقیقەتی تەئریخی بۆ هەمیشە حەشار نادرێ و مرۆ دەبێ بە صداقەت و ڕاشکاوی ڕاستیەکان دەرخات.» لێرەدا دەبێ بە هەڵەی چاپ( صراحەت) بوو بێ بە صداقەت و هەر دەبێ هەڵەی چاپبێ کە هەواڵێکی دڵتەزێن بۆتە« هەڤاڵێکی دڵتەزێن». نووسەر تەنیا لە بەر ئەوەی دوو کورد لە شاری ئارهوس لە دانیمارک ڕەخنەیەکیان لێگرتوە دەڵێ:« جارێکی دیکەش بۆم ڕوون بۆوە کورد با چەند ساڵیش لە ئوروپا بژی، زەحمەت وایە بێتە سەر ڕێ و شوێنە باشەکانی ئوروپا و واز لە کەللە ڕەقی کوردیی بێنێ....» من لای خۆمەوە ئەمە بە هێرشێکی نارەوا دەزانم بۆ سەر کورد و دوو نموونەی تایبەتی نابێ بکرێتە گشتی و حوکمی پێبدرێ و« کەللە ڕەقی» خاسیەتێکە دوژمنەکانمان بە سەریاندا بڕیوین چوونکە هەر دەم بەرەنگاریان بووینەتەوە.

لە لایەکی تریشەوە نووسەر، جگە لە کەللە ڕەقی هەندێ عادەتی سەیری داوەتە پاڵ کورد کە دەڵێ:« پتر لە هەڵە و ڕەخنە و کەم و کوڕی دەگەڕێ و لە نێو هەزار لاپەڕە نووسیندا چاوی تەنیا هەڵەیەک و ناتەواویەک دەبینێ ولە ئاست ٩٩٩لاپەڕەکەی تر چاوی ڕیپۆق دەکا».. « جارێکی دیکەش ڕوون بۆوە کورد با لە ئوروپاش بژی و کار بکا، نابێ واز لە خەسڵەتی بێ قەولی خۆی بهێنێ.» بێگومان ئەو جۆرە بۆچوونەی نووسەر بەرهەمی هەڵچوون وداخ لە دڵیە. ئەگەر نا کەی دەبێ بە چاوی ڕەخنە گیری تەماشا کردن ببێتە شورەیی یان کورد« بە بێ قەولی» ناو ببرێ بە چەندان نموونەی تاک تاکیشمان بە دەستەوە بێ؟

{x111}

نووسەر رەخنەی لە پرۆفیسۆر لازاریف گرتوە کە لە سەر مێزی خواردنەوە، لە گەڵ دوو ژنی رووس و ژنەکەی د.ج. حەیدەری کە ئەویش هەررووسە، باسی« بار و دۆخی ئێستای کورد»ی بۆ نەکردوە کە کەلکی لێ وەر بگرێت! جا ئایا ئەم رەخنەیە لە جێی خۆیدایە؟ نووسەر گەلێک نامەی بڵاو کردۆتەوە. لە کاتێکدا باشتر وابوو لە شوێنی خۆیدا لە باسێکی بیرەوەرییەکاندا کەلک لە نامە وەر بگرێ... لە وتاری سێ مانگ لە شەهید بوونی د، قاسملودا نووسەر هێرشێکی توندی بردۆتە سەر مەلا عەولای حەیاکی کە گوایە« بە درۆ فرمێسکانی بۆ هەڵدەوەرێنێ..؟ داخوا ئەو هێرشە لە جێی خۆیدایە؟

بڵاو کردنەوەی دەقی وتو وێژی چاپەمەنی و گەلێک بەرهەمیتر شوێنی زۆریان لە بیرەوەرییەکان گرتوە. لە کاتێکدا جێگای ئەوان تەواوی بەرهەم و نووسراوەکانی نووسەرە. نووسەر لە وتو وێژەکەیدا لە گەڵ کوردستان پرێس دا باسی « ستراتێژی یەکگرتو» بۆ هەموو کورد و کوردستان دەکا، لە گەڵ هەوڵدان بۆ هێنانە دی مافی چارە نووس وەک درۆشمی رۆژ. راستە ستراتێژیی یەکگرتوو مافی چارەنووس هیوا و ئامانجی بەرز و پیرۆزن. بەڵام ئاخۆ ئەمە بازدان نیە بە سەر هەل و مەرجی کورد و کوردستاندا کە نیشتمانەکەی بە چوار پارچە بە سەر چوار دەوڵەتدا دابەشکراوە و هەر پارچەیە هەل و مەرجی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی..هتد تایبەتی خۆی هەیە؟ ئایا نابێ حیزب و هێزە سیاسییەکانی هەر پارچەیەک بە شێوەیەکی سەرەکی بایەخ بە کار و باری تێکۆشان لە بەشەکەی خۆیاندا بدات و دەست نەخەنە کار و باری ناو خۆی پارچەکەی ترەوە؟..هتد

نووسەر لە باسی کونفرانسی پاریس دا دەنووسێ:« بەڵام واش نییە کە مرۆڤ نە کارێ بە گوێرەی بۆ چوون و تێروانینی خۆی بە چاوێکی واقیع بینانە نەروانێتە کۆنفرانس وخاڵە لاوازەکانی نەخاتە بەر چاو» بێگومان لەم برگەیەدا( نەروانێتە) و( نە خاتە) هەڵەن و دەبێ بگوترێ: نەکارێ:.(بروانێتە) و بخاتە) بەر چاو..هت

دواجار دەڵێم بیرەوەرییەکانی حیسامی ، وێرای هەندێ کەم و کورتی و ناتەواوی شوێنی خۆیان لە نامەخانەی کوردیدا گرتوە وبایەخێکی گرنگیان هەیە. بە تایبەتی کە بۆ یەکەمینجارە نووسەرێکی کورد وا بە فراوانی و

ڕاشکاوی ڕاستییەکان بخاتە ڕوو. تاقیکردنەوەی وا بەترخ بخاتە سەر خەرمانی تاقیکردنەوەکانی گەلە لێقەوماو ونیشتمان داگیر کراوەکەی و بە چەکی ڕەخنەی تیژ وبڕای سیاسەتی حیزب و ڕێکخراوە و بیر وڕای کەسایەتیەکان شی بکاتەوە. هیوادارم نووسەر ڕەخنەکانم بە دڵێکی فراوانەوە وەر بگرێ، بە تایبەت کە بە هیچ جۆرێک لە نرخی بیرەوەرییەکانی کەم ناکەنەوە. هیوا دارم تەمەن درێژ و پارێزراو بێ و بە بەرهەمی دیکەی بە نرخ، بە نووسین و وەرگێڕان و نووسینی لاپەڕەی تر لە بیرەوەرییەکانی، نامەخانەی کوردی دەوڵەمەندتر بکات. جەلال دەباغ- د/١٩٩٧/٩.

پەراوێزەکان:

١- بەرگی ٢ ل ٣، ٥٩، ١٤٤، بەرگی ٣ ل ٥٩، ٦٠، ١٠١، بەرگی ٤ ، ل -ب پێش دەستپێک ، ل ١٤ ، ١٧

٢- بەرگی ٥ ل ١٤٩ ، ل ٢٢٢ ، ل ٢٦٨ - ٢٨٦، بەرگی ٦ ، ل ٢ ، ل ١٢٩، ل ١٥٣ ل ، ١٨٧ ، بەرگی ٧ ل ١٠٠، ل ، ١٥١ ،

٣- بەرگی ٨ ل ١٦٢، بەرگی ٩ ل ، ٢٤٨ ، - ٢٥٠.ل ٢٤٩ . ل ٢٥٠ ل ٤٦

٤- بەرگی ١٠ ل ١٣، ل ١٢ ،ل ٢٤، ٣٤ ٥١ ٦٠، ٢١٤، ٢١٥

لێرەدا ئیتر ( هەڵسەنگاندنەکەی) کاک جەلال دەباغ تەواو دەبێ. من لە شێوەی ڕەخنەی ئەدەبی و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی بابەتی ئەدەبی زۆر شارەزا نیم. ئەوندەی بزانم لام وایە ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی بابەتێکی ئەدەبی ، سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، لقێکن لە ڕۆشنبیری گشتی کە هەر یەک لە وانە پسپۆر و شارەزای خۆیان هەیە و لە گەڵ ڕێنوێنی و مامۆستایی و شوێن دیاریکردنی دەقی نووسەر تۆزێ فەرقیان هەیە. من دەقی نووسینەکەی کاک جەلال دەباغم لێرە داهێناوەتەوە. بەلای منەوە کاک جەلال ویستوویەتی لە سۆنگەی بە ناو ( هەڵسەنگاندنی بیرەوەرییەکاندا،) هێندێ بەر پرسایەتی خۆی لە کاری حیزبی و ئاگاداری هێندێ ڕووداوە بخاتە ڕوو. وەک پسپۆڕێکی ڕەخنە و هەڵسەنگاندنیش ڕێنوێنی نووسەر بکا کە: ( فلان شت جێگای ئەوە نەبوە، یا فڵان شت بۆ وا نووسراوە، یا موناقەشەی مەسەلەیەک بکا کە چەند سال لەمەو بەر باسم کردوە، یا دەبوایە نامە لە شوێنی خۆیدا بڵاو کرا بایەوە و یا بۆچی باسی فلانکەس نەکراوە و یا دەبوایە پتر کرابایە ویا ...و یاو... هتد. ) لە

وەش زیاترویستوویەتی ئەرکی پارێزگاری و بەرگریی نا بە هەق لە حیزبی تودە و حیزب دێموکراتی کوردستان و دوکتور قاسملو و عەولای حەیاکیش بگرێتە ئەستۆ و بە دیفاعیش لە تاوان و جنایەتەکانی ستالین و (سانترالیزمی دێموکراتی ) قەپاتی بکا. بە بۆچوونی من ئەوانە نە ئەرکی وین و نە پێوەندیان بە هەڵسەنگاندی بابەتێکی ڕەخنەییەوە هەیە. بەڵام دیسان گەڵ سوپاس بۆ زەحمەتی کاک جەلال هێندێ بۆ چوونی خۆم کە بۆ ڕوونکردنەوەی کاک جەلال بەپێویستم زانیون لە ژێرەوە بە گوێرەی ژمارە دانانی نێو دەقەکەی کاک جەلال دەباغ دەیان نووسمەوە و هیوادارم خوێنەر ڕوونکردنەوەکانی منیش هەر وەک دەقی هەڵسەنگاندنەکەی کاک جەلال بخاتە بەر چاو .

I ــــ کاک جەلال دەباغ لە باسەکە لایداوە وشتەکانی تێکەڵ کردوە. «شیوعیەت » و شیوعی لێ تێکچوە. فەرقی نێوان« شیوعیەت» وەک مەرام و بیر و باوەر لە گەڵ « شیوعی» وەک تاکێکی ئەندامی حیزبێکی شیوعی فەرقی زۆرە. من نەمگوتوە ئەم قسەی کاک جەلال بێتوشی پێوەندی بە(شیوعیەتەوە) هەیە. من گوتوومە «جەلال بێتوشی شیوعی بوو». نیتر بەڵگە هێنانەوەی کاک جەلال دەباغ لە جێی خۆ ی نیە. خۆ من باسی شیوعیەت ویا سیاسەت وهەڵوێستی حیزبی شیوعیم نە کردوە. وتەی برادەرێکی شیوعیم بیستوە و گێڕاومەتەوە. خۆ کاک جەلال ناتوانێ بڵێ جەلال بێتوشی ئەودەم شیوعی نەبووە. بۆ کاک جەلال پێی وایە کابرای شیوعی قسەی بێجێ ناکا و تووشی هەڵە نابێ.؟ ئەگەر کابرایەک و یا تەنانەت حیزبێکی شیوعی هەڵەیەکی کرد- کە زۆر کراوە- لام وا نیە پێوەندی بە شیوعیەتە وە هەبێ. منیش باسی « شیوعییەت»م نە کردووە.

II ــــ پێم سەیرە کاک جەلال دەباغ بۆچی ڕستەکەی نووسینەکەی منی تەواو نە کردوە. من نووسیومە« نامەم بۆ کاک حەسەنی قزڵجی نووسیوە و داوام لێکردوە کە لە سەر وەزعی کوردستان و بێبەشی خەڵک و زوڵم و زۆریی ژاندارمە و سیاسەتی دەوڵەت بەرانبەر بە گەلی کورد وتار بڵاو بکاتەوە» کاک حەسەن لە وەڵامدا نووسیبووی« ئێمە دەبێ وتارە فارسییەکان بکەین بە کوردی و بڵاویان بکەینەوە حەقی هیچی دیکەمان نیە.» کاک جەلال دەباغ ئەم قسەیەی کاک حەسەنی قزڵجی پاشقول داوە و دەڵێ:« زۆر شت لە سەر کورد و مەسەلەی کورد بڵاو دەکرایەوە، بەڵام «لە ئاستی پێویست نەبوە» سەیرە، هەر لەم

لاپەڕەیەدا باسی نامەی من ناکا کە لە سەر بڵاو نەکردنەوەی دەنگ و باسی کوردستان و وتار لە بارەی وەزعی کورد و یادی ڕۆژە مێژووییەکانی گەلی کورد لە « پەیکی ئێران» دا، ڕەخنەم لە حیزبی تودە گرتوە و ئیرەجی ئەسکەندەری بەر پرسی تەبلیغاتی حیزبی تودەی ئێران لە تاریخی ١٩٦١/٨/٢ بە ژمارەی ٢٩٣ نامەیەکی بۆ نووسیوم و دەڵێ:« بیر خستنەوەی تۆ لەم بارەوە کە وتارەکانی ڕادیۆی ئێمە بە زمانەکانی ئازەربایجانی و کوردی دەبێ مەتڵەبی تایبەت بە ئازەربایجان و کوردستان بڵاو بکەنەوە، بیر خستنەوەیەکی تەواو ڕاستە. تا ئێستا نەمانتوانیوە ئەم نوکتەیە لە تەبلیغاتی ڕادیۆیی خۆماندا لە بەر چاو بگرین..» ئێستا بۆ چوونی کاک جەلال ڕاستەکە دەڵێ:« زۆر شت لە سەر کورد و مەسەلەی کورد بڵاو دەکرایەوە» یا ئیعترافی بەر پرسی تەبلیغاتی حیزبی تودە و یا نووسینەکەی من ؟

١١ـــ لە وەڵامی ئەو هەموو« ئایا » یانەی کاک جەلال کە دیار نیە دە کەونە کام خانەی« هەڵسەنگاندن» من لە کاک جەلال دەپرسم: لە کوێ و کێ باسی « ناپاکی قاسملوی کردوە کە تۆ مەسەلەی پاکی» باسدەکەی؟ لەم بارەوە کە دەنووسی:« هیچ مەرج نەبوو قاسملو لە گەڵ برادەرەکانی بژی. کە لە گەڵ کەسانی بەڕێزی وەک خسرەو تۆفیق و نیژاد و هەمزە عەبدوڵلا ژیاوە دەبێ کەمایەتی چی تێدا بێ و باسی کام «ڕابواردن» دەکرێ». دەبێ بڵێم من « ڕابواردن» بە مەفهوم و تێگەی خەڵکی سلێیمانی بە کار ناهێنم. سەر جەمی ژیان چاک و خەراپ، خۆشی و ناخۆشی، خەو و بێداری، گشتی بە ڕابواردن دەژمێردرێن. بەڵام ئەوەی کە دەڵێی: « ژیان لە گەڵ ئەو بە ڕێزانە دەبێ کەمایەتی چی تێدا بێ» بە قەولی کاک محەممەدی ڕایانی ئەوە مەسەلەیەکە دەبێ تێیبگەی. کە مایەتی ئەوەی تێدا بوو کە تووشی هاتین کە لە عیراق وەدەریان ناین. خۆ من لە بەرگی دووەمی بیرەوەرییە کانم باسی ئەو کەمایەتیەم کردوە. کاک جەلال ئەو بەشەی نەدیوە. ئەو کەمایەتیەی توشی هاتین کاک جەلال لێی تێناگا، من پتر هەست بەو کە مایەتیە و بەو زیان و ئازارە دەکەم کە لە سۆنگەی هاتوو چۆی ئەو بەڕێزانەوە حیزبی دێموکرات و بزووتنەوەی ئەو کاتی حیزب توشی هات. ئەم دەردە من هەستی پێدەکەم نەک کاک جەلال.

١٧ـــ کاک جەلال کە وا ئەوەندە لە سیاسەتی لە باری حیزبی تودەی ئێران

سەبارەت بە مەسەلەی کورد ئاگادارە، دەبوایە لانی کەم یەک دوو بەڵگە و دوکۆمێنتی ئەو حیزبەی وەک نموونە باسکردبایە. من ئەگەر باسم نەکردوون ڕاستە بە هەڵە چووم. دەبوایە ئەو نووسراوانەی حیزبی تودەم باسکردایە کە داوای لە کوردەکانی ئێران دەکرد، واز لە حیزبی دیموکرات بێنن و بێنەوە نێو حیزبی دایک. کە حیزبی دیموکراتیان بە « ضد انقلاب» دادەنا و بوختانیان پێدەکرد کە ٩ میلیۆن دۆلاری لە ناتۆ وەر گرتوە و لە جەنگەی خەباتی دژوار و پەلاماری حکوومەتی ئاخوندیدا ڕیزەکانی حیزبی دیموکراتیان تێکدا و ئەندامانی حیزبی دیموکراتیان بردەوە نێو حیزبی دایک. بەڵام کاک جەلال دەباغ ئەو ساش وەک عادل حەببە هەر(حیزبی برای) پێ ڕاست و لە سەر هەق دەبوو، دیفاعیشی لێدەکرد. تۆ بڵێی بە قەولی دوکتۆر رادمەنشی ڕەحمەتی( مارکسیستە کوردەکانی کوردستانی ئێران) ڕێبەرایەتی حیزبی تودە لە کاک جەلال دەباغ باشتر نە ناسن ؟!!

٧ــــ هێندێ لەم ڕوونکردنەوانەی کاک جەلال پێم وانیە پێوەندیان بە « هەڵسەنگاندی» بیرەوەرییەکانی منەوە هەبێ.

لە بارەی« مەفرەزەی ملازم ئەحمەد» من دەقی نامەی حەمەدەمینی سراجی-م بڵاو کردۆتەوە. کاک حەمەدەمین نەیگوتوە: « دەستەی ملازم ئەحمەد لە لایەن بارزانیەوە تەکلیف کراوە» کاک حەمەدەمین دەڵێ :« لە سنوورەکاندا مۆڵیان خواردوە و چاوە ڕوانی ئەمری سەرۆکن » . ئەمە فەرقی زۆرە لە گەڵ تێکەڵکردنی کاک جەلال.

کاک جەلال دەنووسێ:« لە نامەیەکدا ناوی کاکە شوان هاتوە کە دیارە مەبەست لە حیزبی شیوعی عیراقە بەڵام ئەوە ڕوون نەکراوەتەوە.» پرسیار ئەوەیە. دەبوایە چی ڕوون بکرێتەوە؟ بۆ چی نووسەر مەجبوورە بڵێ ئەوە حیزبی شیوعی عیراقیە کە ڕەمزێک بوە بۆ گۆڕینەوەی نامە لە نێوان برادەرانی خۆیانەوە. تۆ بڵێی ئەم بۆ چوونەوەی کاک جەلال ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی بابەتی بێ.؟

٧١ــــ نازانم خوێنەری کورد لە سەر ئەم هەڵسەنگاندنەی کاک جەلال دەبێ ڕای چۆن بێ ؟ بە بۆ چوونی من بوون و نە بوونی ئەندامەتی من لە حیزبی تودە دا هیچ پێوەندیی بە کاک جەلال و« هەڵسەنگاندن» ە وە نیە. من قەت دەروێش

نەبووم، سەر بەخۆیی خۆم لە هزر و کردەوە دا پاراستوە. بە شانازی دەزانم کە بە قسەی ڕێبەرایەتی حیزبی تودە پشتم دە حیزبی دێموکرات و بزووتنەوەی کورد نەکردوە. کاک جەلال پێی وایە ئوقورچ گرتن لە سکرتێری گشتی حیزبێک کوفرە و نابێ بە گاڵتەش باسی بکرێ. پاشان دەڵێ : « وای نیشان داوە کە لە لایەن تەرەفی تودەوە هیچ نە کراوە» من کە سەر و کارم لە گەڵ سیاسەتی حیزبی تودە هەبوە ئەوەم نووسیوە و ئێستاش دەڵێم کە هیچ نەکراوە و حیزبی تودە لە سەر مەسەلەی نەتەوەیی سیاسەتێکی ڕوونی نەبووەو سیاسەتێکی تێکدەرانەشی هەبووە. کاک جەلال کە ئەندامی حیزبێکی دیکەیە و دیارە لە مەسەلەکانیش ئاگادارە ، بەڵام ئاگای لە هەڵوێستی ڕێبەرایەتی حیزبەکەی خۆی نیە کە لە سەر حیزبی دێموکرات ڕەخنەی توند تریان لە حیزبی تودە گرتوە، پێم خۆش بوو ڕوونی کردبایەوە کە حیزبی تودە بۆ کورد و بە تایبەت بۆ قۆناخی باسکراو چی کردوە.؟

v11 ـــ ڕوون نیە کە کاک جەلال دەیەوێ بڵێ چی؟ دەنووسێ : « نووسەر لە سەر پشتگیری و میوانداری و هاوکاری کوردانی کوردستانی عیراق شتێکی وای نە نووسیوە. بەڵام لە بەرگی چوارەمدا دانی پێدا ناوە..» نازانم کاک جەلال دەیەوێ بڵێ چی؟ من نووسیومە-« ئەگەر خۆم لە قەرەی ئەم باسە دابایە (واتە میوانداری برا کوردەکانی کوردستانی عیراق) دەبوایە بەرگێکی بۆ تەرخان بکەم.» بەڵام کاک جەلال لێرەدا چاکی بۆ چووە. ڕاستە کوشتاری کوردەکانی ئێرانم بە دەستی کوردەکانی کوردستانی عیراق بە تەواوی باس نەکردوە، کاک جەلال باپەلە نەکا لەم بەرگە دا هیوادارم بتوانم باسی میوانداری هێندێ هێزە سیاسیەکانی کوردستانی عیراق بکەم کە چۆن تێکۆشەرانی کوردستانی ئێرانیان بە دەست بەستراوی داوەتەوە بە حکومەتی ئاخوندی ئێران وخۆشی دەیتوانی باسی ئەوە بکات کە پتر لە سەت کوردی کوردستانی ئێران لە ژێر دەسەڵاتی کوردایەتی کوردستانی عیراقدا بە بێتاوانی کوژراون.

v111 ـــ دەکرێ لە کاک جەلال بپرسین کە چ پێوەندییەکی بە ڕەخنە گرەوە هەیە کە نووسەر نامە یا وتارێکی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبێک و یا نهێنی حیزبێکی تر کە کاک جەلال ئەندامی وی نیە، بڵاو دەکاتەوە.؟ نووسەر بۆ سەر بەست نیە لە وەدا کە چ شتێک بنووسێ و یا بڵاو کاتەوە. تۆ بڵێی کاک جەلال

له من زیاترله بارەی نهێنی وکارەی کانی حیزبی دێموکرات سەلاحیەتی هەبێ ؟

1x ـــوادیاره کاک جەلال سەبارەت بە هەستی توندی ئینترناسیۆنالیستی ئەرکی بەر گری لە سەلاح بدرەدین و قاسملو وحەسەنزادە و سیراجی و حیزبی دێموکراتی گرتۆتە ئەستۆ کە دەنووسێ « کەی ڕاستە سکرتێری ڕێکخراوەیەک ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە» دیارە کاک جەلال مەترسی بۆ سکرتێر بە ڕەوا نازانێ، بەلام بۆ تێکۆشەرێکی تر ئە گەر سکرتێر نەبوو، بکەوێتە بەر گوللە بارانیش قەیناکا.! یان دەنووسێ: « کام حیزب دەتوانێ ئەو پێشنیارە بێنێتە دی... یان « داخوا بەلگە هەن یا نین و چۆن ناگەنەوە دەست!».... یا داخ لە وە دەر دەبڕێ کە« ئەو هەلسەنگاندنە دەر هەق بە حیزبی دێموکرات بگوترێ !» نازانم کاک جەلال چۆن ڕێگا بە خۆی دەدا کە خۆی لە ئەندامی سەر کردایەتی حیزبێک سەبارەت بە نهێنیکاری ئەو حیزبە و کەم و کوری تەشکیلاتی بە شارەزاتر بزانێ و قسەی لێبکات ؟ڕوونکردنەوەی ئەو هەموو « ئایا»نە کاتێکی زۆری گەرەکە. خۆ کاک جەلال خەلکی سلێمانییە و وەک خۆشی دەلێ بە ئێرانیشدا تێپەڕیوە و لێشی لاداوە، چۆن ئاگاداری ئەم شێعرە پڕ بایەخەی سەعدی شیرازی نە بوە و نیە کە دەفەرموێ:

ـــ نهاد طفل بد را دایه داند ـــ بدی همسایه را همسایه داند.

کاک جەلال هەر بەوەندە کە وەک خۆی دەلێ :« هێندێ جار لە نیزیکەوە لە مەهاباد بووم و یان ڕاگوزەر بە شار و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی ئێراندا تێپەڕ بووم زۆرم دەخوێندەوە...» پێی وایە « حیزبی دێموکرات سەر قالی شتە ورد وبچوکەکان بوە بایەخی بە مەسەلە گەورەکان نەداوە دەنا دەیتوانی لەوە زیاتر ڕۆلی هەبێ نەک تەنیا بۆ کوردستان بەلکوو بۆ تەواوی ئێران.» کاک جەلال کە هەلسەنگاندنی بیرەوەری گەیاندۆتە شارەزایی لە کەم و کوڕییەکانی حیزبی دێموکراتیش. دەبوایە « مەسەلەی گەورە و شتی بچوک و ڕۆلی جیاوازی» ڕوونکرد بانەوە تا حیزبی دێموکرات بۆ ئێستا کەلکیان لێ وەر بگرێت، !

X ـــکاک جەلال دێتە سەر دیفاع لە « سانترالیزمی دێموکراتیک و جینایەتەکانی ستالین.» و دەنووسێ ئەگەر وابێ حیازبی دێموکرات سەنترالیزمی پیڕەو کردبێ چۆن ئەو پەشیوەی توش دەهات کە...» جا من لە

کاک جەلال دەپرسم: حیزبە کۆمونیستەکانی ولاتانی خەریک بوژانەوە و سەرمایەداری و بە ناو سۆسیالیزم« سانترالیزمی دیموکراتی» یان وەک ئایەتی قورئان پیرەو دەکرد، ئەدی ئەوان بۆ تووشی ئەم رۆژە هاتوون و ناچار بوون لیی پەشیوان بوونەوە وازیان لەو « ئایینە » هیناوە. لام وانیە حیزبیکی کۆمونیست هەبێ ئیستا « سانترالیزمی دیموکراتی» لە پیرەوی خۆیدا هیشتبیتەوە ، حیزبی دیموکرات نەبێ.لە بارەی روونکردنەوەی ئەوە کە « دیکتاتۆری پرۆلتاریا» بۆتە دیکتاتۆری ستالین و ۲۹ ئەندامی کومیتەی ناوەندی و پۆلیتبیرۆی حیزبی کۆمونیستی سۆڤیتی پێ ئیعدام کردوە، داوای سەر چاوە دەکات. لام وایە سەر چاوەی باوەر پیکراوی حیزبە کۆمونیستەکان یەکجار زۆرن ئەگەر کاک جەلال حەوسەلەی هەبێ بیانخوینیتەوە. ئەوەی من لە قەولی (فیلسوف ئیگۆرکلامکین) لە بەرگی هەشتەم دا هیناومەتەوە، لە گۆڤاری« دنیای تازەی» چاپی رووسیادا بلاو کراوەتەوە. رۆژنامەی ( کار ژمارە ۳۲ ئۆرگانی سازمان چریکهای فیدایی خلق ئەکسەریەت) کە سەردەمیک قەت لە کاک جەلال کەمتر پابەندی (سانترالیزمی دیموکراتیک و دیکتاتۆری پرۆلتاریا) نەبوون، بلاوی کردۆتەوە. بە راستی پیم وانیە لە رۆژگاری ئیمرۆ دا جگە لە کاک جەلال دەباغ کەس زات بکا دیفاع لە تاوان و جنایەتەکانی ستالین بکات و سەنترالیزمی دیموکراتیش کە لە سەردەم و بارو دۆخیکی تایبەت دا لینین هینایە نیو پیرەوی حیزبی کۆمونیست، بیر و هزر و باس وردەربرینی لە نیو حیزبدا پێ لە کۆت و قالب بدات.

x1___ کاک جەلال باسی ( پیرەوی ناو خۆی حیزب) دەکات کە بیر و رای ئەندامانی حیزب و دیموکراسی نیو حیزبی پێ خەفە کراوە. دەبێ لە کاک جەلال بپرسین : داخوا تۆ ئاگات لەوە هەیە کە ئەندامانی کۆنگرەی چواری حیزبی دیموکرات چەندە بە گویرەی( پیرەوی ناو خۆی حیزب) بەشدار بوون و ئەوانەی بوون بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی چەندەیان ئەو دەم ئەندامی حیزب بوون ؟ پاشان من لە کوێ باسی خەیانەتی دکتۆر قاسملوم کردوە کە تۆ وا بە هەلە دەیخەیە نیو کەوانەوە.؟ کەی ئەوە دەربرینی راستی و هەلسەنگاندنی بابەتی و زانایانەیە.؟ کاک جەلال! بیگومان زۆر لە تۆ زیاتر دوکتور قاسملو دەناسم، زۆر لە تۆش زیاتر ریزم بۆی هەبوە، زۆرلە تۆش زیاتر هەست بە زیانی

نەمانی دوکتۆر قاسملو دەکەم. بەڵام فەرقەکەمان لە وە دایە من سەبارەت بە بەرژەوەندی بزووتنەوەی میللەتەکەم خەرقەی دەرویشیم فڕێداوە. بە فیکری خۆم بیر دەکەمەوە و بە توندی بوتپەرستی مەحکوم دەکەم و بە قازانجی بزوتنەوەی کوردی نازانم. ئێمە حەفتا ساڵ بە ناهەق بە ستالینمان هەڵا گوت و قەت جارێک لە ئاست چەوتی و هەڵە و نە بوونی دێموکراسی لە وڵاتانی سۆسیالیستی و لە ئاست سیاسەتی چەپەڵی وان لە پەیوەندی لە گەڵ ڕژیمە فاشیست و دیکتاتۆرەکانی ئێران و عیراق و تورکیادا،زارمان هەڵنەپچڕا و زمانمان نەگەڕا. تۆ بڵێی کاتی ئەوە نەهاتبێ ئەم ڕەوشە ڕەش بکرێتەوە و بە ڕاستی و بێ دەمار گیری وشکە ڕۆیی لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵک ڕاست بین و بێینە زمان.؟

کاک جەلال دەڵێ:«لە کاتێکدا خودی نووسەر و ئەو کەسانەش دەیانتوانی ڕۆڵێکی گرنگ لە خەباتی نێو خۆیدا بگێڕن»

باشە! کاک جەلال تۆ چو زانی لە نێو حیزبدا دەنگ بەرز نەکراوەتەوە.؟ لە نێو حیزبێکدا کە تۆ ئەندامی نەبووی. چۆن دەزانی ڕێگای خەباتی نێو خۆی حیزب هەبوە یان نا؟ چۆن ئە و نامانەت نە دیوە کە لە سەر کەم و کوڕی کاری سیاسی وتەشکیلاتی بۆ کومیتەی ناوەندی نووسراون.؟

کاک جەلال دەڵێ :« تا ئێستا ئەم بیستوە مەلایان کینە و بوغز حیقدی مەلایانەیان هەبێ »

بە ڕاستی منیش پێم سەیرەبوو ئەگەر کاک جەلال شتی وای زانیبایە. چونکە کاک جەلال زیاتر بە کاری تیئۆری مارکسیزم وکاری سیاسییەوە خەریک بوە شارەزای کۆمەڵی کوردەواری نیە. لە هەموو کوردستان بە شاز هەڵدەکەوێ دوو مەلا بە ڕاستی و لە ناخی دڵەوە پەسنی یەکتر بکەن. تۆ بڵێی کاک جەلال ئەی زانیبێ و نەیبیستبێ کە هەر لەم قۆناخە دا کە ئەو باسی دەکات، مەلایەکی نیشتمانپەروەر و زانا بە دەق و هاندانی مەلایەکی تر تیرۆر کرابێت و حیزبی دێموکراتیش لە سەری نووسیبێت ؟

x11 ــ کاک جەلال بە کار هێنانی وشەی« کەللە ڕەق و بێ قەول » بۆ کورد بە «هێرشی ناڕەوا » دەزانێ. کاک جەلال ڕاست دەکا ، بە لێ داخە، داخ لە دڵییە، داخە بۆ بار و دۆخ و« خاسیەتێک کە دوژمن بە سەریاندا بڕیون» کە «

کەللە ڕەقە، فریو دەدرێ، درنگ تێدەگات، بێ قەولە، ئاخرەکەیشی بە قەولی زانای نیشتمانپەروەر و بەناو بانگی کورد مەلای گەورە :

فەقیر و جاهیل و ناخوێندەوارن ــــ لە لای ئەوعی بەشەر بێقەدر و خوارن

لە گەڵ یەک بەد ڕەوشت و بەد نیهادن ــــ لە بۆیە وا کەساد و بێ مرادن

من لە کاک جەلال دەپرسم بۆ ئێستا کوردی وا کەمن کە لە ئورووپاوە دوور لە کۆڕی خەبات ڕێگای چارە نووسی کورد دەستنیشان دەکەن و جنێو و قسەی بێتام لە نووکی خامەیان هەڵدەوەرێ.؟ دەر بڕینی ئەم ڕاستییە، یا تانە و تەشەریش بێ بۆ ناگونجێ ؟ من ئەو کەسە نیم بە درۆ بە شاخ و باڵی کورد هەڵا بڵێم و ئیمپراتوری خەیاڵی بۆ دروست بکەم و بیکەمە ئەشرەفی مەخلوقات و لە کەم و کوڕی و ناتەواوی وبێ مەبدەئی و بێ پڕنسیپی چاو بپۆشم. بەشی پەسن و پێهەڵاگوتن بۆ کال جەلال بە جێدێڵم. من لام وایە کوردیش وەک هەموو نەتەوەکانی جیهان ئینسانی باش و زانا و نیشتمانپەروەرو جوامێرو تێکۆشەری تێدایە و چەندی بڵێی نا ئینسان و خۆ فرۆش و بێ بیر و باوەر و هەلپەرست و نۆکەر سیفەت و ترسەنۆک و درۆ زنیشی تێدایە.

x111ــــ بە داخەوە کاک جەلال جگە لەوە کە مەسەلەکان لە جێی خۆیدا باس ناکات، دەستیش دەگەیێنێتە دەقی نووسراوەکانی من. ساڵی ١٩٩٨ لە وتو وێژێکدا کە کاک جەلال باسی دەکات گوتوومە :« بە لای منەوە بۆ کوردستان مافی دیاریکردنی چارە نووسە کە دەبێتە دەوڵەتێکی ئازاد و سەر بەخۆ و ئەشێ لە ئامانج و ستراتێژی دا ئەوە دیاری بکرێت. ئەو ستراتێژییە پێویستە ناوەندێکی لە دەرەوەی وڵات هەبێ و مەسەلەی کورد لە جیهاندا بێنێتە گۆڕێ. هەموو حیزب و ڕێکخراوی کوردیش کۆمەگی پێبکەن و ڕێبەرایەتی سیاسی دەرەوەی لە ئەستۆ بێت.» ئیتر من نەمگوتوە « وەک دروشمی ڕۆژ» بڕوانە کەریمی حسامی لە بیرەوەرییەکانم بەرگی دەیەم لاپەڕەی ٤٢.

کاک جەلال « دروشمی ڕۆژی» لە قسەکانی من زیاد کردوە تا مەیدان بۆ قسەکانی دوایەی خۆش بکات. کاک جەلال ئەوەشی لە « هەڵسەنگاندنەکەی» زیاد کردوە دەڵێ: « وتو وێژی چاپەمەنی و گەلێک بەر هەمێتر شوێنی زۆریان لە بیرەوەرییەکانی گرتوە»

بەلای منەوە وتو وێژی چاپەمەنی و بەرهەمێتر بەشێکن لە ژیان و بیرەوەری

نووسەر و لە هەر شوێنێ بڵاویان بکاتەوە، مافی خۆیەتی و خۆی دەزانێ داخوا بڵاو کردنەوە دەبن یا نا و لە کوێیان بڵاو دەکاتەوە. بەڵام ئەوەی نازانم کە داخوا هەڵسەنگێنەری بەرهەمێک مافی ئەوەی هەیە کە شوێنی بڵاو کردنەوەی نووسراوەی نووسەرێک دیاری بکات، یا نا؟

لە گەڵ هەمووی ئەوانە یەک دنیا سوپاسی کاک جەلال دەباغ دەکەم کە خۆی ماندوو کردوە بیرەوەرییەکانی خوێندۆتەوە و ڕەخنە و بۆچوونی خۆی سەبارەت بە دەبەرگی بیرەوەرییەکانم هێناوەتە سەر کاغەز. ماڵی ئاوەدان بێ چاک نیە وەک مەلاعەولای حەیاکی یەکسەر بە فتوای مەلایانە نەیگوتوە: «بیرەوەرییەکانی کەریمی حسامی جێگای بڕوا نین» فەرقی ڕووناکبیری پێشکەوتنخواز لە گەڵ مەلای پاشکەوتنخواز هەر لە وەدایە.

### وەڵامی نامەیەک پاش ٧ ساڵ

وەک لە دەقی نامەکەدا دەردەکەوێ پێش ٧ ساڵ بیرەوەرییەکانم بۆ دۆستی خۆشەویست و شاعیری بوێر وناسراو « پەشێو » نارد و داواشم لێکرد بوو ئەگەر بە زەحمەتی نەزانی پێم خۆشە بە چەند دێرێک تێشکێک بخاتە سەر بیرەوەرییەکانم. بەڵێ پاش ٧ ساڵ ٢٠٠١/٢/١٨ بە خۆشییەوە پەیدا بوو، نەک هەر خۆی بەڵکوو ئەم نوسراوەی خوارەوەشی لە وەڵامی نامەکەی مندا لە گەڵ خۆی هێنا بوو. منیش وا بە سوپاسەوە بڵاوی دەکەمەوە:

، برای گەورەو خۆشەویستم کاک کەریمی حسامی

وا لە خوارەوە وەڵامێکی نامەی ڕۆژی ١٩٩٤/٢/١٥ ت دەدەمەوە کە تێید اگلەییت لە بێدەنگیم کردووە وشانازی ئەوەت پێ بەخشیوم بیرو ڕای خۆم دەربارەی بیرەوەرییەکانت بنووسم.

چبکەم بریا هێندە دوژمنی نامە نووسین نەبام.! بەڵام تۆ بڵێی مەسەلەکە هەر تەمبەڵی و تەوەزەلی بێ، یاخۆ لادان و ترسێکە لە وەڵامدانەوەی ئەو هەموو پرسیارو وردبوونەوە و هزرە جۆراو جۆر و پڕ جەسارەتانەی، کە لە توێی چەند هەزار لاپەڕەیەکدا قەڵەمی تۆ دەیانهاروژێنێ؟

جارێ دەبێ ئەوە بڵێم کە بە دەگمەن و ارێککەوتووە ئاوا یەک نەفەس

ماتریاڵێک، وەک بیرەوەرییەکانی تۆ، بخوێنمەوە. من پێم وایە بە نووسینی ئەو بیرەوەرییانە پاکانە بۆ هاتنە دنیای خۆت کردووە. بەڵێ، بۆ ئەنجامدانی کارێکی وا، ئەوە دەهێنێ پیاو لە دایک بێ. زانایان و نووسەران و هونەرمەندان، بە گشتی، هەمیشە لە ناو کارەکانیاندا شاکارێک هەیە، کە پێی دەگوترێ« کاری ژیان» من بە خاتر جەمییەوە دەڵێم« بیرەوەرییەکانت» شیلە وکاکڵی کارەکانی ژیانی تۆیە. دەستەهەقی ئەو هەموو کوێرەوەری و دەربەدەری و ماڵبەکۆڵییەیە کە تا ئێستا چێشتووتە. تاکە ئەنجامێکی کۆنکرێت و بەر چاوی رەنج وخەباتێکی درێژ خایەنە. بەڵام ئەمە کەمە؟

هەڵبەتەچەند کەسێک پێش تۆ بیرەوەرییەکانی خۆیانیان لە چاپ دابوو، بەڵام کەسیان ئەو هەرایەیان نەنایەوە، دنیایان لە خۆ نە هارووژاند وەک تۆ. هەر لە بەر ئەوەش، نووسینی تۆ، جورئەتی تۆ( بە چاو پۆشی لەو رەخنانەوی کە ئاراستەت کران) بووە سەر مەشق بۆ نووسەر و سیاسەتمەدارانی تر پەنا ببەنە بەر قەڵەم هیچ نەبێ بۆ لەسەرخۆ کردنەوە. ئێستا دەتوانین بڵێین، یادداشت یا بیرەوەری، یەکێکە لە ژانرە دیارەکانی ئەدەبیاتی کوردی، کە رەنگە زۆرترین ژمارە خوێنەری هەبێ، تۆدەستێکی باڵات هەبووە لە رسکاندنی ئەو ژانرە. ئەگەر ئێستاش کەسانێک هەبن لە بایەخی ئەو کارە مەزنە نەگەیشتبن، ئەوا دڵنیام کە دوارۆژدا تێدەگەن و هەقی خۆت دەدەنێ.

مخابن زۆر جار لە خۆتم بیستووە، کە تۆنووسەر نیت. گوتم« مخابن»، چونکە پێم وایە( بیرەوەرییەکانت)بریتییە لە ئاوێتەیەکی نایاب لە هەموو توخم و رەگەزەکانی رۆمان، چیرۆک، رۆژنامەوانی. فۆلکلۆر، پەند و قسەی نەستەقی کوردەواری، نوکتە، بەڵگەو سەنەد، دیرۆک، سیاسەت، ریپۆرتاژی رۆژنامەوانی...هتد، بەڵێ، راستە، نووسینەکەت هیچ یەک لەمانە نییە. بەڵام هەمووشیانە! پێشانگای سەرجەم ژیانی کوردەوارییە، بە هەموو رەندی و درێوییەکییەوە. تێیدا کۆمیدیا و تراژیدیا پەنجەیان تێکهەڵکێشاوە و هاوێرناکرێن. کاتێ باسی مام عەلی عەجەم، کە دوازدە ئیمامی بەجێهێشتووە و بووە بە کورد، دەخوێنیتەوە، نازانی نە بگرییێ نە پێبکەنی. ئەو چایچییەی لە پیرمەم، دووای دوو جار تکا لێکردن هەر چای خەست دێنێ، پاشان کە جاری سێیەم تکای لێ دەکرێ چایەکی سوک بێنێ. توورە دەبێ و هەر سێ تەڵاق

دەخوا کە حەیای چایەکەی خۆی نابا!پیاو نازانێ ئەو چایچییەی خۆش بوێ یا ڕەقی لێی هەڵسێ! حەیف نەبوو، ئەو وێنانە ون بن و کەس نەیانخاتە سەر کاغەز؟! جگە لە مەش بەرهەمەکە گەنجینەیەکی کەموێنە و سەرچاوەیەکی لە بننەهاتووە، بۆ ئەو مێژوو نووس و فۆلکلۆریست و ئێتنۆگراف و فەرهەنگسازانەی، کە سبەی دەیانەوێ مەتریاڵ و فاکتەکانیان لە دەستی یەکەم وەرگرن. ئەگەر نەوێرم بڵێم سەدان، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێم دەیان دەکومێنتی گرنگت تۆمار کردوون کە تەمی گومان لە سەر هەندێ مەسەلەی گرنگ دەرەوێننەوە، نە خاسمە ئەوانەی پەیوەندیان بە( ژ.ک) وحیزبی دیموکرات و ئەقەلییەتی سیاسی کوردانەوە هەیە، کە رەنگە تارادەیەک وەڵامی ئەو پرسیارەشیان تێدا بێ کە بۆ چی کورد نەبوو بە هیچ و سەدەی بیستەم بە تەکماندا تێپەڕی و ئاگامان لێی نەبوو! بتەوێ یا نا، ئاگادار بی یا نا، هۆیەکانی کەمبڕشتیی و تا رادەیەک رەنجبەخەساری سیاسەتمەدارانی سەدەی رابردووی کوردت هەڵخستووە. بەڵێ، لێت ناشارمەوە، کاتێ بیرەوەرییەکانی تۆ و کەسانی خەباتگێڕ و قوربانیدەری وەک بانیخێلانی و بلووریان و سەید کاکە و حەمەی حاجی مەحموود و ... هتد دەخوێنمەوە، بە دەست خۆم نییە، وەچەی ئێوە و تا ڕادەیەکیش خۆمانم بە« ڕەنجبەخەسار» دێتە بەرچاو. ئەمە حەقیقەتێکی زۆر تاڵە، بەڵام چارمان نییە، دەبێ دانی پێدا بنێین و لە بنپێوە تا تەوقی سەر بە وردی بە خۆماندا بێینەوە.تا ئەمە نەکەین ناتوانین تاکە هەنگاوێک بەرەو پێشەوە هەڵێنین. نابێ بیر لەوە نەکەینەوە، بۆچی ئاش هەمیشە گرمەی هاتووە و باراشیش دیار نەبووە! دەسماڵێکمان ویستووە و لە پێناویدا ئاگرمان لە سەراپای قەیسەرییەکە بەرداوە، ئەویش قەیسەریی خۆمان! هیچ کاتێک هاوسەنگی نەبووە لە نێوان ئامانجی بچووک و قوربانیی بێسنوورمان. سادیستانە لەزەتمان لە خودی پرۆسەی « خەباتی درێژخایەن و خوێناوی » وەرگرتووە، بێ ئەوەی زۆر خۆمان بەو ئانجامانەوە خەریک بکەین کە لەو خەباتە دەکەونەوە. لە پەراوێزەکاندا تەقوتۆقمان کردووە بۆ ئەوەی ئارامی و دێمۆکراسی لە سێنتەرە بێگانەکاندا بەرپا بکەین. چمائەمە هەمووی شایانی ئەوە نییە، ئێمە لە هەقیقەتە موتڵەقەکان بپرینگێینەوە و بە قەولی خۆت« بادەینەوە» ؟! تۆ لەمەشدا، لە بادانەوەشدا، هەر دەستپێشکەریت کردووە.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم نامە کورتیلە وەدرەنگکەوتووە بێنم، ڕاستییەکی تر هەیە، ناگریێ لەسەری باز دەم، ئەویش ئەو زمانە پاراوە پڕ نەبزمیە کە تۆ پێت نووسیوە. هیچ گومانم نییە لەوەی کە بەڕێزت یەکێکی لەو نووسەرانەی ڕۆژهەلاتی کوردستان ( هەژار، هێمن، قزلجی، عەبدوڵلای حەسەنزادە، زەبیحی، هێدی و ئەوانی دی )، کە لە سەردەمی کۆماری کوردستانەوە، بەتایبەتیش لە حەفتاکانەوە، شۆپێکی قووڵیان بەسەر زمانی ئەدەبیمانەوە بەجێهێشتووە و ئەو زمانەی ئەمڕۆ پێی دەنووسین کەموزۆر قەرزاریانە.

## یادانەوەیەکی پێویست و کارێکی نەکراو له نووسینی کوردیدا

هەر چەندە بە جیددی دژی یادانەوەم و یادانەوە بە تایبەت لە بواری بیر و باوەڕ و هەڵوێستی مەبدەئی و بەڵێن و قەول و قەرار ،بە کردەوەیەکی بێ پرنسیپی و بە هەلپەرستی دەزانم، کە بەداخەوە لە کۆمەڵی کوردەواریدا کەم نیە. بە لام بە ناچاری وا هەڵکەوت کە بۆ سەر کارێک یادەمەوە کە دەبوایە لە بەرگەکانی پێشوودا ئەنجام درا بایە. بە داخەوە هێندێ هۆی بێهودە و لێ ورد نەبوونە وە وای کردوە کە لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەدرێ. بەڵام کارێکی دڵت گرتوویەتی و دەتەوێ بیکەی، با وەدرنگیش بکەوێ نابێ چەتی تێخەی. چەندیش دەبێتە جێگای پەسندی خاوەن هزر وشارەزایانی ئەدەب و نووسین ئەوا مەسەلەیەکی دیکەیە. من لە تەواوی ژیانی سیاسی و لە نووسینەکانمدا ئەوەی قەناعەتم پێهێنابێت و بڕوام پێ بووبێت و بە بۆچوونی خۆم بە باش و ڕەوام زانیبێت، کردوومە و نووسیومە وبڵاوم کردۆتەوە. چارەنگە لای زۆر کەسیش بە کارێکی ڕەوانەزانرێ، یا کەم و کورتی زۆریشی تێدابێ، ئەوەش شتێکی سەیر ونەگونجاونیە. خۆ ناکرێ مرۆڤ شتێک بنووسێ و یا کارێک بکات، بە کەیفی هەموو کەس بێت. ئەو دەم ئەم جۆرە نووسینە هەر بایی و نرخیشی نابێت.

لە سەفەری مانگی ئاوگوستی ١٩٩٥ بۆ سۆفیا، لە نێو جانتا و چەمەدان و دەفتەر و کارت و کۆنە کاغەزاندا پاکەتێکی قەبەی هەڵمساوم دیتەوە کە کردمەوە هەموو ئەو کارت و نامانە بوون کە لەو ساڵانە دا لە لایەن دۆست و برادەرانەوە بۆمان هاتبوون و دایکی کەماڵ کۆی کردبوونەوە و تاقەتی کرد بوون. لە نێو ئەواندا چەند نامەم دیتنەوە کە کاتێ لە عیراق و لە کوردستانی ئێران بووم، بۆ دایکی کەماڵم نووسیون و یا ئەو بۆمنی ناردوون و یا منداڵەکان نووسیویانە. چەند نامەیان تێدا بوو کە بە پیتی رووسی و بە زمانی کوردی بۆ منداڵەکانم نووسیون و یا ئەوان بە ڕووسی بۆ منیان نووسیون. نامەیەکی شلێری کچمی تێدابوو کە بۆ هەوەڵین جار بە کوردی نووسیبووی. زۆری پێ

شاد بووم. تەلەفوونم کرد بۆ شلێر و پێم گوت : نامەیەکی تۆم بە کوردی دیوەتەوە. گوتی: « بابە نەیفەوتێنی. ئەو نامانەی بۆ دایکم و بۆ ئێمەت نووسیبوو هەڵیان بگرە و هەموویان نرخی خۆیان هەیە.»

وتەکەی شلێر مێشکی جوڵاندم. گوتم جا کە وایە بۆچی ئەو نامانە لە ئاخرین بەرگی بیرەوەرییەکانمداکە(ڕەنگە لە ئاخری تەمەنیشمدا بێ) بڵاو نەکەمەوە. دەبێ چی لەم بەرگە دا بنووسم کە بۆ من خۆشترلەو نامانە بێت. بۆ چی بۆ ڕێز گرتن لە خەم و خەفەتی تەنیایی خێزانم و پێناسینی وەفاداری و سوپاسی بۆ عاملاندنی منداڵەکان و فێرکردنی زمانی کوردی و پاشان خۆ فێر کردنی نووسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی و چێکی و بولغاری ئەو نامانە بڵاو نەکەمەوە. ئەو نامانە بەرلە هەموو شت نموونەی پێوەندیی ژن و مێردێکن کە سەبارەت بە تێکۆشانی سیاسی و خزمەت بە گەل و نیشتمانەکەیان و تێکۆشان لە حیزبی دێموکرات دا، لە نیشتمانی خۆیان ئاوارە دەبن و لە بولغاریا دەگیرسێنەوە. نەک هەرئەوە بەڵکوو سەبارەت بە درێژە پێدانی خەبات و تێکۆشانی سیاسی لە حیزبی دێموکرات دا، ماوەی تیزیک دەساڵ لێک هەڵدەبڕێن و بە نامە و تەلەفون ئاگاداری ژیانی یەکتردەبن. ڕەنگە بۆ پیاوێک ئەوە زۆر گران نەبێ. بەڵام بۆ ژنێکی جوان و جحێڵ و غەریب لە وڵاتێکی ئورووپایی لە گەڵ دوو منداڵ، بێگومان ژیانێکی سەخت و دژوارە. بیرم لێکردەوە، گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە مەگەر تەنیا بە بڵاو کردنەوەی ئەو نامانە بتوانم تۆزکاڵێک پاداشی زەحمەت وخەم و خەفەتی تەنیایی و ئینسانیەت و میهرەبانی وئەمەکداری دایکی کەماڵ بدەمەوە. بە ڕاستی ئەگەر غیرەت و لێبووردوویی و ئیجازە و دڵسۆزی ئەو نەبایە بۆ گەل و نیشتمانەکەی، من نە دەمتوانی لە بوژاندنەوەی ڕێکخراوەکانی حیزبی دێموکرات دا خزمەتێکی بچوک بکەم و نە ئەو کەسەش دەبووم کە دە بەرگی بیرەوەرییەکانم بە تێکۆشان و سەربردەی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی ڕەش بکرێنەوە و یا لە بواری نووسین و تێکۆشانی ئەدەبی و ڕۆژنامە گەریی جۆر بە جۆر دا خزمەتێکی بچوک ئەنجام بدەم. خۆ ڕەنگە کوردی ئەو تۆش پەیدا بن بلێن:« ئەوە لە گەڵ خسڵەتی کوردەواری نایەتەوە» !بەڵام هیچ شتێ لەوە خۆشتر وباشتر نیە کارێکی خۆت بڕوات پێ هەیە و خۆت بڕیاری بۆ دەدەی، بیبەیە سەر

و ئەنجامی بدەی بەو مەرجەی زیانی بۆ خەڵکی دیکە نەبێ. مەرجیش نیە ئەوەی دەینووسی و دەیکەی بە دڵی هەموو کەس بێ. هەر ئەوە کە کارەکەت دەبێتە جێگای دم بە دمە و بیر و ڕای جیاواز، خۆی شتێکە و نرخی خۆی هەیە.

بڕیارەکەم لێبڕاو بوو. بەو مانایە بەر لەوەی بێمە سەر نووسینەوەی یاد داشتەکانم لە ساڵی ١٩٩٥وە نامەکانی باسکراو بێنمە سەر لاپەڕەی ئەم بەرگەی بیرەوەرییەکانم و ئەو نامانەشی لێ زیاد بکەم کە بە بۆنەی جۆر بە جۆرەوە لە لایەن دۆست و برادەر و ناسیارانەوە بۆم هاتوون. ڕەنگە تەمەنیش هەر ئەوەندە مۆڵەت و مەودا بدا. خۆ ئەگەر عزرائیل ئەوەندی پیاوەتی هەبێ وەک حکایەتی شێخی سەعدی مەو دابدا یەک دوو شتێتر بنووسمەوە، بۆ دەست ماچکردن دەبێ. دوور نیە، باعیزرائیلیش بێ، ڕەنگە ئەوەندە پیاوەتیەی هەر لە دەست بێ ،! چونکە خەڵکی تر هەیە بۆ گەیشتن بە بەهەشتی بەرین سەریان دێشێ و زۆریش بە پەلەن. من ماڵەکەی خۆم پێ لە بەهەشتی بەرین خۆشترە، با بچێ ئەوان بنێرێ.

لە سەیر کردنی نامە و نووسراوەکان دەر کەوت کە هەمووی نامەکان کۆ نەکراونەوە، چونکە من لە هەوەڵی ساڵی ١٩٧١ مناڵەکانم بە جێ هێشتوە و نێوە نێوە نامەشم بۆ نووسیون، بەڵام ساڵی ١٩٧٢ و ١٩٧٣ تەنیا نامەیەکی من و نامەیەکی مەلارەسوڵی پێشنماز یان لە نێو دابوو، منیش بە لە بەرچاو گرتنی تاریخی ساڵ و ڕۆژ دەیانکەمە پێشەنگی سەرجە نامەکان کە ڕەنگە کەمیش نەبن-:

**نامەی مەلا رەسوڵی پێشنماز بۆ خەجیجی حسامی :**

« بۆ خوشکی بە ڕێز و خۆشە ویستم براژنە خەجیج پێشکەش بێ. لە گەڵ سڵاو و جێژنە پیرۆزەی نەورۆزی پیرۆز هیوام خۆشی و بەختەوەریتانە و چاوی کەماڵ و شلێرێ ماچ دەکەم. دایکم و وەستا بەسێ زۆر سەلامتان لێدەکەن و مندالەکان بە تێکرایی هەواڵتان دەپرسن و بە دایم لە ماڵی ئێمە باس هەر باسی ئێوەیە. مام وەستا شەبۆلیش زۆر باشە و ماوەیەکە هیچ نەخۆش نیە. بەسێ ڕۆژێ هەر دەڵێ ئەو جوتە گونەت بە زارم. هەتا ئاواش بڵێ ئەتۆی وەبیر دێتەوە چونکە ئەو قسەت زۆر پێ سەیر بوو. براژن ئەوە هێندێک کەشکم بۆ کاک حەسەن نارد لە سەر داوای خۆی. دەشزانم زەحمەتەکە هەر بۆ تۆیە. تکایە

دوعای بە خێرمان زۆر بۆ مەکە. ئەوە کاک کەریم بە خۆی و سەیارە کوێتەوە هاتەوە جا دەبێ هاوین وەختی تەعتیلات بۆ ماوەی ٢ مانگ بێن دەنا ئەگەر کەمتربێ هیچ فایدەی نابێ. جا نازانم دەعوەتەکەی من و وەستابەسێش کەنگێ سەر دەگرێ بۆ ماڵی ئێوە. دەرمانەکانی کە بۆت نارد بوو نازانی چەندە باش بوو ئێستا هێندە جوان بوە هەر دەبێ بڵێم لە چاوی پیس بە دوور بێ بە یەکجاری لە ژن هێنانیش پەشیمان بوومەوە. وەستا بەسێ دەڵێ هەر چێک کە لێرە هەیە و لە وێ نیە ئەگەر پێویست بوو ئاگادارمان بکە ئامادەم بۆتان بنێرم. ئیتر بە کاک کەریمتان دەسپێرم. برات مەلا رەسول عبدالرحمان.١٩٧٢/٢/٢٠.

**نامەی من بۆ دایکی کەمال، ٧٣/١٠/٢٥**

خەجیج گیان ڕۆژ باش: چاوەکانت ماچ دەکەم. سلامەتی و خۆشی تۆم ئاواتە. دەمێکە لێتان بێخەبەرم. خەتی تەلەفون نەبوو. نامەشم نووسیوە، ڕێگا نەبوو. چابوو کاک ئەمیر هات. تەلەفونەکەی تۆ نیگەرانی کردم. نامەکەتم پێنەگەیشتوە. ئێستا زۆر نارەحەتم. بانامەکەت بێ بزانم بۆ چی داوات کردوە بگەڕێمەوە. مەسەلەی کەمالیم پێ ناخۆش بوو. دیارە ئەگەر من لە ماڵ نەبم، کەماڵ چاک ناخوێنێ. ئەگەر قەرار بێ بێمەوە، بۆم بنووسە چیتان دەوێ بۆتان بێنم. ئێستا حاڵم باشە. لە گەڵ سەید رەسول خانووم گرتوە و تەلەفونی هەیە و ئەوەش ژمارەکەیەتی(٧١٥٨٤١) قەرارە منەوەر سەری مانگ بگەڕێتەوە. کونیاکێک و دوو ڤۆدکام بۆ بنێرە. چاوە ڕوانی نامەکەت دەبم بزانم چی تێدایە. Ahoj Kerimito 25/10/73.

**تێبینی** : کاتی ساڵی ١٩٧١ گەڕامەوە بۆ عێراق، لە گەڵ دایکی کەماڵ قەرارمان دانا لە ئاخری هەموو نامەیەکدا وەک ڕەمزێکی نێوان خۆمان بنووسین(Ahoj) ئەم وشەیە لە چێکوسلۆڤاکیا وەک سلاو و خوا حافیزی لە نێوان دۆستی نیزیک و یار و کیژو کوڕی لاو دابەکار دێت و نیشانەی لێک نیزیکی و خۆشە ویستییە. بۆیە ئەویش و منیش هەمیشە بۆ دڵنیایی لە ڕاستی نامەکان ئەم وشەیەمان لە کۆتایی نامەکاندا نووسیوە

**نامەی کاک هاشمی کەریمی بۆ دایکی کەمالی نووسیوە، ٧٣/١٢/١٦**

خوشکە خەجیجی بەڕێز! دوای سلاو و ئەحواڵپرسی هیوادارم هەمیشە لە

خۆشیدا بن. ئەگەر لە ئەحواڵی ئێمە بپرسن، زۆر چاکین. برادەران هەموو سڵاوتان لێدەکەن و ئەحواڵتان دەپرسن. زۆر ئەحواڵی کاک کەمال و شلێر خانم دەپرسم. هیوادارم ئەوانیش ساغ و سلامەت بن و لە دەرس خوێندندا سەر کەوتووبن، کاک خالید و دادە زلیخا زۆر سڵاوتان لێدەکەن و عەلی و شیرین دەستتان ماچ دەکەن. ئیتر خوشیتان ئاواتمە . برات حەسەن.

**نامە بۆ دایکی کەمال - ٧٤/٢/٢٤**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. ئاواتمە بە خۆشی بژی. خۆت نارەحەت نەکەی. ئەگەر بچیە خەستە خانە، هەر بە ئادرێسی پۆست تێلگراف بکە. نامەکەت زۆر شادی کردم. نووسیوتە کەمال باش دەخوێنێ. پێم خۆش نەبوو نووسیوتە؛ تەلەفون بۆ جەوادی ناکەم. ( جەواد نوێنەری حیزبی تودە بوو لە بولغارستان) دەبێ بزانی( پیاو ئەگەر دەچالێ کەوت دەست دەکلکی سەگ دەگرێ) لام وایە هیچ عەیبی نیە ئەگەر تەلەفونی بۆ بکەی. دەنا خۆت دەگەڵ منداڵەکان بچۆ مەدرەسەی شوڕەوی. بلێ دەچمە کن مێردەکەم، دوو مانگ منداڵەکانمان بۆ ڕابگرن. بەڵکوو دوو مانگان بێیە کن من. ئێستا بە پەلە ئەم نامەیە دەنووسم. پاشان نامە بۆ منداڵەکانیش دەنووسم. مجەلەی فوتبوڵ وەگیر ناکەوێ بۆ کەماڵی بنێرم. ئاگات لێبێت با کەمال زۆر جوان فێری گیتار بێ. هەموو ڕۆژێ تەماشای دەفتەرەکەی بکە. ئەگەر تۆ سلامەت بی و کەمال باش بخوێنێ، من لێرە خەفەتم کەمتر دەبێ. ئەورۆ دوو بەستەم لە کتێبەکان پێگەیشت زۆر سوپاس. جارێکی تر چاوی خۆت و منداڵەکان ماچ دەکەم.
٧٤/٢/٢٤ Ahoj, kerimi to

**نامەی کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستان بۆ دایکی کەماڵ**

**حیزبی دێموکراتی کوردستان(ئێران) کومیتەی ناوەندی**

**ژمارە:٢٣٩**

**ڕۆژ: ١٩٧٤/٥/٨**

خوشکی بەڕێز خەجیجی حسامی ! سڵاوێکی گەرمی برایانەت پێشکێش دەکەین.

نامەی تاریخی ١٩٧٤/١/١٢ی تۆمان پێ گەیشت. زۆر سوپاست دەکەین و

پێمان خۆشە پێت ڕابگەیێنین کە کومیتەی ناوەندی داوای توی بۆ ئەندامەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان پەسند کرد. بەم جۆرە پیرۆز بابیت لێ دەکەین و هیوا دارین وەک خوشکێکی دڵسۆز بۆ بە جێگەیاندنی ئامانجەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان کە ڕزگاری و بەختەوەری گەلە زۆر لێکراوەکەمانە تێبکۆشی. داوای سەر کەوتنت بۆ دەکەین. کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستان. عبدالرحمانی قاسملو.

**نامەی کاک حەمەدەمینی سراجی بۆ دایکی کەماڵ- ١٩٧٤/٥/٨**

خوشکی بەڕێزم. پڕ بەدڵ سڵاوت دەگەیێنم و هیوامە هەر لە خۆشیدا بی. چاوی کەماڵ و شلێر ماچ دەکەم و داوای دەرچوونیان دەکەم. خوشکە خەجیج. ئەوا کاک کەریم دوای دوو سێ حەوتوو دوا کەوتن گەڕایەوە لاتان. بەخۆشی ئەو ماوەیەی کە لەوێ دەمێنێتەوە ڕایبوێرن و ئێمەش جارێ گەرمای ناخۆشی ئەمساڵ قبوڵ دەکەین و ئەگەر دەرەتان بوو هەر چەند بۆ ماوەیەکیش بێ خۆ لە گەرمای ئێرە دەشارینەوە. ئەم ساڵ هاوین نەهاتوە بەڵام گەرمای ئێستا لە گەرمای هاوین دوا ناکەوێ. جا بەو پێیە بەهار وابێ، هاوین دەبێ چۆن بێ؟

ڕووناک زۆر هەواڵت دەپرسێ. ئێستا لە نەخۆشخانەیە. پاش نارەحەتیەکی زۆر کچێکی بوە، ناومان ناوە« موژدە» هیوامانە موژدە، موژدەی سەر کەوتن بێ. دەی خوشکە خەجیج هەرلێمان ناپرسی خۆ تۆ بۆ نامە نووسین وەختێکی زۆرت هەیە. لە زمان منەوە گەلێک لە دۆڕە و سامی بپرسە، هەر وەها لە ئاغای دانیش و جیرانەکانت. پیرۆز بایی ئەندامەتی حیزبت لێدەکەم و لە مەش بە دوا دەبێ مانگانەی ئەندامەتیت لە بیر نەچێ بۆمان بنێری. براژن ! بە کاک کەریم دا بڕێکم حەریر بۆ ناردی بۆ کراس. نازانم بە دڵت دەبێ یان نا! سەلیقەم ئەوەندەی بڕ کرد. بۆ دوکتۆرە ژنە باشەکەی کە ددانمان لە لای کێشا، پەپولەیەکم نارد. تکایە زۆری سڵاوی بگەیەنە و لە گەڵ کاک کەریم ئەگەر ڕێگاتان دەوێ کەوت ئەو دیاریە چکۆڵەشی بدەنێ. ئیتر خۆشی و سەر کەوتنتان. برات محمدامین ١٩٧٤/٥/٨

**نامە بۆ دایکی کەمال - ٧٤/٩/١٧**

خەجیج گیان شەو باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. ئەو شۆ نامەو فۆتۆ ئاپەڕاتەکەم وەر گرت. زۆر سوپاس. نامەی منداڵەکانیش چاویان روون کردمەوە. منداڵەکان داوای دووچەرخەیان کردوە. پەرۆشی دراوم نیە. بەڵام دەترسم ئەگەر دوو چەرخەیان هەبێ، وەماڵێ نەکەونەوە. پەکی دەرسیان بکەوێ. زۆرم پێخۆشە ئەگەر رازیان بکەی ئەوساڵ دوو چەرخە نەکڕن. کێشەی دەکەن، دەچنە دەرێ، تۆش نیگەران دەبی. ئەگەر هەر پێت خۆشە بۆیان بکڕە.

خەجیج گیان! کەمال دەبێ بچێتە گیتاری. ئەو ساڵ دەرسی زۆرە، دەبێ زۆر خەریک بێ. خوشکە بسێ ژنی مەلا رەسوڵ لێرەیە. نەخۆشە. زۆر سڵاوت لێدەکا. برادەران هەموو سڵاوت دەگەیێنن. ئێمە جارێ باشین. هێشتا نازانین چۆن دەبێ. ئێستا هەموومان پێکەوە دەژین. کەسم پەیدا نەکردوە شالوار بۆ کەمالی بنێرم. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. نامەیان بۆ دەنووسم. ئیتر خۆشی تۆم ئاواتە. Ahoj, kerimi to ١٩٧٤/٩/١٧

**نامە بۆ دایکی کەمال، ٧٤/١٠/٥**

خەجیج گیان رۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوام وایە ساغ و سڵامەت بی. من حاڵم باشە. تەنیا دەفیکری تۆ دام و تەنیایی تۆ نارەحەتم دەکا. تا ئێستا هیچ نامەی تۆم پێنەگەیشتوە. زۆر نیگەرانم. ئەورۆ پێنجی مانگ بە هۆی چیچۆدا کارتێکی جوانم بۆ ناردی. نامەیەکم بۆ کاک رەحمانی( د.قاسملو) نووسیوە دەگەڵ کارتەکەی تۆ لە پاکەت دایە. تکایە زوو بۆی بەرێ بکە. دوو قەبزە بۆی بنێرە. دوو شاڵوارم بۆ شلێر و کەمال نارد، هیوام وایە بە کەیفێیان بێ. ئێمە حاڵمان باشە جارێ ناخۆشیمان نەهاتۆتە پێش. ئەو رۆژانە سەفەری سەرێ دەکەم بۆ سەردانی برادەران ئەگەر گەڕامەوە نامەت بۆ دەنووسم. خەجیج گیان ! هەر لە ئێستاوە دە فیکری ئەوە دابە کەسێک پەیدا بکەی ئاگای لە منداڵەکان بێ، تۆ بێی سەرێکی من بدەی. بۆ مانگێکیش بێ هەر باشە، نازانم کەمال چۆن دەخوێنێ؟ بۆم بنووسە بزانم دەچێتە گیتار یان نا؟ دەفتەرم بۆ منداڵەکان ناردوە، نازانم گەیشتوون یان نا؟

خەجیج گیان! خۆت نارەحەت مەکە. دەگەڵ منداڵەکان هەموو یەک شەمۆیان بچۆ سینەما و بچۆ دەرێ. زۆر خەریکی دەرسەکانت بە، ئەوە مامۆستا هێمن

کتێبی « تاریک و روون» شیعرەکانی خۆی بە دیاری پێشکێش کردووی بۆت دەنێرم ، زۆریان بخوێنەوە. ئەگەر حەسەنی برات نامەی نووسی خەبەرم بدەیە. بە بۆنەی ڕۆژی لە دایک بوونت پڕ بەدڵ پیرۆز بایبت لێدەکەم. جارێکی تر چاوت ماچ دەکەم. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. ٧٤/١٠/٥ kerimi to Ahoj

**نامە بۆ دایکی کەماڵ - ٧٤/١٠/١٠**

خۆشە ویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش! جارێکی دیکەش پربە دڵ ڕۆژی لە دایکبوونت پیرۆز بایی پێدەڵێم. دوای زۆر چاوەڕوانی ئەورۆ دەی مانگ نامەکەی تۆم پێگەیشت. چاوم ڕووین بۆوە. زۆر شــاد بووم چەند ڕۆژ بوو زۆر نیگەران بووم. هەر نامەت نەدەهات. من چوارنامەم بۆ نووسیبووی. جاریّ حالّم باشە. هەمووما ن سلامەتین و کار و بارمان باشە. کارم زۆرە. نەمتوانیوە بچمە بازاڕ و شەڵوار بۆ کەمالی بکڕم.

خوشکە بەسێ چاک بۆتەوە ونادرمانەوە سەرێ. زۆر سلاوی لێدەکردی. ماڵی خوشکە شەمێ زۆر سلاوت لێدەکەن.

خەجیج گیان! نامەکەت زۆر جوان و بێ خەلەت نووسیوە. هیوام وایە زۆرتر بنووسی و بخوێنییەوە. شیعرەکانی مامۆستا هێمن بخوێنەوە. زۆر خەریکی دەرسەکانت بە. هەموو ڕۆژێ یەک دوو سەعات بخوێنەوە. فۆتۆ ئاپەراتەکەم پێگەیشت. زۆر سوپاس. ئەنگوستیلەیەکم بۆ کڕیوی، با لە ژیانت دا تۆش ئەنگوستیلەیەکی جوانت هەبێ. کچی چیچۆ لێرمیە بۆت دێنێ.. تکایە دەگەڵ شلێر بچۆ کن دیرێکتۆری مەدرەسە و داوای لێبکە بەڵکوو بۆ دوو مانگ شلێرێ ڕابگرن. ئەگەر نەبوو با«لێلە ئێمی» ئاگای لە منداڵەکان بێ، تۆ لانی کەم مانگێک بێیە ئێرە. لەمەو دوا هەوای ئێرە خۆش دەبێ. زۆر ئارەزووت دەکەم. لە سەر کەمالی هیچت نە نوسیبوو. تۆ دەزانی هەموو فیکر و خەیاڵم خوێندنی کەماڵە. دەمەوێ تۆ لێی ڕازی بی. نامەی کاک رحمانی تکایە گیر مەکە و زوو بۆی بنێرە. جارێکی تر چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوام وایە بە سلامەتی و بە خۆشی بژی. زوو نامەم بۆ بنووسە. سلاوی کاک حەسەنی دەگەیێنم. ئاگات لە کاک حەسەنی بێ، فەقیرە کەسی دیکەی نیە. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. ٧٤/١٠/١٠ Ahoj , kerimi to

**نامە بۆ دایکی کەمال- ٧٤/١٠/١٦**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش! ئەم نامەیە دەست بەجێ بۆ کاک ڕحمانی بنێرە. هیوادارم بە سلامەتی و سەر بەرزی بژی. نامەی تۆ و منداڵەکانم پێگەیشت. زۆر شاد بووم. من حاڵم باشە. جارێ لە گەڵ ئەوانەی ئێرە نێوانمان تێک نە چوە. بەڵام وەزعی سەرێ هەر چەندی بڵێی ناخۆشە. کوردستان وێران کراوە. چۆل بوە. شەڕ زۆر توندە. نەتەوەکەمان توشی ڕۆژێکی ڕەش هاتوە. لەو دنیایە کەس باسی ناکا و لە سەری وەدەنگ نایە. برادەرانی ئێمە جارێ حاڵیان باشە. دەستیان لێ نەدراوە. ماڵە خوشکە شەمێ زۆرت لێ دەپرسن. ئەو قایشە سەیفی بۆ کەماڵی ناردوە. بەڵکوو ئەو ژنەی ماڵ بۆ کاک حەسەنی خاوێن دەکاتەوە، مانگێک ئاگای لە منداڵەکان بێ، زۆرم پێخۆشە بۆ مانگێک بێیە لام. بە ڕاستی دووری لە تۆ و تەنیاییت زۆری نارەحەت کردووم. تکایە زوو زوو نامەم بۆ بنووسە. خۆت نارەحەت مەکە. ژیانی ئێمە وای لێهاتوە و نازانم چۆنیش دەبێ. ئەو شەڕە کوردستان لە بەین دەبات و ئێمەش چارە نووسمان ناڕوونە.بە خۆشی بژی. چاوی منداڵەکان ماچ دەکم.toA to. kerimi ٧٤/١٠/١٦

**تێبینی:** لەو نامانەدا لە هەر شوێنێ ناوی کاک ڕحمان هاتووە، مەبەست دوکتۆر قاسملوە.

**نامە بۆ دایکی کەمال ٧٤/١٠/٣٠**

خەجیجی خۆشەویستم ڕۆژ باش. چاوەکانت ما چ دەکەم. نامەکەی بە کچی چیچۆدا نارد بووت، دوێنێ بۆی هێنام. ئەورۆش ئەو نامەیە گەیشت کە بە پۆستەدا نارد بووت. چاوم ڕوون بۆوە. زۆرم پێخۆشبوو کە لێلە ئێمی ئاگای لە منداڵەکان دەبێ. چەند خۆشحاڵم کە دێی سەرم دەدەی ئەگەر بتوانی ١٦ی مانگی ١١ بێی، تا سەری ساڵی تازە لەلای من بی. ئەگەر دەشزانی منداڵەکان دەحاوێنەوە تا وەرەز دەبی لێرە بە. دەشزانم لە کن من وەڕەز نابی. دەچینە کوردستانیش سەری برادەرانی سەرێ دەدەین. هەرچەند بە داخەوە کوردستانەکە بەرەوکاول بوون دەڕوا و میللەتەکەمان تووشی بەلایەکی

سامداربوە. هەر لە ئێستاوە پاسپۆرتەکەت بدە باڤیزای هاتنە دەرت بدەنێ. ئەگەر هاتی دوو بوتڵ ویسکی بێنە. سیغارێکی رۆسمەنی پانیش بۆ من بکڕە. ئەگەر پارەت هەبوو، دوو کیلۆ پەنیر و شوشەیەک هەنگوین بێنە.

ئەو پاکەتە دەستبەجێ دوو قەبزە بۆ کاک رحمانی بنێرە. چاوە ڕوان دەبم زوو خەبەرم بدەیەی و زوو بگەیە لام. ئەگەر حازر بووی تێلگراف بکە تا بلیتت بۆ بنێرم. خوشکە شەمێ دەڵێ: قابلەمەیەکی زوو گۆشتی بکڵێنێ، بۆم بێنێ. لە مەتار شوشەیەک نیسکافە بکڕە زۆر سلاو بۆ کاک حەسەن و چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. خۆشی تۆم ئاواتە.ahoj kerimi to

**نامەی سەید رەسوڵی بابی کەمورە ی بە ناحەق شەهید کراو بۆ دایکی کەماڵ: ١٩٧٥/١/٢٧**

بەڕێز خوشکی بە ترخ، براژنە خەجیج. دەگەڵ زۆر سلاوی دوو قوڵی هیوامان وایە هەر شاد وکەیف ساز بی و دڵتەنگ نەبی. براژن ئێستا کە کاک کەریم وا لە کۆیە میوانی ئامانە خانە و منیش هەر میوانم، زۆرمان یادی تۆ کرد و زۆریش بە خۆشی ڕامانبوارد. هیوامان وایە دەگەڵ ئێوە خۆش بین. ئامانە خان ئەمنی کردۆتە وەکیل لە جیاتی ئەویش بۆت بنووسم. حاڵ و ژیانی منداڵەکان زۆر باشە. لە کاک کەریم بپرسە. چونکە دەزانم زۆرت مەبەستە ئامان و منداڵەکان باش بن، منیش چش. ئامان زۆر سلاوت لێدەکا، چاوە جوانەکانت ماچ دەکا. پڕ بە دڵ ئاواتە خوازی دڵخۆشیتە. ناشزانم بەو زوانە قەت چاومان پێت دەکەوێت یان تازە لە یەکتر دیدار ئاخرەت دەبین. لە بەر پەلە پەلی کاک کەریم و بارانە خۆشم نەمزانی چۆنم نووسیوە هەر بە خۆشی بژین. کۆیە. سەید رەسوڵ . ١٩٧٥/١/٢٧

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ٧٥/٢/٧**

خەجیجی خۆشە ویستم ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە خۆشی و سلامەتی و سەر بەرزی بژی. نامەکەت چاوی ڕوون کردمەوە. دەمێک بوو چاوم لە ڕێگا بوو. رەسمەکانیش گەیشتن، زۆر جوانن. ئەو پێرە گورگە چیە لە کن خۆت ڕاگرتوە، پیاو لێی دەترسێ. نازانم بۆ چی لە کەمال ڕازی نی؟ ئەوە

نامه‌م بۆ نووسیوه. له کن خۆت پێی بخوێنه‌وه. زمانی که‌مالی بدۆزه‌وه. قسێکی پێت گوت، قسه‌ی خۆت به‌ره سه‌ر، لێی قبوڵ مه‌که. ئه‌وه چیه نووسیوته لێم وه‌ڕمز بووی. له به‌ر منداڵه‌کان نه‌بایه چۆن ده‌مهێشت بچیه‌وه. به ته‌نیا ئه‌وه قڕده‌بم. ده‌زانی منداڵه‌کان له ته‌مه‌نێک دان، ئه‌گه‌ر چاوی تۆیان لێ دیار نه‌بێ، خۆت نه‌یانعاملێنی، نازانم ده‌بنه چی. ده‌بێ منداڵه‌کانمان له کوردایه‌تی نه شۆڕێن. ئه‌وه‌ش به بێ تۆ ناکرێ. ئه‌گه‌ر وانه‌بێ ، من ژیانی به بێ تۆم بۆ چیه. ئێستا ده‌م زۆر ناڕه‌حه‌ته. قه‌راره بچمه خه‌سته خانه و عه‌مه‌لی بکه‌ن. ئێمه چاری حاڵمان باشه. ده‌ستیان لێ نه‌داوین. براده‌ران هه‌موو سڵاوت ده‌گه‌یێنن. ڕحمان هیچی نه‌کردوه، تۆ و کاک حه‌مه‌ده‌مین لێتان تێک داوه. ئێستا بۆته سه‌ی تفه‌نگێ، ناوێرێ ڕوو ده‌وتکات. چه‌ند ڕۆژ بوو خه‌ریک بووم ته‌له‌فون بکه‌م خه‌ت نه‌بوو ئه‌و نامه‌یه خێرا بۆ کاک ڕه‌حمان بنێره. کاک ڕه‌حمان ئه‌وه دوو جاره ده‌نووسێ و داوای کردوه بۆ لای ئه‌و سه‌فه‌ر بکه‌م. ئه‌گه‌ر براده‌ران پێیان باش بێ و لێره ڕێگا بده‌ن ئه‌و ده‌م له وانه‌یه سه‌رێکی ئێوه‌ش بده‌م.

خه‌جیج گیان ! زوو زوو نامه‌م بۆ بنووسه. خۆت ناڕه‌حه‌ت مه‌که. ده‌گه‌ڵ منداڵه‌کان بچۆ سینه‌ما، بچۆ ده‌رێ، ڕۆژی یه‌کشه‌مۆیان بچنه ڤیتوشا. که‌ماڵ ده‌بێ زۆر خه‌ریک بێ، ئیجازه‌ی مه‌ده زۆر بچێته ده‌رێ. ماڵه خوشکه شه‌مێ زۆر سڵاوت لێده‌که‌ن. به خۆشی بژی. چاوی منداڵه‌کان ماچ ده‌که‌م. Ahoi, kerimi to ٧٥/٢/١٤

**نامه‌ی دایکی که‌مال بۆ من - ٧٥/٢/٢٠**

که‌ریم گیان ڕۆژ باش. هیوادارم ساغ و سڵامه‌ت و به که‌یف خۆشی بژی. هیوادارم له ژیانت دا دڵشکاو وخه‌مبار نه‌بی. نامه‌که‌تم پێگه‌یشت، زۆر سوپاست ده‌که‌م. ئێمه‌ش حاڵمان باشه. که‌مال چاک ده‌خوێنێ. نووسیوته جارێ وه‌زعمان نه‌گۆڕاوه. وانیه. حیزبێکی ئه‌گه‌ر نه‌توانێ ڕۆژنامه‌ی چاپ بکا و نه توانێ ته‌بلیغات بۆ میلله‌ته‌که‌ی خۆی بکا، چۆن وه‌زعی نه‌گۆڕاوه. کاک حه‌سه‌ن ده‌چێته ئه‌ڵمانی، کاک عه‌لی لێره‌یه له جیاتی ئه‌و کار ده‌کا، شته‌کانم پێگه‌یشت زۆر سوپاست ده‌که‌م، که‌ریم گیان هیچ به پۆسته‌دا مه‌نێره. به‌شی کۆتێک مه‌خمه‌ری که‌سک بۆ که‌مالی بکڕه. سێ نامه‌ی تۆم به یه‌ک ڕۆژ

پێگەیشت. کاک رحمان تەلەفونی بۆ من کرد، دەیگوت پارەم وەر گرتوە یان نا. منداڵەکان حاڵیان باشە. من حاڵم باش نیە . دەبوایە رۆژی شەشی مانگ بچمە مەریزخانە. بەڵام لە بەر منداڵەکان نەچووم. زۆر سڵاو لە هەموو برادەران دەکەم. هیوادارم بە ساغ و سڵامەتی بژین. زۆر سڵاو لە خوشکە شەمێ و کاک رەحمانی دەکەم. کەریم گیان بوردەی مانگی ١٠ و ١١ دەم بۆ بکرە. هەر بژی بەخۆشی و بە سڵامەتی -. Ahoj_ tvuje Cha didj .20/2/75

**نامە بۆ دایکی کەماڵ - ٧٥/٣/١٤**

خۆشە ویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش ! چاوەکانت ماچ دەکەم. لە دووری تۆ هەراسانم. نازانم کەنگێ چاوم پێت ڕوون دەبێتەوە و لە ئامێزت دا دەحەسێمەوە. بە قەت هەموو دنیا بە ئاوات بووم بۆ نەورۆز بێمەوە و لە گەڵ ئێوە جێژنە بکەم. بە داخەوەئێستا دەرەتانی گەڕانەوەم نیە. تۆ نیگەران مەبە. زۆر لە مێژە داوای ڤیزام کردوە. وەڵامان نیە. ئێستا وەزعەکە گۆڕاوە. ڕێگامان نیە بۆ سەردانی برادەران بچینە کوردستانیش. بەعس لە سەر حیسابی میللەتی کورد لە گەڵ ئێران ڕێک کەوتوە. بە ئێمەیان ڕاگەیاندوە نابێ هیچ تێکۆشانمان هەبێ و نابێ بچنە کوردستانیش. بڕیار وایە ئەگەر ڤیزام بدەنێ، بچمە بێروت و لە وێڕا بچمە یەمەنی دێموکڕاتی، جا پاشان بۆ دیتنی کاک رەحمان بێمە ئوروپا. هیوادارم بە دیداری ئێوەش چاوم ڕوون بێتەوە. ئەوە هەر هیوایە و نازانم چۆن دەبێ. تۆ خۆت نارەحەت مەکە، زوو زوو نامەم بۆ بنووسە. لە نامەی پۆستەدا باسی سیاسەت مەنووسە. بە ڕێگای خۆماندا هەموو شت بنووسە. ڕێگایەکی ئەمینە.

دوو مجەلەی فوتبالم بۆ کەماڵی نارد لە گەڵ تەقویمێکی ژاپونی. تەلەفونم کرد هیچتان لە ماڵ نەبوون، ڕەنگە چووبنە کن کاک حەسەنی. نازانم پارچەی کۆت و شاڵواری کەماڵت کڕیوە و بۆت بەدروون داوە یان نا؟ کەماڵ بۆ ساڵێکی دیکە لیباسی جوانی دەوێ، دەبێ دەستێک کۆت و شەڵواری جوانی بۆ ساز کەی. تکایە ئەم نامەیە هەر دەست لەجێ بۆ کاک رەحمانی بنێرە. زۆر بە پەلەیە. ئامانە خان لێرەیە. کوڕەکەی لاقی شکاوە، زۆر سڵاوت لێدەکا. نامەکەم درێژ بوو. دەمەوێ زۆرتر قسەت لەگەڵ بکەم. بەڵام دەبێ نامەکە بگەیێنمە چیچۆ.

هیوا دارم چاو و دڵم پێتان ڕوون بێتەوە. جارێکی تر چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم. لە باتی من منداڵەکان ماچ کە. Ahoj , kerimi to _ 14/3/1975

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ٧٥/٤/٤**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. ئەورۆ چواری مانگ تەلەفونم بۆ کردی لەماڵ نەبووی. زۆر نیگەران بووم، هیوام وایە سلامەت و بێ دەرد و بەلابن. نامە کورتەکەی کاک ڕەحمانم پێگەیشت، تکایە کورج ئەو نامەیە بۆ کاک ڕەحمانی بنێرە، نووسیبووت وەزعی خۆمانت بۆ بنووسم، دڵم نایە وەزعی پەرێشانی کوردستانت بۆ بنووسم. میللەتەکەمان لە عێراق لە وەزعێکی دژوار دایە.ئێمە تا ئێستا وەزعمان ڕوون نەبووە. هەوەڵی مانگی چوار بانگیان کردین و گوتیان وەک جاران پێوەندیمان بەر قەرار دەبێ و با برادەرانتان هەر لە شوێنی خۆیان بمێننەوە. ئەگەر هەروا بمێنێ باشە. تۆزێ هاتووینەوە سەر خۆ. برادەران هەموو سلامەتن. نووسیبووت لە وێ مەبن باش نیە. تۆش هەر وەک کاک رحمان دەڵێی لە وێ مەبن. کاک ڕەحمان خۆی لە پراگ مات کردوە و برادەری بە جێهێشتوون و دەتووسێ لە وێ مەبن. باشە، لە کوێ بین، چ دەوڵەتێکی دیکە ڕامان دەگرێ و یارمەتیمان پێدەکا؟ ئەو هەموو برادەرانەی حیزبی بێکار و برسی چییان لێبکەین؟ خۆ مەسەلە هەر ئەمن نیم. من دەتوانم بێمەوە، بەلام ئەدی ئەو برادەرانە چبکەن؟ من چۆن دەتوانم لە کاتی تەنگانەدا برادەران بە جێ بێڵم و بێمەوە ئوروپا وەک کاک رحمان خۆ لە ئوروپا قایم بکەم و لە دوورەوە فەرمان بدەم؟ دەزانم تۆ تەنیای، بێکەسی. بەلام ئەو برادەرانەش حاڵیان باش نیە. ئێستا مانەوەمان لێرە لە هەموو شوێنێ باشترە ئەگەر دەستمان لێنەدەن و هیچمان دژی شۆرشی کورد و بارزانی پێ نەنووسن. بڕیارمان داوە دژی بارزانی و شۆرشی کورد هیچ نە نووسین ئەگەر توشی دەردە سەریش بین. بۆیە دەڵێم باشترە، چونکە جێگای دیکەمان نیە. کوردەکانی دەگەڵ شۆرش بوون، وا وردە وردە دەگەڕێنەوە. بەلام دوا ڕۆژیشیان ڕوون نیە. ئێمە ئێستا دەبێ قازانجی حیزبی خۆمان لە بەر چاو بگرین. لە بیرت ماوە کە دەمگوت کوردەکانی عیراق بە هەڵە چوون و بە قسەی شای ئێران شەڕ دەکەن و توشی شکان دەبن. ئەو دەم کاک رەحمان سیاسەتی وانی تەئید

دەکرد. ئەوان بە قسەی ئێران توشی چارە ڕەشی بوون. خەجیج گیان! دەرد و داخ زۆرە. تۆ خۆت نارەحەت مەکە. تێکۆشانی سیاسی ئەو قۆرتانەی لە پێشە. هیچ ناکرێ. هیوادارم دڵشکاو نەبی. منداڵەکان وەک خۆت بەعاملێنی و پەروەردەیان بکەی. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم.

4/4/75_ Ahoj , kerimi to

**نامە بۆ دایکی کەماڵ - ١٩٧٥/٤/٢٦**

خۆشە ویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش ! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە سلامەتی و بە خۆشی لە گەڵ منداڵەکان ژیان بەریە سەر و قەت دڵشکاو نەبی. من حاڵم باشە، واتە نەخۆش نیم. بەڵام خەمی دووری ئێوە و بار ودۆخی خەفەتباری ئێرە و لێقەوماویی براکوردەکانی عیراق، خۆشییان بۆ نەهێشتووم. لە هەوەڵی مانگی مارسەوە پاسپۆرتم داوە کە ڤیزام بدەنێ سەفەر بکەم. تا ئێستا جوابمان نیە. نەک هەر جوابی پاسپۆرت نیە، بەڵکوو هەموو کارێکمان پەکی کەوتە. هیچمان بۆ ناکرێ. دوا ڕۆژیشمان ڕوون نیە. برادەرانی سەرەوە جارێ هەر لە جێی خۆیانن. بەڵام مەعلوم نیە دوایە چۆن دەبێ. ناتوانین چاومان بە کەس بکەوێ کە قسەی دەگەڵ بکەین. لە بارودۆخێکی ئاوادا من ناتوانم برادەران بە جێ بێڵم. برادەران بڕیاریان داوە سەفەر بکەم، بەڵام کەنگێ ڕێگام دەدەن، نازانم. ئێوە خۆتان نارەحەت مەکەن، نیگەران مەبە، هیچ ناکرێ. دەبێ چاوەڕوان بین بزانین چۆن دەبێ. هیوادارم منداڵەکان باش بخوێنن. زۆرت ئاگا لێیان بێ. مەهێڵە بە خۆڕایی بسوڕێنەوە. خۆت لە ژووریدا حەپس مەکە. بچۆ دەرێ، بچۆ سینەما. ئەگەر پارەت نەبوو شتەکانت بفرۆشە. ئەم نامەیە خێرا بۆ کاک رەحمانی بنێرە. ئەگەر نامەی ئەو هات بە کچی چیچۆدا بۆم بنێرە. نامە و ڕەسمەکانم پێنەگەیشتوون. بچوو لە پۆست داوایان بکەوە. کەماڵ بە تەلەفون داوای شتێکی زەردی کرد، حاڵی نەبووم. بۆم بنووسە بزانم چی دەوێ.

خەجیج گیان ! خەریکی خوێندن بە. وەختت زۆرە. زوو زوو نامەم بۆ بنووسە با لێتان بێخەبەر نەبم. برادەران هەموو سڵاوت پێدەگەیێنن. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم، خۆشی تۆم ئاواتە. Ahoj, kerimi to 26/4/75

**نامەی دایکی کەمال بۆ من ، ٧٥/٥/١**

کەریم گیان ڕۆژ باش. هیوادارم ساغ و سلامەت و کەیف خۆش بی. ئێمە حاڵمان باشە. کەریم گیان دوو نامەی تۆم پێگەیشت. زۆر سوپاست دەکەم. بە ڕەفیقی دۆڕەدا نامەم بۆ ناردی دەگەڵ نامەی کاک رەحمانی. کەریم گیان کەمال سەگی کڕیوە زۆر جوانە، وەک گورگی دەچێ، ٤٠ ڕۆژە لە دایک بوە. کەمال چاک دەخوێنێ. دەچێتە دانیشگا، کاک حەمە کەریم بۆی جێبەجێ کردوە.

خۆشەویستم کەریم نامەی حەسەنی برام پێگەیشت. بەلام بەداخەوە زۆر کەمی لێ حالّی بووم. کەریم گیان دەبێ بۆم تەرجومە بکەی، بە کوردی بۆم بنێریەوە هەرچی تێیدابوو چاک یان خەراب. زۆر سوپاست دەکەم. کەریم گیان بلوزی پارچەم بۆبکڕی. قەولت پێدا بووم. لیمۆ عەمانی و شوشێک عەمبەمان بۆ بنێرە. کەریم گیان جێژنی کرێکارانت لێ پیرۆز بێ، هیوادارم جێژنی کرێکاران بەختەوەری و سەرکەوتن بێ بۆ میللەتەکەمان. سلاو لە هەموو برادەران دەکەم، هیوادارم هەموویان ساغ وسلامەت و کەیف خۆش بن. ئیدی بە خۆشی و بە سلامەتی بژی. Ahoj خەجیج . ٧٥/٥/١ ئەوەش نامەی کەماله بۆی نوسیوی. ( نامەی کەماڵی بە ڕووسییە و بە پێویستم نەزانی چاپی بکەم.)

**نامەی کاک حەمەدەمینی سراجی بۆ دایکی کەمال- ٧٥/٥/١٢**

خوشکە خەجیجی خۆشە ویست. سلاو لە خۆت و لە کاک حەسەن هیوامە هەر لە خۆشی دابن. چاوی کەمال و شلێر ماچ دەکەم و بە ئاواتی سەر کەوتنیانم لە خوێندن و ژیاندا. چاوم بە ڕەسمە جوانەکانتان کەوت. دیارە هەر لە سەر ڕژیم دەڕۆن و شوکر بە کەیفن. بە کەیفی ئێوە و زوو زوو نامە نووسینی ئێوە دوو قازانجی هەیە، یەکێک بۆ کاک کەریم بە تەنیایی و یەکێکیش بۆ دۆست و برادەرانی. جا بە تایبەتی ئەو نامانەی باس وخەبەری خۆشی و سلامەتی ئێوەی تێدا بێ، هەموومان دەخاتە خۆشیەوە.

خوشکە خەجیج داوامە بۆ مەسەلەی چەمەدانی ژنی دوکتور مراد تۆش لە گەڵ کاک حەسەن و کاک حەمە کەریم هەڵپێچن بۆ ئەوەی بەڵکوو بتوانی بۆمان ڕەوانە کاتەوە. نازانی کچە دوکتۆرەکەی زۆر خزمەتی نەخۆشەکانی ئێمە دەکا

و ئێمەش با ئەو چاکەیەمان بۆیان ببێ. ئیتر شـادی و سەر بەرزیت بە ئاوات دەخوازم . برات مینە ١٢/٥/ ١٩٧٥

**نامە بۆ دایکی کەمال - ٧٥/٥/١٢**

خۆشە ویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم لە دەرد و بەلا بە دووربی. دەگەڵ منداڵەکان بە خۆشی بژی. دوێنێ بە کچی چیچۆدا نامەیەکم بۆ ناردی، نامەی کاک رەحمانیشی لە گەڵبوو، هیوام وایە بۆت ناردبێ. کوتو پڕ زانیم کە دۆرە دێتەوە. ئەو نامەیەم بۆ کاک حەسەنی نووسی، بیدەیە. ئێمە حاڵمان هەر وەک خۆیەتی. جارێ هیچمان لێ مەعلوم نەبوە. لە وانەیە لەم ڕۆژانەدا شتێکمان لێ ڕوون بێتەوە. ئەگەر ڕێگای هاتنە دەرم بدەن، دێمەوە تا چاوم بە دیدارتان ڕوون بێتەوە، ئێستا زۆر بیرتان دەکەم. لە دووریتان هەراسانم. برادەران زۆر سڵاوت لێدەکەن. ماڵی خوشکە شەمێ سڵاویان هەیە. ئەو قاحبە دایکە نەی وێرا نامەت بۆ بێنێ، بۆیەمە بیناسی.! بۆم بنووسە منداڵەکان بۆ هاوینێ چیان دەوێ. منداڵەکان لە جیاتی من ماچکە. جارێکی دیکەش ماچت دەکەم. بە خۆشی بژی. Ahoj, kerimi to _ 12/5/ 75

**نامە بۆ دایکی کەمال. ٧٥/٥/٢٤**

خۆشە ویستم خەجیج گیان! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە خۆشی و سەر بەرزی بژی. دڵشکار نەبی. ئەو حەوتوەش نامەت نەهات. زۆر چاوە ڕوان بووم. ئێمە حاڵمان باشە. ئێستا قەرار وایە پاسپۆرتەکەم بدەنەوە. ئەگەر وابێ، برادەران بڕیاریان داوە سەفەر بکەم. هیوادارم بە دیدارتان چاوم ڕوون بێتەوە. نازانم بۆ ڕۆژی لە دایکبوونی شلێرێ دەگەڕێمەوە یان نا. ئەو بلوزە جوانە مەلا رەسول بۆی کڕیوە بۆم نارد. کراسێکیشم بۆ کەماڵی نارد هیوا دارم پێی جوان بێ. من بۆ چەند ڕۆژێک دەچمە کوردستـان سەری برادەران دەدەم. پاشان ئەگەر پاسپۆرتەکەم ساز بوو، دەچمە بێروت، تەلەفونت بۆ دەکەم. بە کچی چیچۆدا نامەم بۆ بنووسە، بزانم چیتان دەوێ. هیوادارم منداڵەکان بە سەر کەوتوویی مەدرەسە تەواو بکەن. نامە بۆ کاک ئەمیر بنووسە ئەگەر دەتەوێ با کەماڵ بۆ مانگێک بچێتە لای ئەو. ئەگەر نەچێ، بافیکری ئەوەی بکا، هاوینێ

مانگێک کار بکات. چاوە ڕوانی نامەت دەبم. وابزانم دوا نامەت دەبێ. هیوادارم بە زوویی چاوم پێتـان ڕوون بێتـەوە و لە ئامێزت دا بحەسێمەوە. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. Ahoj , kerimi to 24/5/75

**نامەی مەلا عەوڵای حەیاکی بۆ دایکی کەمال ٩٧٥/٨/٨**

خوشکی بە ڕێز و خۆشەویست براژنە خەجیج لە گەڵ سڵاوێکی گەرمی برایانە لەو کاتەدا کە بەرەو ماڵ دەگەڕێمەوە، دەمەوێ بەو بۆنەوە گەرمترین ڕێز و سوپاسی خۆمت پێشکەش بکەم بەرامبەر ئەو هەموو خزمەت و میوانداری یە کە بۆ منت بە کار هێنا. هیوادارم هەر خۆش بی و خوشکی وەک تۆمان زۆر بێ. برات عبدالله حسن زادە ٩٧٥/٨/٨

**نامە بۆ دایکی کەمال - ٧٥/١١/١٥**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە سڵامەتی لە مەریزخانە هاتبیە دەر و نەخۆشیەکەت دوایی هاتبێ. نامەکەت چاوی ڕوون کردمەوە. دەزانی نامەکەی بە زمانی چێکیت نووسیبوو، خەڵەتی زۆر بوون. ئەوەی کوردیت هەڵەی نەبوو. هەر بە خەتی کوردی بنووسە. زۆرم پێناخۆشبوو ئەو کابرا ناپیاوە شتەکانی بە جێهێشتوە. نازانم ئەنگوستیلەکەی بۆ هێناویەوە یان نا؟ درۆ دەکا، براکەی لەوانەیە هەر نەیە. نازانم بۆ چی گلەییت لە کەماڵی هەیە.؟ کەماڵ هێندێ جوڵانەوەی هەیە، ڕەنگە هی خەراپەی نەبێ، کەمال منداڵە و تۆسنە، زۆرم پێخۆشە کەماڵ بە دڵی تۆ بێ و بە کەیفی تۆ بجوڵێتەوە.

من ئێستا حاڵم باشە. چوو بوومە کوردستان، شەش ڕۆژم پێچوو. برادەرانی سەرێ هەموو باشن. زۆر سڵاویان دەگەیاندی. ماڵە مەلارەسولی زۆر سڵاویان لێدەکردی. ئامانە خان بە قەد هەموو دنیا سڵاوی دەگەیاندی. سەید ڕەسوڵ سەیارەی لێخوڕیوە، وەری گێڕاوە و شانی شکاوە. ئێستا لە بەغدایە. ماڵە مامۆستا مەلا محەممەدی شەڵماشی زۆریان سڵاو دەگەیاندی. خوشکە شەمێ پوستە و چای بۆ داناون بۆتان بنێرێ. خەجیج گیان! ئەگەر وەزعمان هەر وابێ، سەری ساڵی تازە هەر دەبێ سەرێکم بدەی. بەداخەوە ساڵی تازە چێچۆ بە یەکجاری دەگەڕێتەوە، زۆرم پێناخۆشە. ئەو هەموو زەحمەتەمان بۆ دەکێشێ.

نازانم کێ دێتە جێگای، تۆ پاسپۆرتە بولغاریەکەت نوێ بکەوە. لە وانەیە من سەفەرێکی دەرەوە بکەم. ئەو نامەیە بۆ کاک رەحمانی بنێرە. هێندێ کتێب بە پۆستەدا دەنێرمەوە، ئی خۆمانن. ئەگەر گەیشتن بۆم بنووسە. خەجیج گیان! خۆت لە ژووریدا قەتیس مەکە. دەگەڵ منداڵەکان بچۆ سینەما و بچۆ گەڕانێ. ئەو نامەیەش بدە بە کاک حەمە کەریمی. نامەی کاک رەحمانی ئێکسپرێس بنێرە. برادەران هەموو سڵاوت دەگەیێنن. لە جیاتی من منداڵەکان ماچ کە. جارێکی تر چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم. بەخۆشی بژی. Ahoj , kerimi to

**نامە بۆ دایکی کەمال - ۷۵/٦/۱۰**

خەجیج گیان رۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. پازدە رۆژ بوو لە کوردستان بووم. سەری هەموو برادەرانم دا. زۆر ماندوو بووم، بەڵام زۆر شاد و کەیف خۆش بووم، چونکە هەموو برادەرەکان هەتا چوونی من زۆر نیگەران بوون. بە چوونی من دڵیان خۆشبوو. هەموو لە جێگای خۆیان ماونەوە، ئێستا ئیتر لە بارەی ژیان و مانەومیان نیگەرانیمان نەماوە.

لەو سەفەرەشدا شەو ورۆژ هەر دەفیکری تۆ و تەعتیلی منداڵەکاندا بووم، هەر بەو هیوایە بووم بەڵکوو بگەڕێمەوە چاوم بە نامەی تۆ ڕوون بێتەوە. بە خوێندنەوەی نامەی تۆ بحەسێمەوە. گەڕامەوە. برادەرانی سەرێ هەموو سڵاویان دەگەیاندی. بە ڕاستی سوپاسیان دەکردی کە ڕێگات داوە من لێرە لە ناویاندا بم و لە گەڵیان بژیم.

گەڕامەوە، چیچۆ نامەکەی هێنا بوو، لە ماڵێ بوو. دە پێش هەموو شتێکدا مزگێنی نامەی تۆیان دامێ. هەر بە پێوە نامەکەم وەر گرت کە دیتم جەرگ و دڵم بەر بۆوە. هەموو تێمگەیشتن کە تێکچووم. تاقە دوو خەتت نووسیوە و دەڵێی: « وەرەوە.لە دەست کەمال و کاک حەسەن شێت بووم.»

خەجیج گیان! من دەزانم تۆ چەندە نا ڕەحەتی. دەزانم هەقتە. دەزانم جوان و جحێڵی تۆ بە تەنیا لە ژووریدا بە سەر دەبەی. دەزانم من لە ئاستی تۆ چەندە خەتا بارم. دەزانم بە ڕاستی لەو چەند ساڵەی دواییدا بۆ تۆ هاوسەرێکی باش نەبووم. خەجیج گیان زۆر جار فیکر لە وەزعی تۆ دەکەمەوە، خۆم بە خەتا بار و خەجاڵەت دەزانم. بەڵام چبکەم. ئەو ڕێگایەی ئێمە گرتوومانەتە بەر، ئەو کۆسپ

و تەنگ و چەڵەمەی لە بەرە. هێشتا ڕۆژی دژوار تر و تاڵتریشی لە پێشە. هەرچی بێ خۆمان ئەو ڕێگایەمان هەڵبژاردوە. خەتای کەس نیە. ڕاستە تۆ تەنیای، نارەحەتی، کەمال بە قسەت ناکا، بەڵام پێت وانەبێ منیش لە دووری تۆ بە رەحەت بم. بڕوام پێدەکەی شە و ڕۆژ مەگەر دەخەوێدا ئێوەم لە بیر بچێتەوە. دەزانی و باش دەزانی من دەگەڵ تۆ و منداڵەکان هەمیشە خۆشم ڕابواردوە. قەت نەمویستوە سەعاتێک لە ئێوە دووربم. دەزانی لەو تەمەنەدا دووری لە تۆ بۆ من چەندە دژوارە. باش دەزانی من دنیام سەبارەت بە تۆ و بە کەماڵ و شلێر پێخۆشە. بەڵام چبکەم؟! نەتەوەکەمان زۆر بەشخوراو و لێقەوماوە. لە کەماڵ و شلێران پتر پێویستی بە خزمەت وەهەوڵ و تەقەلای ئێمە هەیە. خۆ ڕەنگە من هیچم لە دەست نەیە. دەرد و داخی دووری لە ئێوە هەر بە خۆڕایی بچێ، بەڵام هەرئەوەندەش جێگای شانازیە کە برادەران پێیان خۆشە لە ناویان بم و بە جێم نەهێشتوون. چاک یان خەراب ئاگامان لە دەرد و مەرگی یەکتر هەیە. دەزانی دووری لە وانیش هەر دەرد و داخە.

خەجیج گیان! تۆ خۆت چەند جار گوتوتە نابێ دەست لە حیزب و لە برادەران هەڵبگری. لە نامەی ئەو دوایەشدا هەر نووسیبووت. برادەران هەموو لێرە بوون و نامەکەیان خوێندەوە. سوپاسیان کردی. نامەوێ پتر لە سەری بڕۆم. تەنیا دەمەوێ وەبیرت بێنمەوە کە وەزع و ژیانی ئێمە ئاوایە. تۆش ئەوانە باش دەزانی. بۆیە قەت چاوە ڕوانی ئەوە نەبووم کە ئاوا دوو دێرم بۆ بنووسی و باسی هیچم بۆ نەکەی. ڕەنگە بزانی ئێستا وەزعمان چۆنە؟ خۆ هاتنەوە بە دەستی من نیە. من هەوەڵی مانگی مارس داوای ڤیزام کردوە، جوابیان نەداوینەوە. قەولیان داوە ٢١ی مانگی مای پاسپۆرت و ڤیزام بدەنێ. هەتا ئێستا هیچ خەبەر نیە. دیارە ئەگەر ڤیزایان دامێ گیر نابم. من لە دووری ئێوە وا شێت دەبم. بەڵام پێم خۆشە ئەوەندەش بزانی، بەڵکوو هەر نەیانهێشت بێمەوە.ئیترهەق نیە تۆ پتر نارەحەتم بکەی. زۆر کەسی وەک من لەم ڕێگایەدا سەر وماڵیان تێدا چوە. تێکۆشان و خەبات لە پێناوی ڕزگاری نەتەوە ونیشتماندافیداکاری دەوێ.

خەجیج گیان !لە وەتا نامەکەی تۆم دیوە نەخۆشم. بۆ دەبێ لە دەست کەماڵی نارەحەت بی؟ بۆ دەبێ کەماڵ جوابی نامەی من نەداتەوە؟ دەزانی کەمال چەندە

منی خۆش دەوێ؟ ئێستا بەڵام نامەم بۆ نانووسێ. تۆش بۆم نانووسی مەسەلە چیە. ئەگەر کەماڵ وای لێبێت تۆ نارەحەت بکا و نامە بۆمن نەنووسێ، نەمانی باشترە. شلێرش نەینووسیوە بۆچی کەمال نامەی نەناردوە؟ من خەم و نارەحەتی ئێرەم کەمبوو، ئێستا ئی ئێوەشی هاتە سەرێ. هیچیش ناکرێ. هەر دەبێ ڕاوەستم تا ئیجازەم دەدەن سەریکتان بدەمەوە. خەجیج گیان! خۆت نارەحەت مەکە. لە کەمالیش عاجز مەبە. تەمەنی ئێستای کەمال جۆرێکە، ڕەنگە هەموو شتێکی بە کەیفی تۆ نەبێ. ئێستا من زۆری لێ تورەم. من هەر گوتوومە کەمالم بۆیە دەوێ، خزمەتی تۆ بکا. بەڵام جار و باریش کەر دەبێ. پێویستە بە زمانی بزانی. تۆ خۆت دەتگوت: کەمال کوڕی چاکە.

بۆیە ئەم نامەیەم نەنووسیوە نارەحەت بی. هیوادارم هەر خۆش و سلامەت بی. بە سەر بەرزی و بە خۆشی بژی. ئێستا وەزعی ئێمە باشترە. هیوام وایە بەم زوانە چاوم بە دیدارتان ڕوون بێتەوە.و لە ئامێزی گەرمی تۆدا بحەسێمەوە.

لە بارەی کاک حەسەنی. دەزانم هەراسان بووی، لە بابی خۆت پتر خزمەتت کردوە، مەجبور نی چێشتێ بۆ کاک حەسەن لێ بنێی. هیچ شەرمی پێناوێ. ئێستا منداڵەکان تەعتیلن. دەگەڵ ئەوان بچۆ دەرێ، بچنە ڤیتوشا نامەکەم تەواو دەکەم. جارێکی تر چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم هیوادارم وا بێمەوە جێژنی لە دایکبوونی شلێر و کەمال پێکەوە بگرین. لە جیاتی من منداڵەکان ماچ بکە. خەجیج گیان ئەو نامەیەم زووتر نووسیبوو. ئێستا پاسپۆرتیان دامێ. هێندێ کاری خۆمان ماوە. ئەگەر تەواو بوو دەچمە بێروت، بە تەلەفون پێت ڕادەگەیێنم. ئیتر خۆشیت. Ahoj kerimi to 10/6/75

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٧٥/١١/٢٩**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم سلامەت بی و دڵشکاو نەبی. نازانم چوویە خەستە خانە یان نا؟ زۆر نیگەرانم. هیچ نامەی تۆم بۆ نەهاتوە. قەرار وابوو خەبەری ساخ و سلامەتی خۆتان بە پۆستەدا بنێری. نازانم نامەکانت پێگەیشتوون یان نا؟ چونکە کاک رەحمانیش نامەی نە نووسیوە. من حاڵم باشترە، بەڵام زۆر دەخەمی ئێوەدام و زۆر بیرتان دەکەم. جارێ حاڵمان باشە. برادەران سڵاوت دەگەیێنن. لە وانەیە ئەو ڕۆژانە سەفەرێک بکەم. بۆ ئاگاداریت ئاخری عابیدەمان بۆ ڕەحمانی خواست. جێگات خاڵی،

سبەی شەو دەچینە شیرنی خواردن. نازانم مەسەلەی سەفەرت ساغ کردۆتەوە یان نا؟ زۆرم پێخۆشە ئەگەر کەست وەگیرکەوێ ئاگای لە منداڵەکان بێ، زستانێ بێیە لای ئێمە. نازانم کەماڵ چۆن دەخوێنێ؟ نێوانتان چۆنە؟ ئاواتم ئەوەیە کەمال لە قسەت دەر نەچێ و خزمەتت بکا و تۆش لێی ڕازی بی. تکایە نامەی کاک رەحمان ئێکسپرێس بنێرە. ئەگەر دوکتۆر سوڵتان نامەی نووسیوە، بە ڕێگای چیچۆ دا بۆم بنێرە. چاوەڕوانی نامەت دەبم. منداڵەکان ماچ دەکەم. بە خۆشی بژی. Ahoj,kerimi to 2 9/11/75

**نامەی دایکی کەمال بۆ من ، ٧٥/١٢/١١**

کەریم گیان ڕۆژ باش! هیوا دارم ساغ و سلامەت و کەیف خۆش بی. نامەکەتم پێگەیشت و چاوم پێ ڕوون بۆوە وە زۆر سوپاست دەکەم. کەریم گیان ئێمە حاڵمان باشە. من نامەم بۆ نووسیوی کە هاتومە دەر لە مەریزخانە و دەگەڵ نامەی کاک رەحمان بۆم نارد بووی. کەمال چاک دەخوێنێ. منیش زۆری لێ ڕازیم. کەریم گیان ئەمن چم لێتان ڕازی بم یان نا؟ مەسەلەی سەفەرەکەم ساغ کردۆتەوە، لێلە ئێمی ڕازی یە ئاگای لە منداڵەکان دەبێ. بەلام دەترسێم بێمە وێ نارەحەتت کەم. لە هەمووی چاترە با دەژووریدا بمرم. بۆ خۆت دەزانی ئەو ساڵ کەماڵ ئاخریەتی دەبێ کونترۆڵێکی زۆر گەورەی لە سەر بێ. نامەی کاک رەحمانیشم جێبەجێ نارد. کاک رەحمان تەلەفونی کرد گوتی دەبێ لەوێ نەبن، باشترە عیراق بە جێ بێڵن. نازانم بۆ وای گوت. کاک سوڵتان هیچ نامەی نەهاتوە. زۆرم پێخۆش بوو کە عابیدەت بۆ رەحمان خواستوە. ئەگەر دەتوانی دیاری بۆ منداڵەکان بنێرە بۆ ساڵی تازە سلاو لە هەموو برادەران دەکەم هەر بژی بە خۆشی و بە سلامەتی. ahoj tvij chadj

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٧٥/١٢/٢٧**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. دەمێشدا لە دوورەوە چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوام وایە سلامەت و لە بەلایان بە دوور بی. ئەمن نەخۆش نیم، حاڵیشم باش نیە. لە سەر یەک برادەران حاڵیان باش نیە. ئەوە مانگێک دەبێ قەرار بوو سەفەر بکەم. پاسپۆرتم داونێ، بەلام هەر خۆمان لێ دەشارنەوە. ئێستا دانیشتووین و

لە چاوە ڕوانیدا ڕۆژ دەبەینە سەر. تۆ نیگەران مەبە و خۆت نارەحەت مەکە. بەو حاڵە ناتوانم بڵێم وەرە ئێرە. لە وانەیە پاشان ڕێگات نەدەن بگەڕێیەوە. وەک ئەو سەگبابانە دەستیان بە کورد قڕان کردوە. خەریکن کوردستان چۆڵ بکەن. بەڵایەکی گەورە بەسەر نەتەوەکەماندا هاتوە. زۆریشی خەتای کوردەکە خۆیەتی. بەهیوای شای ئێران تێکەوتن کە خۆی دوژمنی کوردە. دوارۆژی ئێمەشلێرە مەعلوم نیە.

خەجیج گیان ئەگەر نامەی کاک رەحمان هات، بیدە بە چیچۆ، بڵێ زوو بگاتە دەستی گەریم. ڕێگای دیکەمان نیە. هەر دەبێ لە ڕێگای ئەوانەوە نامەکانمان بێن و بچن. ماڵیان ئاوا بێ. مامۆستا هێمن دامێنێکی بۆ شلێر کڕیوە، ئەوە بۆم نارد. با بە کوردی نامەی سوپاسی بۆ بنووسێ. یەک دوو دەفتەری مەدرەسەشم بۆ ناردن. خوشکە شەمێ ئەوە چایی و پوستەی بۆ ناردن هێندێ کتێبم بە چیچۆدا ناردنەوە، هی خۆمانن. ئیتر خۆشیت. Ahoi , kerimi to

**نامە بۆ دێکی کەمال ، ٧٦/٢/٨**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم لە ژیانت د اخەمبار و دڵ شکاو نەبی. من حاڵم باشە. لە بارەی سەفەر و هاتنەوەم ئەوەی کاک رەحمان دەیڵێ هەر خەیاڵە. ئەو خۆی لە ئورووپا دوور لە ژان و دەردی برادەرانی حیزبی ڕۆژ دەباتە سەر و لە وەزعی ئێمە ئاگادار نیە. من چۆن دەتوانم برادەرانی ئێرە بە جێ بێڵم؟ وەزعی ناله باری برادەران بۆیە نابێ خۆیان لێ بشارمەوە. خەریکم پارەی ماشینەکەتان بە کەسێکی ئەمیندا بۆ بنێرمەوە. چونکە بەڕاستی هەقی خۆتانە. لە بیرتە لە خواردنی خۆمان دەگێڕاوە، دۆلارمان دەکری بەڵکوو ماشینێک بکڕین. ئێستا ماشینمان کڕی. بەداخەوە نەمانتوانی پێکەوە لە گەڵ منداڵەکان سواری بین و وەک خەڵک بژین. ناچار لێرە فرۆشتمەوە. پارەکەی لای منە و هیوادارم بۆتانی بنێرمەوە. بە بێ ئێوە سوار بوونیشی بۆ من تامی نیە. تکایە ئەو نامەیە بە پەلە بۆ کاک رەحمانی بنێرە. خۆت نارەحەت مەکە. چەندی بتوانی خەریکی خوێندن و خوێندنەوە بە. لە جیاتی من منداڵەکان ماچ کە. خۆشیتان ئاواتمە. ماچت دەکەم . 8/2/76 Ahoi kerimi to

**نامەی کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ دایکی کەمال**

**حیزبی دێموکراتی کوردستان(ئێران)**

**ژمارە : ٢٧١**

**ڕۆژ : ١٩٧٦/٢/١٥**

هاوڕێی بەڕێز خوشکە خەجیج ! وێڕای سڵاو.

نامە جوانە پیرۆز بابیەکەت بە هۆی سی هەمین ساڵی دامەزرانی کۆماری مەهاباد گەیشتە دەستمان. تێکۆشانی خوشکی وەک تۆی بەڕێز بۆ ئێمە جێی شانازیە. هیواداریین بە خەباتی تێکڕایی هەموو لایەکمان بە ڕابەرایەتی حیزبە پێشڕەوەکەمان و پشتیوانی هەموو گەلانی ڕزگاریخواز و پێشکەوتوو، بە سەر ڕێژیمی دیکتاتۆری شادا زاڵ بین و بتوانین لە ساڵانی داهاتوو دا لە نیشتمانی خۆشەویستمان بە خۆشیەوە ئەو جێژنە بکەین. ئیتر هەر خۆش بێت. کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.

**نامەی مەلا ڕەسوڵ بۆ دایکی کەمال ١٩٧٦/٩/٩**

بۆ بەڕێز و خۆشە ویست خوشکە خەجیج! ئەو کاتەت باش. پێشەکی سڵاوت لێ دەکەم و هیوام وایە هەر لە خۆشیدا ژیانبەرنە سەر. چاوی کەمال وشلێر ماچ دەکەم و بە سەر کەوتنی کەمال لە وەر گرتنی دیپلۆم یەکجار خۆشحاڵ بووم. بەسێ و دایکم و منداڵەکان زۆر سڵاوت لێدەکەن و چاوی کەمال و شلێر ماچ دەکەن. ڕەنگە هێندێ گلەییم لێ بکەی کە لەو ماوەیەدا نامەی تایبەتیم بۆ نە ناردوی بەڵام هۆیەکەی ئەوە بوە کە هەر جارێک نامەم بۆ کاک کەریم نووسیوە هەواڵم پرسیوی و تەقریبا نامەکە بۆ هەر دوکتان بوە. تکایە سڵاو ئیحتراماتم بە خزمەت کاک حەسەن بگەیێنە و هیوام وایە نەمرین هەتا جارێکی دیکەش بە خزمەتی دەگەم. بە ڕاستی لەو سەفەرە دا هەمووی ئێمەت مەمنون کرد. بەو هەموو خزمەت و ماندوو بوونە، ئەگەربە خێربە یەکجاری هاتن بۆ ئێرە تۆڵەت بۆ دەکەینەوە. ئیتر هیوام خۆشی و بەختیاریتە. برات بۆ هەمیشە

ڕەسوڵ عبدالرحمان، ١٩٧٦/٩/٩

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ، ٢٥/٩/ ٧٦**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. ئاواتم سلامەتی تۆیە و هیوادارم قەت دڵشکاو نەبی و بە خۆشی لە گەڵ منداڵەکان ژیان بەریە سەر. دەتوانم هەر ئەوەندە بڵێم جاریّ چارە نووس لێکی جیا کردووینەوە و داخێکی گرانە. خەبات بۆ ئازادی ئەم کۆسپانەی لە سەر ڕێگایە. نامەکەت چاوی ڕوون کردمەوە. زۆر جوان و بێغەڵەتت نووسیبوو. هیوادارم کاتی خۆت بە خوێندنەوەی کوردی و بە نووسین ڕابوێری. پێم خۆشبوو کەماڵ ئاگرۆنۆم دەخوێنێ. برادەرانیش لێرە پێیان باشە. هیوادارم نامە و شتەکانت پێگەیشتبن و نامەی کاک ڕەحمانیشت نارد بێ. ئەو نامەیەش زوو بۆ کاک ڕەحمانی بنێرە.

چەند ڕۆژە سەید ڕەسوڵ وئامانە خان لێرەن، سلاوت دەگەیێنن. ماڵی مەلا ڕەسوڵیش سلاویان لێدەکردی. پێم خۆشە ئەگەر کەست وەگیر کەوێ ئاگای لە شلێر بێ، بۆ دوو سێ مانگ بێیە ئێرە و منیش بڕێک بحەسێمەوە.

خەجیج گیان! لێرە برادەرانی کومیتەی ناوەندی بڕیاریان دا هەموو مانگێ ١٥٠دۆلارت یارمەتی بکەن. سوپاسیان دەکەم، ئیتر لە بارەی ژیان و بەڕێچوونەوە خەمت نامێنێ و منیش تا ڕادەیەک فیکرم ئاسودە دەبێ.

چاوم بە شیرینی کچی مستەفا خۆشناو کەوت. زۆر سلاوی دەگەیاندی. بلوزێکی جوانی بۆ شلێرێ کڕیوە کە بۆی بنێرم. حەزی دەکرد چاوی بە تۆش بکەوێ. ماڵیان لە نیزیک کەربەلایە، بەڵێنم پێداوە بچم سەریان بدەم. جاریّ چیدیکە نیە بۆتان بنووسم. ئەو ڕەسمەش ئی کوری خوشکمە بۆت دەنێرم. خۆشیتان ئاواتە خوازم. لە بیرت نەچێ ئادرێسی کەماڵم بۆ بنووسە. ماچت دەکەم. Ahoj , kerimi to 25/9/76

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ، ٤/١٠/٧٦**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش. لە دوورەوە چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم ساغ وسلامەت بی. پێش دوو ڕۆژ دەرمانەکانم وەر گرت، زۆر سوپاس. بەلام وادیارە قەڵەمەکەم ون بوە، زۆرم پێ ناخۆش بوو. لە گەڵ نامەی تۆ نامەیەکم بۆ کاک ڕەحمان نارد بوو، هیوادارم بەڕێت کردبێ. من ئێستا حاڵم

باشە، بەڵام زۆر دەفیکری تۆ دام. پێم خۆشە فیکرێک بۆ شلێریکەیەوە، یەکێک ئاگای لێ بێت، بۆ چەند مانگ بێیە ئێرە. نازانم کەمال بڕیاری چی داوە. باوکی فێنک پێی باشبوو ئاگرۆنۆم بخوێنێ. زۆر سڵاوی لێدەکردی. دەیگوت تا درنگ بێ، باشترە و دەعوەتەکە گەورەتر دەبێ، ئێستا قەرارە جارێ من بانگیشتن کا. گوتم ڕادەوەستین تا دایکی کەمال دێت، فەرمووی: ئەوەیان وەبەر دەعوەتی دایکی کەمال ناکەوێ. برادەران هەموو باشن و سڵاوت دەگەیێنن. مامۆستا عەبدە ئەوە ژن دێنێ وتۆی مانگ دەیگوێزێتەوە. زۆر سڵاوت لێدەکا. بە قەت هەموو دنیا باسی چاکەی تۆ و منداڵەکانی کردوە و ئێرەی پڕکردوە،

خەجیج گیان! حەمەی حاجی سەعیدی لێرەی سەر وەدەر ناوە. ئەو ناپیاوە هاتوە، میوانی تۆ بوە، ڕانک و چۆغەی کەمالی لە ئێوە وەر گرتوە، بەڵام بەتۆی نەگوتوە دەچمە بەغدا. کارتان هەیە یان نا؟ لە بەغداش خۆی لە ئێمە ئاشکرا نەکردوە. من لە سولەیمانی توشی بووم. لە گەڕانەوەدا کە بێتە وێ، هەر ڕووی مەدەیە. وادیارە نازانێ پیاوەتی و دۆستایەتی چیە. پێمخۆشە نامەیەک بۆ کومیتەی ناوەندی حیزبی خۆمان بنووسی و سوپاسیان بکەی بۆ ئەوەی یارمەتیەکی مانگانەیان بۆ تۆ و منداڵەکان دیاری کردوە. منیش سوپاسیان دەکەم. نامەی کاک ڕەحمانی زوو بنێرە. خەبەری کەمالیم بۆ بنووسە. ئەو دوو نامانە بدە بە کاک حەسەن و بە کاک حەمە کەریمی. بابی ئەوین هەر لێرەیە و سڵاوت دەگەیێنێ. منداڵەکان لە جیاتی من ماچ کە و خۆشم ماچت دەکەم ، بە خۆشی بژی . Ahoi , kerimi to 4/10/76

**نامە بۆ شلێری کچم. ٧٦/١٠/٢٢**

شلێری خۆشەویستم، چاوەکەم، ڕۆژ باش ! چاوکانت ماچ دەکەم. هیوادارم سڵامەت بی و بە خۆشی بژی. لە خوێندن و ژیاندا سەر کەوتوو بی و دایکت هەمیشە لێت ڕازی بێ.

ڕۆڵە گیان! من زۆرم پێخۆشە دایکت بۆ چەند مانگ بێتە لای من. بەڵام نامەوێ تۆ بە تەنیا لە ماڵێ بی. دڵم ناحەسێتەوە. ئەگەر تۆ بە تەنیا بی، دایکیشت دڵی ناحەسێتەوە.. دڵی نایە بە تەنیابە جێت بێڵێ، ئێستا کەماڵیش لە ماڵ نیە. هیچ نەبێ کچە ڕووسەکەی ڕەفیقت ڕازی بکە با لە کن تۆ بژی، شەو و ڕۆژ پێکەوە بن. ئادرێسی کەمالم بۆ بنووسە، زوو نامەم بۆ بنێرە بزانم

دەڵێی چی؟ دایکت ئیزن دەدەی یان نا؟ چونکە تا یەکێک لە کن تۆ نەبێ، دایکت دڵی نایە بەجێت بێڵێ. لە ڕەسمە تازەکانی خۆت دانەیەکم بۆ بنێرە. لە جیاتی من دایکت ماچ کە. خۆشیت ئاواتمە. بابی خۆت.کەریم. ٧٦/١٠/٢٢

**نامەی دوکتور قاسملوو بۆ دایکی کەمال ١٩٧٦/١١/٣**

خوشکی بەڕێز. خوشکە خەدیج چۆنی؟ زۆر ئەحواڵت دەپرسم و زۆر سڵاوم هەیە بۆ کەمال و شلێر. هەر وەها سڵاوم هەیە بۆ کاک حەسەن و هیوادارم حاڵی باشتر بووبێ،

ئەوە نەسرین لێرەیە و زۆر سڵاوی هەیە. زۆر تووشی زەحمەت بوو بەڵام ئێستا حاڵی باشترە.

خوشکە خەدیج. تکام ئەوەیە ئەو کاغەزانەی کە بۆ من دەنێری بە سفارشی مەنێرە. هەروا وەکوو کاغزی مەعمولی بنێرە. زووتر دەگا وزەحمەتی کەمترە. زۆر سوپاس. برات رەحمان.

**نامە بۆ دایکی کەمال ٧٧/٣/١٦**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە سڵامەتی بژی و قەت دڵشکاو نەبی. نامەکەت ئەو ڕۆ گەیشت. کاتێک لە خەستە خانە هاتبوومە دەر، چاوی ڕوون کردمەوە. سێ ڕۆژ بوو لە خەستەخانە بووم، لوتیان عەمەل کردم و ئێستا ئاسوودە ترم. جارێ حاڵم باشە. بەڵام بیری دووری تۆ و تەنیایی تۆ قەت نامێڵێ ئاسودە بم. نامەکەت زۆر بە پەلە نووسیبوو، خەڵەتی هەبوون. ئەوەی باسی خۆتە تێنەگەیشتم. نازانم چییان پێگوتووی و کێ گوتوویە.؟ ئێستا کە پاسپۆرتەکەی بولغاریان وێداوێەوە، ئیتر کەس کاری پێت نیە. تۆ خۆت نارەحەت مەکە. ئەگەر بتوانی سوکە کارێک بدۆزیەوە، ڕەنگە خەراب نەبێ. ئەگەر نەشت توانی و کەس باسی خانوو و کاری نەکرد ئەوە لێگەڕێ. بۆت نە نوسیبووم کاک حەسەن چدەکا؟ چی دەدەمنێ؟ دەڵێ چی؟. مەسەلەی سەفەرەکەم هێشتا ساغ نەبۆتەوە. نازانم کەنگێ جواب دەدەنەوە. ئەگەر ڕێگایان دام لە وانەیە یەکسەر بچمە پاریس. پاشان بێمەوە لای ئێوە. تکایە زوو نامەم بۆ بنووسە. بە شلێرێ بڵێ زوو نامەم بۆ نووسێ. نامەکەی بە چیچۆ دا نارد بووم، با شلێر بچێ وەری بگرێ. نامەی کاک ڕەحمانی زوو بنێرە. بە مەسەلەی

پاسپۆرتەوە نارەحەت مەبە. با کەمال نامەم بۆ بنووسێ. بزانم لە چی ئیمتحانی داوە. بۆ خۆت چاو لە دەفتەرەکەی بکە. ئەگەر بتوانی بچیە پلۆڤدیف، بزانی کەمال چۆن دەخوێنێ. نازانم ئەوەندەی لە مالێ بوو لێی رازی بووی یان نا؟ هەر ئەوەندەم دەوێ کەمال بە کەیفی تۆ بێ و لە قسەت دەرنەچێ. کەمال بۆی نووسیبووم کە بە برادەرێکی خوێندکاری کوردی عیراقیدا دوو بوتڵ ڤۆدکای بۆ ناردووم. هیچم پێنەگەیشتوە. پێی بڵێ بە کوردەکانی عیراقداهیچم بۆ نەنێرێ. چونکە دەیخۆنەوە و لێرە (ببورە و العفو) م تەحویل دەدەن. وەک ئەوەی ئەنوەر دڵسۆز لە مۆسکۆ بۆی نارد بووم وکابرا لە پراگ( العفو)ی بۆ هێنابووم. سەید مریەم و مێردەکەی زۆر سڵاوت دەگەیێنن. هەموو رۆژی جومعان بانگێشتنم دەکەن و سوپاسیان دەکەم. کەوەکەمان زۆر باشە و دەستت ماچ دەکا. خۆشی و سڵامەتیت ئاواتمە. ماچت دەکەم. Ahoj , kerimi to, 16/3/77

**نامە بۆ دایکی کەمال ٧٧/٣/٢٥**

خەجیج گیان رۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. ئاواتم ئەوەیە بە سڵامەتی و بە خۆشی بژی. کارتەکان هەموو گەیشتن. زۆر سوپاس. بەڵام کە دەنووسی، پاشان جارێک نایخوێنیەوە، دوویان خەڵەتیان هەبوو. بۆ مەلا عەولا و عەولا شلێر نەت نوسیبوو. تەلەفون و قسەکانت ئەگەر دڵیان گەشاندمەوە. نارەحەتیشیان کردم. چونکە لە کەماڵ تورە بووی. تۆ دەبێ زمانی کەمال بدۆزیەوە. ئێستا لە تەمەنێکی تایبەتی دایە و هەر دەبێ دایک تەئسیری بکاتە سەر. من لە دوورەوە هیچم لە دەست نایە. دەمەوێ لە بارەی شلێرەوە بۆم بنووسی. ئەگەر شلێر بە قسەی بابی خۆی بکا، پێمخۆشە شوو بە کوردێک بکا. پێمخۆشە وەزعی ئوروپا کاری تێنەکا. نموومەی کیژە کوردێکی خوێندەواری بە شەرەف بێ وەک شیرینی کچی مستەفا خۆشناو بێ دایک و باب لە ئوروپا نموومەی ئینسانیەت و شەرەفە. هەر وەک تا ئێستا پێت گەیاندوە، هیوادارم لە مەو دواش هەر لە ژێر تەربیەت و تەئسیری تۆدا بژی. من ئێستا حاڵم باشە. خەریکی دوو بارە نووسینەوەی( دایک)م. تۆش تکایە لە نووسین وخوێندنەوە خافڵ مەبە. زوو نامەم بۆ بنووسە با خەتەکەت باشتر بێ. سڵاوی کاک حەسەنی دەگەیێنم. Ahoi kerimi to 25/3/77

**نامە بۆ دایکی کەمال ٧٧/٤/٩**

خەجیجی خۆشە ویستم ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. دوێنێ بەر لەوەی نامەکەت بگا، تەلەفونم کرد، کەس لە ماڵێ نەبوو. وادیارە لە کار بووی. نازانم کارەکەت چۆنە و چدەکەی؟ لە نامەکەت دا دیسان باسی پۆلیس و پاسپۆرتت کردوە. لە خۆڕا خۆت نارەحەت مەکە. زۆرم پێخۆشبوو لە شلێرێ ڕازی. بەڵام پێم ناخۆشە لە کەمالی تورەی. تکایە ئەو نامە و پاکەتە بۆ کاک رەحمان بنێرە. هەتا زوو بینێری درنگە. من لە سەریەک باشم. چەند ڕۆژ بوو مەعدەم نارەحەتی کرد بووم. ئەگەر ئەو شتانەت بۆ کاک رەحمان نارد، تکایە بۆم بنووسە چ ڕۆژێک ناردووتە. نازانم لە گەڵ کارەکەت چۆنی. هیلاک دەبی یان ڕۆژ دەبەیە سەر.؟ ئەوەشم بۆ بۆتە فیکر. وادیارە ژیانەکەی من هەر دەبێ بە فیکر و پەژارە بڕواتە سەر. باوکی فینک زۆر سلاوت دەکەیێنێ. کەوەکەمان زۆر باشە. وەک سەگی هاری لێهاتوە. ماڵە دوکتور ڕەشید و ڕوناک خان سلاوت دەگەیێنن. برادەران هەموو سلاویان هەیە. پێمخۆشە جانتا دەستیەکەم بۆ بنێری. باکەمال بیدا بە کچی چیچۆ. ئەگەر نەبوو خۆتی پێوە ماندوو مەکە. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. خۆشیت ئاواتە خوازم .

Ahoj , kerimi to , 9/4/77 .

**نامە بۆ دایکی کەمال ٧٧/٤/٢٢**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. سلامەتی و خۆشیت ئاواتمە. خەجیج گیان تۆ لە نارەحەتی من خۆت نارەحەت مەکە. دەزانی چەندەم پێناخۆشە کە تۆ دڵت نارەحەت دەبێ. با جاری نەختێ لە سەر کەمال وشلێربۆت بنووسم. دوایە دێمە سەر باسی خۆمان، بەڵام نابێ خۆت نارەحەت بکەی.

کەمال نامەیەکی جوانی بۆ نووسیوم. دەڵێ دەچمەوە سەری دایک و خوشکم دەدەم. دەرسەکانم کەمن، وەختم زۆرە، دەحەسێمەوە. نووسیویە خۆشم نازانم پارە چۆن دەفرێ. بەڵام هەوڵ دەدەم کەمێک پاشە کەوت بکەم، بەڵام هەموو مانگێک ناتوانم. نامەیەکی درێژم بۆ کەمال نووسیوە، دایبنێ، پێی بخوێنەوە.

لە بارەی شلێرێ. من پێم خۆشە و بۆم نووسیوە مێرد بە کوڕێکی کوردی

باش بکات. دایک و باب وەزیفەیانە ڕێگای ڕاست بە منداڵەکانیان نیشان بدەن. جا ئەگەر بە قسەیان نەکەن، ئەوە ئیتر شتێکی دیکەیە.

خۆزیا نامەی چارلی چاپلی – نت خوێند بایەوە کە چی بۆ کچەکەی نوسیوە. باش بوو وەسیلەمان دیتەوە، ئێستا دەمەوێ لە وەزعی خۆمان ئاگادارت بکەم. پێش چەند ڕۆژ حکوومەتی بەعس لە گۆیە برادەرانی ئێمەیان کۆ کردەوە و دە ماشێنی سەر بازیان ئاخنین و بردوویانین بۆ (ڕمادی). چەند ڕۆژ لێیان بێ خەبەر بووین. پێمان وابوو داویاننەوە بە ئێران. پاشان خەبەرمان زانی کە لە ( ڕمادین) من چوومە لایان. ئەو هەموو ماڵ و ژن و منداڵە یان لە بەر سوورەتاوی ڕمادی بێ جێگاو شوێن لە ستادیۆنێکی وەرزشیدا هەڵڕشتوە. شتومەکی زۆریان لێ دزیون و ماڵیان لێ پەرش و بڵاو بوە. بە برادەرانی سولەیمانی و قەڵا دزەشیان گوتوە کە ناوی خاو و خێزانیان بدەن بە حکوومەتی بەعس. جارێ دەستیان لێ نەداون. نازانین چۆن دەبێ. نامەمان بۆ ڕێبەرایەتی بەعس نووسیوە.

خەجیج گیان! بەر لە هەموو شت دەمەوێ خۆت نارەحەت نەکەی. ئامانە خان وخوشکە بەسێ زۆر بە غیرەت بوون. زۆر سڵاویان دەکەیاندێ. تۆش دەبێ وەک ئەوان ئازا بی. ژیان و تێکۆشانی سیاسی ڕووداوی دژوار تریشی بە دواوەیە. تکایە ئەو نامەیە بدە بە حەمە کەریم و بڵاوی بکەنەوە کە حکوومەتی بەعس کوردەکانی حیزبی دێموکراتی لە کوردستانیان ڕاگواستوە. بە منداڵەکان مەڵێ، با نارەحەت نەبن. تکا دەکەم خۆت نارەحەت مەکە. من ئێستا ئیتر هەدادان و ئیستراحەتم نیە. باوکی فێنک سڵاوت دەکەیێنێ. دەیگوت لەبارەی خانو و ژیانی ئێوە نامەیان بۆ حیزبی کۆمونیستی بولغارستان نووسیوە و دەستیان لێنادەن.پێم وانیە دەست لە ئێمە بدەن ئەگەر دەستیشیان لێداین هیچ ناگرێ. تۆ منداڵەکان چ لێدەکەی و چۆن ژیان دەبەیە سەر، خۆت دەزانی ، بە خۆشی ژیان بەرە سەر. هەر ئەوەندەم لە تۆ دەوێ، منداڵەکان وا بعاملێنە خۆیان بە کورد بزانن و تێبگەن ڕۆڵەی نەتەوەیەکی بەشخوراون. ئەوەندەش بزانن بە ڕێگای سۆسیالیستی دا نە بێ کورد لە چەوسانەوە ڕزگار نابێ. دەزانی ئازادی بۆ من ئەوەیە کە زەحمەتکێشانی کورد لە چەوسانەوە و ستەم و بندەستی ڕزگار بن. بۆ من ئەوە ئازادی نیە کە تاقمێک بە ناوی کوردایەتی دەسەڵات

بگرنە دەست و زەحمەتکێش و خەڵک وەک داگیر کەر بچەوسێننەوە.

خەجیج گیان! بەو نامەیە خۆت نارەحەت مەکە. دەبوایە تۆ لە وەزعی خۆمان ئاگادار بکەم. ئەو نامەیە زۆر زوو بۆ کاک رەحمان بنێرە. تەلەفونەکەمان گۆڕاوە. ئێستا ئاوایە( 7760444). جارێکی تر ماچت دەکەم خۆشیت ئاواتمە. منداڵەکانم بۆ ماچ کە. کەریمی تۆ Ahoj 22/4/77

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٧٧/٥/١٣**

خەجیج گیان رۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم سلامەت و بە خۆشی بژی. من حاڵم باشە. بەڵام زۆر ماندووم. لە بارەی فیکرەوە نارەحەتم. حەوتووی دووجار دەبێ بچمە رەمادی و سەری برادەران بدەم، زۆر نارەحەتن. جێگایان زۆر پیس و ناخۆشە. ترسی ئەوەمان هەیە برادەرانی سولەیمانی و قەڵادزەش داگیرنە خوارێ. جا بەم حاڵە من قەت ناتوانم و نابێ برادەران بە جێ بێڵم. قەرار وابوو کاک رەحمان و کاک ئەمیری قازی بگەڕێنەوە، بەڵام حکوومەتی عیراق رازی بە هاتنەوەیان نەبوو. نازانم وەزعمان بەرەو کوێ دەچێ. تۆ خۆت نارەحەت مەکە. چاوم بە باوکی فێنک کەوت، سڵاوی دەگەیاندی. بۆ بوڵغارەکانیان نووسیوە کە دەست لە خانو و ژیانی تۆ نەدەن. دیارە ئەگەر وەزعمان روون بێتەوە و برادەران ئیجازە بدەن، بۆ سەردانێکی کورتیش بێ هەر دێمەوە. ئەگەریش نەهاتمەوە کە زۆرم پێ ناخۆشە، تۆ لە گەڵ منداڵەکان چۆنی دەتەوێ بەرنامەی ژیانی خۆت رێک بخە.. هێندێ کتێبم بە پۆستەدا ناردوونەوە ئەگەر گەیشتن بۆم بنووسە چاوی شلێرێ ماچ دەکەم. رێگام نەبوو نامەی بۆ بنووسم. برادەران سڵاوت دەگەیێنن. خۆشی تۆم ئاواتە.

ahoi , kerimi to 31/5/77

**نامەی دایکی کەمال بۆ من ، ٧٧/٥/٢٤**

کەریم گیان رۆژ باش. هیوادارم ساغ و سلامەت و کەیف خۆش بی. کەریم گیان کەمال هاتبۆوە ماڵێ، حاڵی زۆر باشە. شلێر دوو رۆژ بو نەخۆش بوو. من نە دەچوومە کارێ، لەماڵێ ئاگام لێبوو. منیش نەخۆشم. پشتم دێشێ. کەریم گیان نامەی کاک رەحمانی دەگەڵ پاکەتەکە پێم گەیشتن، جێ بە جێ ناردم. دوو

وێدکا دەگەڵ جانتاکەی دەستی دام بە برای خۆشەویست کاک نادر کە بۆت بێنێ.. ئەو شتانە بۆ منداڵەکانی مامۆستای، بۆ گەلاوێژ و محمدی. کەریم گیان تۆ خۆت نارەحەت مەکە. دەفیکری ئێمەدا مەبە. ئێمە هەر چۆنێکی بێ بەڕێدەچین. دەمانەوێ هەر ئەتۆ و برادەران ساغ و سلامەت بن. کەریم گیان تۆ نابێ ئەو برادەرانە بە جێ بێڵی، هەتا بە یەکجاری جێگایان بۆ پەیدا نەکەی. تۆ دەخەمی ئێمەدا مەبە. کەریم گیان جێژنی کریتکارانت لێ پیرۆز بێ. ناتوانم چیدیکە بنووسم. دەستم دەلەرزێ. پێم خۆشە تەلەفونم بۆ بکەی. زۆر نارەحەتم. زۆر سلاو لە برادەران دەکەم. کەریم گیان ئەوە لوکانکەم بۆ ناردی بۆ مەزە. دەپێشدا پاکی دەکەن و ورد وردی دەکەن. بە سلامەتی بێخۆن دە گەڵ مامۆستا هێمنی. کەریم گیان لێرە قەندی کلۆ وەگیر ناکەوێ، بە جەلالی بڵێ، هێندێک قەندم بۆ بشکێنێ، بۆم بنێرە. هیوادارم بە کەیف خۆشی بژی. Ahoj .
خەجیجی تۆ.

**نامە بۆ دیکی کەمال ٧٧/٦/٥**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش ! چاوەکانت ماچ دەکەم. هەرچەند دەزانم زۆر نارەحەتی، بەلام چار نیە. نابێ خۆت نارەحەت بکەی. من حاڵم باشە و نەخۆش نیم. بەلام بێجگە لە نارەحەتی و دژواری وەزعی ئێرە و کاری زۆر و خەمی برادەران، خەفەتی دووری و تەنیایی تۆش بۆتە سەر بارێک و هەمیشە بیر و فیکری داگیر کردووم. زۆر بە ئاواتم دەرفەت هەبێ، سەرێکتان بدەم و ماوەیەک لە ئامێزی گەرمی تۆدا بحەسێمەوە.

وەزعی ئێمە هەر وەک خۆیەتی. برادەران هەر وا لە ڕمادین و ڕێگای گەڕانەوەیان نیە. بە بۆنەی تەواو بوونی مەدرەسەی شلێرێ حەرفێکی Sh و زنجیرێکم بۆ نارد، هیوادارم پێی جوان بێ. لە بارەی کارەکەت ئەگەر زۆر نارەحەت و هیلاکی ، وازی لێ بێنە. ئەو هاوینەی کاک عەزیز لە گەڵ منداڵەکانی دێتە سۆفیا و بێگومان سەردانی تۆش دەکا، دوکتۆر عبدالرحمانیش قەرارە بە ژنەوە بێ و میوانت بێ. زۆرم پێخۆشە و بێگومان لە میوانداریت خۆشحاڵ دەبن. تکایە ئەو نامەیە زۆر زوو بۆ کاک رەحمانی بنێرە. هیوادارم بەو زوانە بە دیدارتان شاد بم. ماچت دەکەم. Ahoj , kerimi to.
5/6/77

**هەوەڵین خەتی کوردی شلێری کچمە، بۆ تاریخە:**

ڕۆژ باش بابە گیان. نامەکەتم پێ گەیشت زۆر سوپاس بۆ بلوزەکە. من باشم. باش دەخوێنم. بابە گیان ئەگەر شاڵواری شینت وەگیر دەهکەوێ بۆ لێنە، شاڵواری دیکەی ئی کاوبۆی بۆ بنێرە، من لە سەر مەکنێتۆفۆن ڕاوەستاوم. ئەگەر بتوانی دامێنێکی درێژی وەکو ئی دایکم بۆ من بنێرە. ئەمیش ئەوە فێری کوردی بومە زۆر سڵاو لە برادەرەکان دەکەم. خوا حافیز، کچی خۆت شلێر. کچی خۆت شلێر.

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ، ٧٧/٦/٢٥**

خەجیج گیان شەو باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. ئێستا شەو لە گەڵ دوکتۆر رەشید لە ماڵی چیچۆم. یەکی ئەمێن دەهاتەوە سۆفیا، دەرفەت بوو نامەت بۆ بنووسم. زۆر بەداخەوەم نەمتوانی لە جێژنی دیپلۆم وەرگرتنی شلێردا بەشدار بم. هیوادارم بە خۆشی دیپلۆمی شلێرتان وەر گرتبێ. من هێشتا پاسپۆرتەکەیان نەداومەوە. بە بۆنەی تەواو بوونی مەدرەسەمەوە لە جیاتی من شلێرێ ماچ بکە. ئێستا خواردوومەتەوە، ناتوانم نامەی بۆ بنووسم. بە شلێرێ بڵێ، با خۆ ماندوو بکا و بۆ چوونی زانستگا ئیمتحان بدا و مەمنونی کەس نەبێ. خەجیج گیان! لە وانەیە لێرەوە بچمە فەڕانسە بۆ دیتنی کاک رەحمان، دوایە بێمەوە سۆفیا. ئەگەر ڕۆژنامەی کوردستانت بۆ هاتوون، بۆمان بنێرە. هیوام وایە زوو چاوم بە دیدارتان ڕوون بێتەوە و لە ئامێزت دا بحەسێمەوە. زۆر ماندووم. وەرگێڕانی کتێبی ( دایکی ماکسیم گۆرگی)م تەواو کرد. داومە بە سانسۆر لە وانەیە کۆڕی زانیاری کوردی بۆم چاپ بکا. لەبەر ئەوەی لێرە میوانی دیکەش هەن، نەمتوانی نامە بۆ منداڵەکان بنووسم. لە جیاتی من ماچیان بکە. سڵاوی کاک حەسەنی دەگەیێنم. بڵێ نامەکەی گەیشتوە. بەخۆشی بژی. Ahoj kerimi to 25/6/77

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ، ١٩٧٧/٧/١٤**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە خۆشی بژی. من حاڵم باشە و بەئاواتی ئەو ڕۆژەم بگەمەوە لات و تێر بحەسێمەوە. خەجیج گیان ! ڕۆژی بیست و چواری مانگ، ئێمە بەیانی بە فڕۆکەی بولغاری دەگەینە

سۆفیا . برادەران هەموویان لە گەڵ من دەبن. ڕۆژی دوو شەمۆ دەچینە پاریس. شەو لە سۆفیا وەک ترانزیت لە هۆتێل سەردیکا دەبن. بەڵام دیارە بۆ نان خواردن هەر دەبێ میوانی تۆ بین. بێگومان وەک پێویستە میواندارێمان دەکەی. تەلەفون بۆ کەماڵیش بکە ڕۆژی شەمۆ بیست و سێیی مانگ بێتەوە، بێتە فرۆکە خانەش. تۆش ئەگەر بتوانی بێی پێم خۆشە. دیارە من پاش گەڕانەوە لە پاریس چەند ڕۆژێک لە سۆفیا دەمێنمەوە. بە کەسی دیکەش مەڵێ برادەران دێن و دەچنە پاریس. من ئێستا دەچمە کوردستان. کە گەڕامەوە تەلەفونت بۆدەکەم. چت پێویستە بۆ خۆت و بۆ ماڵێ، پێم بڵێ لە گەڵ خۆمان دەیهێنین. ماچت دەکەم. Ahoj kerimi to 41/7!1977

**نامە بۆ دایکی کەماڵ، ١٩٧٧/١٠/١**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. من وا بە سەلامەتی گەیشتمەوە بەغدا. برادەران هەموو هاتبوونە فرۆکەخانە. خوشکە ڕوناک و مۆژدەش هاتبوون سوپاسیان دەکەم. بەڵام لە ڕێگا و لێرەش هەر دەفیکری تۆ دابووم دیسان بە تەنیا مایەوە و هەر لە ژوورێدا حەپس دەبی. تکایە خۆت نارەحەت مەکە. بچۆ دەرێ، بچۆ گەڕانێ. لە ماڵی بە نووسین و خوێندنەوە، تۆڵەی تەنیاییەکەت بکەوە. ئەگەر کاری شلێرێ وەدرنگی کەوت، خۆت وەدوای کەوە. شەرمێ مەکە و خۆشت تورە مەکە. ئێمە حاڵمان باشە، برادەران هەموو سڵاوت دەکەیێنن. هێشتا هەوا زۆر گەرمە. ئێتر خۆشیت. , Ahojکەریمی تۆ
1/10/977

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ، ٧٨/٢/٢٨**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم هیوادارم ئێستا چاک بوو بێتەوە و دەنگت کرا بێتەوە. من حاڵم باشە. بەڵام دووری لە تۆ و تەنیایی تۆ، بۆ من بۆتە خەمێکی دایمی و هیچیش ناکرێ. تا ئێستاش هیچ جوابیان نەداوینەوە. نازانین مەسەلە چیە و چ نەخشەیەکیان بۆ کێشاوین.. پێم خۆشە ئاگادارت بکەم کۆڕی زانیاری کوردی کتێبی (دایکی) چاپ کرد و پارەی کتێبەکەشی دامێ. سەتی بیستی پارەکەم داوە بە حیزب. نیوەم بۆ تۆ ڕاگرتوە، کەماڵ و شلێر هەر یەکەی ٥٠ دۆلارم بۆ داناون. بۆ برادەرانی ئێرە کە پێکەوە

دەژین، بە تێکڕایی دیاریم بۆ کڕیون و بۆ ژنەکانیش. پێم وایە ئەو کارەت پێخۆش دەبێ،. بووردەی ژمارە ١١ م بۆ ناردی. بۆ ئاگا دریت بابی کاک مستەفای شێخی کۆچی دوایی کردوە و کچی ئاغا بیوە ژن بۆتەوە. بە داخەوە لێرەش نی بچیە سەرخۆشی کچی ئاغا. برادەران هەموو سڵاوت دەگەیێنن. ئەو نامەیە زوو بۆ باوکی مینا بنێرە. ماچت دەکەم .Ahoi kerimi to28/2/78

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٢/٧/ ٩٧٨**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە خۆشی بژی و قەت دڵشکاو نەبی. پاش گەڕانەوەی تۆ زۆر هەست بە تەنیایی دەکەم. ئەو بەینە هەر لەماڵێ وەدەر نەکەوتووم. زۆر بە جیددی خەریکی نووسینەوەی چیرۆکەکانم. ٢٦ چیرۆکی کە کردبوومن بە کوردی، ئێستا پاکنویسیان دەکەم و دەیاندەم مامۆستا هێمن تەماشایان دەکا، خەریکم بیاندەم بە ڕەقابە، بەڵکوو موافەقەت بکەن چاپ بکرێ. ڕەنگە ڕۆشنبیری کورد چاپیان بکا. دەستم کردوە بە وەرگێڕانی کتێبێکی دیکە بە ناوی (ئەفسانە کوردییەکان) ٤٠٠ لاپەڕەیە. ئەگەر تەواوی بکەم لە وانەیە کۆڕی زانیاری کوردی چاپی بکا. کتێبێکی باشە. کتێبی(دایک)لە بازاڕ تەواو بوە. خەڵک بە دوایدا دەگەڕێن. داوەمە بە ماڵی باوکی سامان کە چاپی بکەنەوە. پارەشم لە وان ناوێ. هەر دەمەوێ بڵاو بێتەوە و بگاتە دەستی کوردان.. تۆش ئێستا بێکاری، دەست بکە بە خوێندنەوەی تا تەواوی دەکەی. نامەکەت چاوی ڕوون کردمەوە. هاتنەوەی من جارێ مەعلوم نیە. هیچ کارتێکت بۆ ماڵی سەید مریەم وکەریم حەداد نە نووسیوە. خۆ نووسینی کارت هێندەی پێناوێ. لە بارەی سەفەری شلێرێ بۆ ماڵی کاک سەلاحی، وەزعی لوبنان زۆر ناڵۆزە. پێم خۆش نیە سەفەری وابکا. بۆ خۆشم نامەی بۆ دەنووسم. ئەگەر بتوانم زۆرم پێ خۆشە بۆ ڕۆژی لە دایکبوونی کەمالی بێمەوە. ئەو ساڵ کەمال دەبێتە ٢٠ ساڵ. دیارییەکی باشی بۆ بکڕە و جێژنی بۆ بگرە. جارێ بۆ ئەم حەوتوە ڕەنگە بەسبێ. چاوەکانت ماچ دەکەم. خۆشی تۆم ئاواتە. Ahj , kerimi t0 2/7/87

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ١٩٧٨/٩/٢٧**

خەجیجی خۆشەویستم ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. بە بۆنەی ڕۆژی لە دایکبوونت پڕ بە دڵ پیرۆز باییت لێدەکەم. سڵامەتی و بەختەوەری و خۆشی و شادیت بە ئاوات دەخوازم. هیوادارم لە ژیانت دا هەمیشە سەر بەرز و بێ خەم ودەرد و کوێرەوەری بی. چەندەم پێخۆش بوو ئەم ڕۆژە لە کن تۆ بام و پێکەوە ئەو جێژنەمان گرتبایە، بەڵام بە داخەوە ژیان جارێ لێکی دوور خستووینەوە و خەبات لە ڕێی بەختەوەری نەتەوە و نیشتماندا ئەوەی بە دواوەیە. لێرە بە خۆشی تۆ جێژن دەکرم. خۆشیت بە ئاوات دەخوازم. جارێکی تر ماچت دەکەم. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. Ahoj Kerimi to

**نامە بۆ شلێری کچم کە دوای گەڕانەوە بۆ ئێران لە تارانەوە بۆم نووسیوە.**

شلێر گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوا دارم لە گەڵ دایکت بە خۆشی بژین. شلێر گیان هاتنەوەکەم زۆر خۆش بوو. بریا ئێوەش لە گەڵ من بان. تا زانیبات بابی تۆ لە لای خەڵکی خۆمان چەندە خۆشە ویستە. لە گەڵ دایکت ڕەسمی تازە بە جیاواز بکێشن، بۆم بنێرن. بزانن ئەگەر برادەرە ئێرانیەکان، ئێستا چوونە سەفارەتی ئێران، ئێوەش بچن و داوای پاسپۆرتی ئێرانی بکەن. هیوادارم ئێوەش بتوانن هاوینێ بێنەوە. ماڵە خاڵت و پورەکانت. بێنەوە نێو میللەتی خۆتان.

زوو بە ئادریسی خاڵت نامەم بۆ بنووسە هەوڵ دەدەم شریتی قسەکانی خۆمت بۆ بنێرم کە لە نەغەدە لە کاتی پێشوازی خەڵکدا تۆمار کراوە. ئێستا لە تارانەوە ئەو نامەت بۆ دەنووسم. دوو ڕۆژی دیکە دەچمەوە کوردستان. وەزعی کوردستان زۆر خۆشە. هیوا دارم زوو دەرس و مەدرەسەتان تەواو بێ و لە گەڵ دایکت وکەماڵی بگەڕێنەوە. لە جیاتی من دایکت سوکەماڵی ماچ کە. نامەم بۆ دایکت و بۆ کەمالیش نووسیوە. بە خۆشی بژی. بابی خۆت کەریم. ٧٩/٣/٢٩

**نامە بۆ دایکی کەماڵ.٧٩/٤/١**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە خۆشی بژی.

کارت و نامەی دوور و درێژم بۆ نووسیوی، نازانم کەنگێ پێت دەگات. من حاڵم باشە. دووری تۆ نەبێ، خەمی دیکەم نیە. چەندە بە ئاوات بووم لەو سەفەرە لە گەڵ من بای. لە کانگای دڵمەوە سوپاسی ئەم خەڵکە وەفادارە دەکەم کە چەندە ڕێزیان لێگرتووم. ماڵی بابت شوکر حاڵیان باشە. هەر شەوێک لە نەغەدە بووم. کاک سمایلی برات خەریکە پاسپۆرت وەر گرێ و بێ سەرتان بدا. ئەگەر مەدرەسەی منداڵەکان تەواو بوو، ئێوەش هیوادارم بێنەوە. تاران شارێکی گەورە و پیس و شلوقە. شت زۆر گرانە. بە ئادرێسی نەغەدە ماڵی بابت، عەکسی خۆت و کەمال و شلێرم بۆ بنێرە، بەڵکوو سجلی ئێرانیتان بۆ وەر بگرم. نازانم سجل و کتێب و شتەکانی ئێرەمان چییان بە سەر هاتوە. بچوونە سەفارەتی ئێران و داوای پاسپۆرتی ئێرانی بکەن. خەریک بە بە باشی لێخوڕینی ماشێن فێر بی. بە ئادرێسی تۆ ڕۆژنامەم بۆ کاک حەسەنی ناردوە، جا نازانم کەنگێ دەگاتێ. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم و هیوادارم قەت خەمبار و دڵشکاو نەبی. ئەسعەدی کوری کاعەلی لێرەیە. لە مەدرەسەی فڕۆکەوانی دەخوێنێ، ڕۆژانە دێتە لام. زۆر سڵاوت لێدەکا. سڵاوی کەمال و شلێر دەکەیێنێ. بە خۆشی بژی. Ahoj ,, kerimi to 1/4/79

**نامە بۆ دایکی کەمال، ٧٩/٤/١٥**

خەجیج گیان ڕۆژ باش. چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بە خۆشی بژی. من حاڵم باشە. بەلام کار زۆرە و هیچ ئیستراحەتم نیە. ئێستا وەزعمان باشە. ئەو نامەیە لە شاپورەوە، شارێکی نیزیک سنووری تورکیا بۆت دەنووسم. بۆ کاری حیزبی هاتوومە ئەو شارە. تا ئێستا هیچ نامەی تۆم پێنەگەیشتوە. ماڵی کاک ئەحمەدی زۆر باشن. چەند جار چوومە سەردانیان و یا بۆ کاری حیزبی چوومە نەغەدە. چاوەڕوانن لە گەڵ منداڵەکان بگەڕێنەوە. کاک سمایل کوڕێکی زۆر باش و پیاوە. بۆم بنوسە بزانم بۆ هاتنەوە فیکری چیت کردەوەتەوە؟. پێم وایە دەبێ پاسپۆرتی بوڵغاری وەر بگرن. چاوە ڕوانین کاک حەسەنیش بگەڕێتەوە. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. بە خۆشی بژین. Ahoj . kerimi to ٩٧/٤/١٥

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٧٩/٥/٢**

خەجیج گیان ڕۆژ باش ! چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم سلامەت بی و بە خۆشی بژی. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. لە بێخەبەریت زۆر نیگەرانم. بە کاک جەلالم گوتبوو تەلەفونت لێ بکا، ئەویش تەلەفونی کردبوو، هەر شلێرلە ماڵێ ببوو.. ئەو کاک جەلالە برای حومیرایە کە دەیناسی. ئێستا ماڵیان لە تارانە. لە وەزعی نەغەدەی نیگەران مەبە. ماڵی بابت هەموویان سلامەتن. کاک ئەحمەد لە مەهابادە و ژن و منداڵەکانیان لە شنۆیەن. شەڕی نەغەدە بەلایەکی زۆر گەورە بوو بە ملمان دا هات و زیانێکی گەورە بوو. کوردەکان هەموو ئاوارە و دەر بەدەر بوون. من پێنج ڕۆژ لە نەغەدە لە گەڵ مامۆستا مەلاسالحی لە گەمارۆ دابووین. دەورەمان گیرا بوو. بەلام خۆمان ڕاگرت. ئێستا حالم باشە. بەلام کارم زۆرە و زۆریش هیلاکم. نامەی تۆم هیچ پێنەگەیشتوە. نازانم بۆ پاسپۆرتی ئێرانی چیتان کردوە.؟ من هێشتا بێ خانووم و هەر بوومەتە سەر باری ماڵی وسیناغا و ئەوانیش هێندەم خزمەت دەکەن لە نووسین نایە. دەمەوێ ئەوەشت پێ بڵێم لە کوردستان لە نێو خەڵکدا جێگای ڕێز و ئیحترامم. چۆنی تۆ پێت خۆشبێ ئاوایە. خوشکم و کوڕەکانی چاوتان ماچ دەکەن و سلاوت دەگەیێنن. کاک ئەحمەد و سمایل و حەسەن چاوت ماچ دەکەن. ئێستا لە ورمێ ڕا ئەو نامەت بۆ دەنووسم. وەک نوێنەری حیزب لە کومیسیۆنی کاری نەغەدە لە تێکۆشاندام. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم. چارێ خۆشیتان . 2/5/ 79

Ahoi , kerimi to

**نامە بۆ شلێری کچم لە مەهابادەوە ٧٩/٥/١٩**

شلێری خۆشەویستم ڕۆژباش. ڕەسمە جوانەکەت و نامە شیرینەکەت چاویان ڕوون کردمەوە. خەتە کوردییەکەت زۆر جوان بوو. شلێر گیان حالم باشە و بەلام کارم زۆرە. زۆر ماندووم، خەڵک زۆر دێنە لام و خۆشیان دەوێم. لەو بارەوە چۆنی دایکت پێی خۆشە وایە. کاک ئەحمەد و خاڵت چاوت ماچ دەکەن. نازانم بۆ هەر سێ ڕەسمت نارد بوون. جێبەجێ لێیان هەستاندم. زۆر دەفێکری ئێوەدام. بە تایبەت زۆرم پەرۆشی دایکتە. دەزانم زۆر بە تەنیایە. تۆش هەر لە زانستگای. مەگەر هەر خۆی بە ماشینەوە خەریک بکا. زۆرم پێخۆشە باش فێری لێخوڕین بێ. هیوادارم لە ئیمتیحانەکانت دا سەر کەوتووبی، هاوینێ لە

گەڵ دایکت و کەماڵی بێنە لای من. ئێرە زۆر خۆشە. ئەو هەموو خزم و دۆست و برادەرانە چاوە ڕوانن ئێوەش بێنەوە. شلێر گیان زوو نامەم بۆ بنووسە. بە دایکت بڵێ زۆر بنووسێ و بخوێنێتەوە، با خەتی خۆش بێ. لەوانەیە خاڵت بێ سەرتان بدا. لە کەماڵیش هەر بێخەبەرم. نازانم بۆ نامەم بۆ نانووسێ؟ ئەو جار بە ئادرێسی مەهاباد نامەم بۆ بنووسە. ئێستا لە ماڵێکی دەژیم گەلێک لە ماڵی خۆمان باشترە. ژوورێکیان بۆ فەرش کردووم و بە هەموان خزمەتم دەکەن، وەک تۆ قاپانم پێ ناشۆن.

شلێر گیان زۆرت ئاگا لە دایکت بێ. زۆر جار لە گەڵی بچۆ دەرێ، بچنە سینەما. کتێبی ئەلف و بێی چەکی و بولغاری و ڕووسیم بۆ پەیدا کەو بۆم بنێرە. کتێبی کلاسی یەکی منداڵان. لە جیاتی من دایکت و کەماڵی ماچ کە. بەو ئادرێسەدا نامەم بۆ بنێرە( ایران آذربایجان غربی- مهاباد. کوچه سه آشان منزل آقای حسین احدی- کریم حسامی. ئیتر ماچت دەکەم بە خۆشی بژین .

بابی خۆت، Kerim 19/5/79

**نامەی مامۆستا حەسەنی قزلجی بۆ دایکی کەمال، بێ تاریخ**

خوشکە خەجیجی بەڕێزو موحتەرەم ڕۆژ باش. هیوادارم سلامەت و دڵخۆش و شاد بی. لە نەخۆشی و دەردو بەلایان دوور بی. منیش حاڵم باشە. زۆر سوپاست دەکەم کە منت یارمەتی د او بەڕێت کردم. هەر بژی خوشکی خۆشەویست. چاوی کەمال و شلێر ماچ دەکەم. ئیتر خۆشیتان دەخوازم برات حسن قزلجی.

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٧٩/٧/١١**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. نامەکەت کە پاش ١٨ ڕۆژان گەیشت، چاوی ڕوون کردمەوە. بە دیتنی رەسمە جوانەکانتان دڵم گەشایەوە. نووسیوتە نامەم بۆ نانووسی. خەجیج گیان تا ئێستا چەند نامەم بۆ نووسیوی. نازانم بۆ نەگەیشتوون. نامەم بۆ کەمال و شلێریش نووسیوە. خەتای پۆستی ئێرەیە.. نازانم ئێوە چتان کردوە. لە بەر ئەوەی ئیدارەی سجلی نەغەدە سووتاوە، نەمتوانی سجلت بۆ وەر بگرمەوە. نامەیەکی ئیدارەی سجلی

مەهابادم بۆ ناردی، ڕەنگە پێت گەیشتبێ. هیوادارم بتوانن پاسپۆرتی ئێرانی پێ وەرگرن و بێنەوە.

من خەریک بووم پاسپۆرت وەر گرم. نەیاندامێ. ڕاستە لێرە شۆرش کراوە و ڕێژیمی شا رووخاوە، بەڵام دام و دەزگایەکە هەر وەک خۆیەتی و ئێستاش هەر بە قانوونی زەمانی شا کار دەکەن. چونکە زەمانی شا چوونەدەری من لە ئێران یاساغ بوە، ئێستاش ئیدارەی پاسپۆرت هەر ئەوەی دەڵێن. دیارە هەر خەریک دەبم، بەڵام زەحمەتە پاسپۆرتم بدەنێ.

خەجیج گیان لێرەدا بە پۆست ناتوانم هیچتان بۆ بنێرم، دەبێ قەرزدار بم. لێرە کارمان زۆرە. زۆر ماندووم و زۆریش کز بووم. ماڵە بابت شوکر هەموویان باشن. هەر چاوە ڕوانن کەنگێ دێنەوە. خوشکم و منداڵەکانی چاوت ماچ دەکەن. ئێستا لە تەلڤیزیۆنی مەهاباد. حەوتووی جارێک لە سەر مێژووی کورد قسان دەکەم. ئەگەر پیاو لە خزمەتی میللەتەکەی دا بێ، نازانێ هیلاکی و ماندوو بوون چیە، دەنا من زۆر هیلاکم. ئەوەش بزانی خانووم نیە. هەر لە ماڵی وسێن مەراغەییم. بەراستی خەجاڵەتیان کردووم ، ئەوەندە خزمەتی خۆم و میوانانم دەکەن، لە نووسین نایە.

خەجیج گیان! چیرۆکەکانی منداڵانیان بە ناوی شلێر و کەمال لە عیراق لە گۆڤاری بەیاندا چاپ کردوە و رەسمی کەماڵیشی تێدایە. نازانم بۆ ئێومیان ناردوە، یان نا؟ بە بۆنەی ڕۆژی لە دایکبوونی کەمالی پڕ بە دڵ پیرۆز بایی لێدەکەم. جارێکی تر چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم. خۆشی و سلامەتی ئێوەم ئاواتە. تکایە کتێبی (لازارێڤ) بە ڕووسی( کورد و مەسەلەی کورد) م بۆ بنێرە. بە ئادریسی مەهاباد. 11/7/79 . ahoj کەریمی تۆ.

**نامەی مەلا رسولی پێشنماز بۆ دایکی کەمال، بێ تاریخ،**

بۆ زۆر بە ڕێز و خۆشەویست براژنە خەجیج پێشکەش بێ. دوای ساڵەها دەر بەدەری و ئاوارەیی لە وڵاتی ئازیزەوە جوانترین سڵاوت پێشکەش دەکەم و هیوام وایە ئێوەش وەک ئێمە بگەڕێنەوە باوەشی دایکی نیشتمان و لە نیزیکەوە بە چاوی خۆت ببینی کە ئێرانی زەمانی شای خائین و خۆ فرۆش لە گەڵ ئێستا کە وڵاتەکەمان ئازادە و دیموکراسی بە تەواوی چەسپاوە. چاوی کەمال و شلێر

ماچ دەکەم، ماڵی ئێمە بە تێکرایی سڵاویان هەیە. کاک حەسەنی قزلجیش هاتۆتەوە و ڕۆژێک چوومە لای بەڵام وادیارە ئەوێی پێخۆشترە. لە گەڵ کاک کەریمیش وەک جاران یەکمان گرتۆتەوە و هەر دووکمان هاتووینەوە دۆخی جاران و هەر گورمەمان دێ. سڵاوم هەیە بۆ کاک حەمە کەریم و هەواڵی جیرانەکانت دەپرسم بە تایبەتی ئەوەی بنەوەتان ژنی کابرا عەرەبەکەی. ماڵی ئێمە بە تێکرایی سڵاویان هەیە و لە بەر گەران و میوانداری هۆشی هیچیان نیە. ئیتر هیوام خۆشیتە، شەپۆل گون هەمبانە سڵاوی هەیە بۆ کەمال. شنە و پنەش لێتان دەپرسن. دڵسۆزت رسول پێشنماز.

**نامەی دایکی کەمال بۆ من، ٧٩/٨/٢٢**

کەریم گیان ڕۆژ باش. هیوادارم هەمیشە ساغ و سڵامەت و کەیف خۆش بی. نامەکەتم پێگەیشت زۆر سوپاست دەکەم. کەریم گیان ڕۆژی شازدەی مانگ سجلم وەر گرت، بەڵام بۆ منداڵەکان دەڵێن دەبێ دوو شاهیدان بەرم بۆ سجلی منداڵەکان. منیش نازانم شاهید چۆن پەیدا کەم. چونکە ئێرانیەکان لێرە نەماون و هەموویان گەڕاونەوە.

کەریم گیان دەبێ بچیە وەزارەتی ئوموری خاریجە لە تاران لەوێ مۆڵبای بنووسی داوای پاسپۆرت بکەی بۆ من و منداڵەکان. دوایە مۆڵباکەی بنێرە بۆ سەفارەتی ئێران لە سۆفیا. هیوادارم تا ئێستا کاک جەلال پێی گوتبی کە من تەلەفونم کردوە.

کەریم گیان ئەورۆ بە ڕادیۆ گوتیان حیزبی دیموکراتی کوردستان قەدەغە کراوە و زۆریان لێ گرتوون، زۆر نارەحەتم. زوو نامە بنووسە و یا تەلەفون بکە. زۆر سڵاو لە سمایلی خۆشەویستم دەکەم. سڵاو لە دۆست و خزم و برادەران دەکەم. ئێمە حاڵمان باشە. ئیدی هەر بە خۆشی و بە سڵامەتی بژی. Ahoj

خەجیجی تۆ. 22/8/79

**نامەی کاک حەمەدەمینی سیراجی بۆ دایکی کەمال، ١٩٧٩/٩/٧**

خوشکی بە ڕێز خەجیج خاتون

لە دوورەوە گەرمترین سڵاوت پێشکێش دەکەم. چاوی کەمال و شلێر ماچ دەکەم و هیوا دارم بە خۆشی و سەر بەرزی بژین. زۆر لە مێژە نە نامەت بۆ

نووسیوین و نە ئێمەش لە بەر گرفتاری توانیومانە نامەیەک بنێرین. ماوەیەکی زۆرە مـان گـرتنی کـارمـەندانی پۆست و دوایەش گـرفـتـاری ئـێـمـە بە جـارێک پێوەندی پێشووی پچراند. هیوامە لە مەو بە دوا ئێوە ئێوە بتوانین بە هۆی نامە ئاگاداری یەکتـر بین. سڵاوی جیرانە ناسیـاوەکـان دەگەیەنم. ڕوناک و خزم و کەس و کاری ئەو وخزم و کەس و کاری ئێوە هەموو سڵامەتن و سڵاویان هەیە. لە گەڵ ئەم نامـەیە نامـەی کاک کەریمیشم بۆ ناردی هیوامـە خـەم ڕەوێنت بێ و دڵنیـاش بە زۆر سـڵامـەت و بە کـەیفە و هـەر دوێنێ برادەرێک دیتوویە و هەواڵی پرسیوە هەر خۆش بی. برات محمدامین ١٩٧٩/٩/٧

## نامە بۆ دایکی کەماڵ ٧٩/٩/١٣

خـەجیج گـیـان ڕۆژ باش. چاوەکانت مـاچ دەکەم. هیـوادارم سـڵامـەت و قـەت دڵشکاو نەبی. ئەو نامـەیـەت لە چیـاکـانی کـوردسـتـانەوە بـۆ دەنووسم. دەگـەڵ پێشمەرگە کەوتووینە چیا. وادیارە چارەنووسی ئێمە هەر واهاتوە کە هەر دەبێ لێک دوور بین و ژیانی تەنیایی بە سـەر بەرین. سـەرەڕای پەریشـانی و هیلاکی ئێرە، شەو و ڕۆژ دەفیکری ئێوە دام و بیر و هۆشم هەر لە لای ئێوەیە. دەمەوێ ژیانێکی ئارام لە گەڵ منداڵەکان بەریە سەر. خۆت نیگەران و ناڕەحەت نەکەی. با منداڵەکانیش ناڕەحەت نەبن.

خـەجیج گـیـان ! خـۆمـان ئـەو ڕێگایەمـان هـەڵبژاردوە و ئەو ژیانـە بۆ تە بەشی ئێمە و چارە نووسمـان. دەمێکە لە ماڵی کاک ئەحـمەدیش بێخـەبەرم. نازانم لە کوێن. خەڵکەکەمان ئاوارە و دەربەدەر بوون. دێهات چۆڵ بوە. شەڕێکی ناڕەوا و قورسـیـان بە سـەردا سـەپاندووین. کاک حـەمـەدەمین ئێستـا لە بەغـدایە. پێم گـوتبـوو ئادریسی خـۆی بۆ تۆ بنووسێ. بێگومـان ئادریسی بۆ ناردووی. بە ئادریسی ئەو نامـەم بۆ بنووسـە. بێـجگە لەوە ئەگـەر بە ئادریسی کـاک عبدالرحمانی شێخی نامەم بۆ بنووسی. لە پیاوەتی ئەو ڕادەبینم کە بۆم بنێرێ. یان بۆ قەلا دزە، ئادریسی ماڵی کاکە شێخەت هەیە. بۆ ئەوانی بنێرە. بڵێسەی کوڕی سەید ڕەسوڵی برینـدارە. ئامانە خان و برادەرانی دیکە سڵاوت دەگەیێنن. لە جیاتی من منداڵەکان ماچ کە و بە گیانی نیشتمانپەروەری و ئینساندۆستی پەروەردەیان بکە. چونکە ئەوە ئامانج و ڕێبازی ئێمەیە. جارێ لە دوورەوە چاوت

ماچ دەکەم. هەرچی ویستت بۆ کاک حەمەدەمینی بنووسە. خۆت لە ژوورێدا قەتیس مەکە. بچۆ سینەما و گەڕان و چار و بار سەری کەماڵی بدە. لە نووسین و خوێندنەوەش خافڵ مەبە، دەبێ تا ئێستا لێخوڕینی ماشێن باش فێر بووبی. دەمەوێ بە خۆشی بژی . Ahoj کەریمی تۆ 13/9/79

**نامە بۆ دایکی کەماڵ، ٧٩/١٠/١٠**

خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم. ئەوڕۆ یادی ئەوە دەکەم کە ڕۆژی لەدایکبوونتە و بە بێ من و بێ دیاریی من هیوادارم دەگەڵ منداڵەکان جێژن بگری و هەمیشە بە خۆشی ڕابوێری. من حاڵم باشە و نەخۆش نیم. لە چیا و لە دێهات دەژیم. بەڵام چونکە لە نێو خەڵکێکی فیداکار و باشدام، ژیانێکی خۆشە. هێندێ کوڕی زۆر باش و پیاوم لە گەڵن. جەعفەری کوڕی خوشکم لە لامە و زۆر خزمەتم دەکا. هیچ نیگەران مەبە. ژیانەکەمان ئاوایە.. من تەنیا خەمی دووری ئێوەم هەیە. پێم خۆش بوو لێرە لەگەڵ من بای تا فیداکاری ئەو میللەتە باشەت دیبایە. دەمێکە لە سمایلی برات بێخەبەرم.

خەجیج گیان! ئەگەر دەتەوێ، پاسپۆرتی بولغاری وەر گرە. بچۆ سەفارەتی عیراق و داوای ڤیزا بکە. ئەگەر ڤیزات بدەنێ و بچیە عیراق، دەتوانم بێم چاوم پێت بکەوێ. تەلەفون بۆ کاک حەمەدەمین بکە لە بەغدا، ئەو ڤیزات بۆ دەنێرێ. پێش هاتنت تەلەفون بۆ کاک حەمەدەمین و یا مامۆستا عەبدە بکە، ئەوان خەبەرم دەدەنێ و دێمە لات. دەتوانی بۆ تارانیش بە ئادریسی کاک جەلالی پاکزاد نامەم بۆ بنووسی. لە باتی من منداڵەکان ماچ بکە و خۆتان نارەحەت مەکەن. ئیتر خۆشی تۆم ئاواتە. هیوادارم ئەو سەفەرەت بۆ ڕێک کەوێ وبە دیدارت شاد بم. خۆشیتان. Ahoj kerimi to 10/10/79

**نامەی کاک سەلاح بەدرەدین بۆ دایکی کەماڵ، ١٩٧٩/١٠/١٨**

خوشکی بەڕێز دایکی کەماڵ

زۆر سڵاو، پرسی هەڤالی ئێوە دەکەم. کاک ئەمیر لێرە بوو، وەزعی برادەران زۆر باشە. کاک کەریم سڵامەتە.

دیارە ڕۆژێک هات، جارێکی تر دێتەوە. ڕەنگە کاک کەریمیش بێت. زۆر پێمان خۆشە تۆش بێیتە بێروت. دایکی ئەڤین زۆر سڵاوی هەیە. زۆر سڵاو بۆ کەماڵ

و شلێر. دیارە کاک محەمدامین لە بەغدایە و ڕوناکیش لە وێیە. من بۆ وان نارد کە تەلەفون بۆ تۆ بکەن نازانم بووە یان نا. زۆر سلاڤ. باوکی ئەڤین.

**نامەی کاک حەمەدەمینی سراجی بۆ دایکی کەمال ، ١٩٧٩/١٠/٢٠**

خوشکە خەجیجی بەڕێز ! دوای سڵاو، تا ئێستا چەند نامەی خۆم و بابی کەمالم بۆ ناردووی کە چی هیچ خەبەرێکت نیە. هیوامە لە خێر و خۆشی دابی. چاوی کەمال و شلێر ماچ دەکەم. سڵاوی دایک و باوکی نادا و ئاری و باقی دۆست و ئاشنایان دەگەیێنم. ڕووناک گەلێک سڵاوتان دەگەیەنێ و چاوی منالەکان ماچ دەکا.

خوشکی من! داوایە خەبەری ساخ و سلامەتی خۆت و منالەکانمان بۆ بنووسی. نیگەرانی ئێمە مەبە. بابی شلێر زۆر باشە و هەر ئێستا لەو شارەیە کە لێی لە دایک بووین و هاتووین. هەواڵی ساخی ئێوە نیگەرانی ئێمە و باقی خزمان لە بارەی دووری و بێ خەبەری ئێوە لە ناو دەبا. چاوە ڕوانین دەست بدەیە قەڵەم و لە سەری تووری هەتا بنی گێزەر لە بارەی ساخ وسلامەتی و وەزعی خۆتانەوە بنووسی بۆ ئەوەی بە باشی ئاگاداری وەزعت ببین و بە تایبەتی بابی شلێر خەفەتی لای ئێوە و بێ خەبەریتانی نەمێنێ. خزمەکانتان سڵامەتن و ئەحواڵت دەپرسن. سەر لە نوێ سڵاو. برات مینە. ٢٠/ ١٠/ ١٩٧٩

**نامە بۆ شلێری کچم ٧٩/١٠/٢٦**

شلێر گیان ڕۆژ باش! لە دوورەوە چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم بەخۆشی بژین و هەمووتان سڵامەت بن. من حاڵم باشە. نەخۆش نیم. بەڵام دووری لە ئێوە و بێخەبەریتان بە ڕاستی بۆتە دەردێکی سخت و هەراسانی کردووم. چەند نامەم بۆ ناردوون، نازانم بۆ جواب نادەنەوە. ئێستا چەند ڕۆژە هاتوومەوە نێو شار. بەڵام هەر لە ژوورێدام و وەدەر ناکەوم. وەزعمان باش و نیگەران مەبن. نامەم بۆ دایکت ناردوە ئەگەر بتوانێ بێتە کن کاک حەمەدەمین، دەتوانم بچم ببینم. ئەگەر ئێستا نەتوانێ، بەفر چیاکان دەگرێ و دەرباز بوون دژوار دەبێ. ئەگەر تەمبەڵی نەکەن و نامەم بۆ بنووسن، لەوانەیە هەر لە مەهاباد پێم بگات. ئەگەر لە شاریش نەبم، هەر دەگاتە دەستم. هەموو ڕۆژ برادەران دێنە لام.

کەماڵیش نامەی بۆ نەنووسیوم. لە وانەیە بابی خۆتان لە بیر چوو بێتەوە. هەر چەندە باوەڕ ناکەم. من ئێستا بە خەیاڵ و فیکری ئێوە دەژیم و زۆریش لە خەمی دایکت دام. نازانم چدەکا، چۆن دەژی. هیوادارم ئێوە وەک هەمیشە دڵی دایکت ڕابگرن، لە باتی من دایکت و کەماڵی ماچ کە بەو ئادرێسە نامەم بۆ بنووسە:( ایران- مهاباد-خیابان زند- منزل اقای حسین احدی.) جارێکی تر ماچتان دەکەم. بە خۆشی بژین . Babi xot kerim 26/10/79

**نامە بۆ دایکی کەماڵ ، ٨٢/٤/٧**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش! چاوەکانت ماچ دەکەم. پاش ماوەیەکی زۆر بێخەبەری و خەمی دووری ڕۆژی حەوتی ئەپریل کارتە جوانەکە و نامە شیرینەکەم پێگەیشت. پێش چەند ڕۆژ پشتی چاوم دەپەڕی. هەر چاوەڕوان بووم خەبەری خۆشی ئێوەم پێبگات. باش بوو بەهاتنی نامەکەت گەشامەوە، چاوم ڕوون بۆوە. بە تایبەت ئەو هەموو خەبەرە خۆشەی تێدا بوون. سلامەتی خۆت و خوێندنی کەمال و کورسەکەت. هیوادارم بە سلامەتی و بە سەر کەوتووی کورسەکەت تەواو بکەی. کارێکی باشە. چەند ڕۆژ پێش برادەرانی باوکی فێنک لە لام بوون. قەرارە نامە بۆ باوکی فێنک بنووسن لە سەر خوێندنی کەمالی. چاکە شوکر ئەوا دەستی بە دانشگا کردوە. بە نە چوونی کەمالی بۆ دانشگا زۆر نارەحەت بووم.

خەجیج گیان بۆت نە نووسیبووم کە شلێر چۆتە خەستە خانە. خۆشی نەینووسیبوو. نووسیوتە دوو مانگە نامەم پێ نەگەیشتوە. لانی کەم مانگێ دوو نامەم نووسیون. وادیارە لە عیراقەوە نامە ناگەن. نازانم باسی خۆم چیت بۆ بنووسم. حاڵم باشە. تەنیا خەمی تەنیایی تۆ نارەحەتی کردووم و پەرۆشی کەمال و شلێرمە و عەجایب ئارەزووتان دەکەم. زۆر شەو خەونت پێوە دەبینم. ئێستا کوڕی مریەمی خوشکەزام لە لامە. کوڕێکی باش و ژیرە. خەتی زۆر خۆشە. کوردی باش دەنووسێ. دووری ئێوە نەبێ خەمی دیکەم نیە. خەریکی نووسین و وەرگێران و کاری ڕادیۆم. لە هەموو کوردستان برادەران دێنە لام و سەرم دەدەن. شتم بۆ دێنن. لەو شاخە ماڵێکی خۆشم بۆ ساز بوە. دوو لبادیان بۆ هێناوم. برادەرێک سەماوەری بۆ هێناوم. باوکی سەر باز. لە برادەرانی باوکی فێنکە چرای بچوکی گاز و فتیلەی گازی بۆ هێناوم. نوێن و شتی تریان

بۆ هێناوم. برادەران دێن لە کن من دەحەسێنەوە. زۆر سەیرە ژوورەکەم پڕ بوە. بەلاّم بە بێتۆ هەر تەنیام و هەر ناخۆشیە.
خەجیج گیان! لە وە نارەحەت مەبە کە نەچوومە کۆنگرە و بەشداریم نەکردوە. نەچونم بۆ کۆنگرە ئیحترام و خۆشەویستی من لە لای خەلّک نامێنێتە خوارێ. بە داخەوە فڕ و فێلّ و نابەسامانی سەرانسەری حیزبی داگرتوە. بەو حالّەش چار نیە و دەبێ خەبات درێژە پێ بدرێ. مالّە کاکە شێخە زۆر نامەم بۆ دەنووسن. نووسیبوویان نازانین چۆن خواردنت بۆ بنێرین.
لە مەودوا نامە بۆ پاریس بنێرە. کاک عەزیزی مامڵێ لە وێیە ، ڕایان ئاگرێ و بۆم دەنێرێ. نامەکەم بە ئاواتی دیتنەوەتان کۆتایی پێدێنم. بەو هیوایە بتوانم بە زوویی بە دیدارتان شاد بم و لە ئامێزی گەرمی تۆدا تێر بحەسێمەوە. بە دیتنی کەمال و شلێری خۆشەویستم خەم و پەژارەی دووریم لە بیریچێتەوە. خۆشیتان ئاواتمە.. Ahoj kerimi to 7/4/82

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٨٣/٤/٢٢**

خەجیج گیان ڕۆژ باش ! لە دوورەوە چاوت ماچ دەکەم. هیوادارم ساغ و سلاّمەت و دوور بی لە دەردو بەلاّ. چەند ڕۆژ پێش لە گەلّ کارتێکی پیرۆزبایی ڕۆژی لە دایکبوونی شلێر نامەم بۆ ناردووی، بۆ کەمالیشم نووسیبوو. هیوادارم تا ئێستا بە دەستت گەیشتبێ. من حالّم باشە. بەلاّم زۆر لەمێژە لە ئێوە بێخەبەرم و نامەتان نەهاتوە. نیگەرانی وەزعی ئێوەم. لە نامەی پێشوودا خەبەری کوردستانم بۆ نووسیبووی. لە سەرانسەری کوردستان شەڕ توندە. حکوومەتی ئێران ئەرتەش و پاسدار و جاشی بە کوردستان وەر کردوە. هەر ئێستا کە ئەو نامەت بۆ دەنووسم خەبەرمان بۆ هات لە لاجان و شنۆ پێشمەرگە لە گەلّ پاسداران و پێشمەرگەی پارتی تووشی شەڕێکی گەورە بوون. لە سەقزی پێشمەرگە چوونە نێو شار و دەستی باشیان لە پاسداران وەشاندوە. خەلّک بە هەموو تواناوە پشتی پێشمەرگە دەگرن. ژن و پیاو نان و ئاو بۆ پێشمەرگە دەبەنە چیا. ئێستا وەک نووسیبووت، کەمال دەبێ لە مالّێ بێت. هیوادارم وەک من دەمەوێ کوڕێکی باشبێ و باش بخوێنێ و لە خزمەت تۆدابێ. من ئێستا بێجگە لە کاری ڕادیۆ و وەرگێڕانی کتێب، خەریکم زمانی ئینگلیزی

دەخوێنم. مامۆستایەکی یەکجار زۆر باشمان هەیە. بۆ شلێرتم نووسیبوو( سلّۆڤار)ی فەلسەفی و سیاسیم بۆ بنێرێ. بینێرن بۆ فەرانسە بۆ لای کاک عەزیز ئەو بۆم دەنێرێ.
خەجیج گیان خۆت نارەحەت مەکە. لە گەڵ کەمال بچۆ دەرێ. بچۆ گەڕانێ. کەماڵی فێر کە لە گەڵت سواری ماشێن بێ. نازانم وەزعی ماشێنەکەتان چۆنە؟ لە وەزعی ژیانی خۆتان ئاگادارم کە. لە جیاتی من منداڵەکان ماچ بکە و بەخۆشی بژین، سەربەرزییت ئاواتمە. Ahoj , kerimi to 22/4/83

**نامە بۆ دایکی کەمال ، ٨٣/٦/٣**

خۆشەویستم خەجیج گیان ڕۆژ باش ! لە دوورەوە چاوەکانت ماچ دەکەم. هیوادارم ساغ و سلامەت و قەت دڵشکاو و خەفەتبار نەبی. من حاڵم باشە. نەخۆش نیم. بەلام زۆر لە ئێوە بێخەبەرم. زۆر لەمێژە هیچ نامەتان نەهاتوە. نازانم نەتان نووسیوە، یا نایگەیەنن. تا ئێستا چەند نامەم بۆ کەمال و شلێریش نووسیوە، نازانم گەیشتوون یان نا.؟ بۆم نووسیبووی خەریکم کتێبێک دەکەم بە کوردی. لەو ماوەیەدا کە من بە 26 ڕۆژ نامەی71پارتیزانی نیشتمانپەروەری فەرانسەییم کردوە بە کوردی، لە کوردستانی ئێمە 67 پێشمەرگەی حیزب لە شەڕدا شەهید کراون. لە شەهیدانی کۆمەڵەش ئاگادار نیم. بە داخەوە مەگەر هەر خەبەری کوشتار و دەربەدەری خەڵکت بۆ بنووسم. دوژمن لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ کوردستان هێناوە. ئێمەش بە داخەوە لە جیاتی شەڕ بخەینە نێو جەرگەی دوژمن، هەر بەرەوعێراق دەکشێینەوە. من لەو بارەوە نامەشم بۆ دەفتەری سیاسی نووسیوە. شەڕێکی قورسمان بە سەردا سەپاوە.
خەجیج گیان! ئەورۆ ڕۆژی لەدایکبوونی شلێرێ بوو. مریشکێکم کڕیبوو، یەک دوو برادەرم بانگ کردبوون. خواردنەوەمان نەبوو. بەلام بە یادی شلێرێ نانێکی باشمان خوارد. ماڵێک دۆی ترش و خۆشی بۆ هێنا بووم. ئەگەر بزانی چەندە خۆش بوو. دەمێک بوو دۆمان نەخوارد بۆوە. بووینە کوردی دۆ نەدیو. جا نازانم کەمال چۆن بەڕێدەچێ؟ داخوا بابی خۆی لە بیرە و بە سلامەتی من دەخواتەوە.؟ ئەو ڕۆژانە فەرخوندە نامەی بۆ نووسیوم و ئەحواڵی تۆی پرسیوە. نامەم بۆ بنووسە، بزانم کەمال لەگەڵ ئەسپیرانتورەکەی چیکردوە. کاک ڕەحمان سلاوتان لێدەکا. دەڵێ کەمال ئاگرۆنوم بخوێنێ، بۆ تێزی دوکتوراکەی

بێته ئێره یارمەتی دەدەم. بەڵام نازانم وەزعی ئێمه چی لێدێت؟ لهماڵی خوشکم و کاک ئەحمەدیش بێخەبەرم. به تەنیا له ژوورێکدا دەژیم و ماڵێکی خاوێن و خۆشم هەیه. به توندی خەریکی نووسین و وەرگێڕانی کتێبم. ئیتر کۆتایی به نووسینەکەم دێنم. لەجیاتی من منداڵەکان ماچ کە. خۆشی و سلامەتی تۆم ئاواته. چاوەڕوانی نامەت دەبم. به هیوای سلامەتی و دیدارت. بەخۆشی بژی. ماچت دەکەم. Ahoj , kerimi to 3/6/83

**نامەی غەنی بلووریان بۆ دایکی کەمال ٨٧/٥/٢١**

بەڕێزی خۆشەویست خوشکه خەجیج .

پاش ڕێز باش بۆ خۆتان و منداڵەکانی ئازیزت به هیوام بەختەوەر بن. ماوەیەک له مەو بەر کاک هوشیاری ئیمامی خەڵکی شاری مهاباد و ئەندامی فدائیانی خەڵک نامەیەکی بۆ نووسیبووم داوای لێ کرد بووم یارێدەی بدەم که براکەی وصاڵحی نانوازاده اندامی فدائیان له تورکیارا بتوانن بچنه وڵاتێکی غەربی منیش چی دەبوایه بکەم. تەنیا توانیم جوابی بدەمەوه که پێیان ڕابگەیێنێ بێنه صوفیا و کاک سعید بدوزنەوه یاریدەیان بدات بۆ ئەوه ژماره تلفونی ماڵی ئێوەم بۆ نووسی که ئەگەر هاتن بتوانن کاک سعید بدوزنەوه تکایه ئەو مەسەلەیه به کاک سعید رابگەیێنن ئەوا نامەیەکی کورت بۆ کاک سعید دەنووسم بێ دەرێ بەڵکوو ڕێنوێنیان بکات. پاشانیش گەرەکمه بیرتان خەمەوه که عکسی مامۆستای ئەمر هێمن که لێم شکاوه بۆم روانه بکەی دەگەل تاریک و ڕوون و ئەوەکەی تری ئەگەر ممکن بێت دیاره زوڵمه هی خۆتانم بۆ بنێرن، بەڵکوو کاک سعید بتوانێ پەیدایان بکات ئیتر هەر ساخ و بەختیار بن. برات غنی ٨٧/٥/٢١ ئادریس.

**نامەی غەنی بلووریان بۆ دایکی کەمال، ٩٨٨/١٠/٣**

بەریز خوشکه خەجیج! پاش ڕێز باش به هیوای ساخی و سلامەتی خۆت و منداڵەکان. ماوەیەکه له بەر چەرمه سەری ڕۆژگار و سەفەر بۆ ئەم لاو ئەولا و شەره شەقەی ناو خۆ نه پرژاومه سەر نەمه یادی دۆستان و هاورێیان بکەم. به هیوام دەمبووری. خێزانم زۆر به گەرمی سلاوتان لێ دەکا ئاواته خوازی سەر

کەوتنتانە. ماوەیەکە ئێمەش لە وڵات خەبەرمان نیە جگە لەو خەبەرە دڵ تەزێنانەی لە مەڕ کوردستان و کوشتاری نەتەوە بەستە زمانەکەمان بە دەستی ڕێژیمی چەپەڵی بعث و ڕێژیمە خوێن خۆرەکانی مەڵبەند. بەڵام کوژانەوەی شەڕی ئێران و عیراق کە بە ناحەق ملیۆنها مرۆ لە ناو چوو دیسان جێگای خۆشیە. بەڵام بە داخەوە کورد و هەموو خەڵکەکانی ئێران بە دەست ئەو ئاخوندە چڵپاو خۆرە کۆنە پەرستانە قەت ناحەسێنەوە. پەنا بردن بۆ هیرۆئین و خۆ کوشتن لە ناچاری ڕۆژ بە ڕۆژ پەرە دەستێنێ جا کەی ئەو ئێرانە لە چەنگ ئاخوندان رزگار دەبن نا دیاریە. ئیتر سەرت ناهێشێنم و بە ئاواتی بەختەوەریتان مەبەستم هەر هەواڵ پرسین بوو هومێدم وایە هەل هەڵکەوێ جارێکیتر وێکرا لە شوێنێک چاومان بە یەک شاد بێت. ئیتر هەر بژی برات غەنی٢/١٠/٨٨. ئادرێسی تازەم موقت لە پشتی پاکەت نووسسیوە.

ئەو نامانە ی کە لە ماوەی نیزیک بە ١٢ ساڵ دووری لە خاو و خێزانم بۆ یەکترمان نووسیون و نامەی هێندێ لە بردەرانیش کە بۆ دایکی کەمالیان نووسیوە، لێرەدا تەواو دەبن. گومانم نیە کە زۆریش لە نامەکان هەڵنە گیراون، دیسان سوپاسی دایکی کەمالی دەکەم کە ئەوانەی پاراستوە. ئەم کارە چاکەی ئەو دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەم بەرگەی بیرەوەریەکانم شێوازێکی تازە لە ئەدەبیاتی کوردی یا لە نەریت و ژیانی کوردەواری بە خۆوە بگرێ ئەگەر لە لایەن خاوەن نەزەرانەوە بە ئەدەبیات حیساب بکرێ. فۆرمێکی تازەیە و ئەم بیستوە لە کوردەواریدا لە نێوان ژن و مێرد دا نامە ئاڵوگۆڕ کرابن و بە چاپ بڵاویش کرابنەوە. دوور نیە هەلیش بۆ بۆ چۆڕن و دەربڕین و قسە وقسەڵۆکی پاشملە و یا باس و نووسینی کەسانی جۆر بەجۆر بڕەخسێنێ. ئەویش خۆی هەر شتێکە.!

هەر وەک لە سەرەتای ئەم نووسینەدا ئاماژەم پێکردوە، بەر لەوەی بێمە سەر نووسینەوەی بیرەوەری و یا سەربردەی ئەم دواییەی ژیانم هێندێ لەو نامانە ش بڵاو دەکەمەوە کە لە ساڵی ١٩٩٥ وە لە لایەن ناسیار و برادەرانی نیشتمانپەروەرەوە پێم گەیشتوون.

**برادەرێک بە ناوی دڵشاد قادر هەینی ئەم نامەی خوارەوەی بۆ ناردووم:**

« خۆشەویستی هەموان و تێکۆشەری ناو دێر و ڕۆژانی ڕەش و کوێرەوەری ماموستا کەریم حسامی.

سڵاو و ئومێدی تەمەن درێژیت بۆ دەخوازم. نازانم تا چەند ئامادەی کاغەزێکی ئاوا و هی کەسێکی سادە بخوێنیەوە. بەڵام پێم وایە ئەگەر تەنها وەک مەسەلەکەی هەوای تایەری ماشێنەکەش بێت، ئەوە هەر هیچ نەبێ دەیکەیتەوە وتەماشایەکی دەکەیت. لە دوا سەر دانت بۆ کوردستانی باشور. لە بازێڕی هەولێر لە بەر دەم دەفتەری سیاسی حیزبی زەحمەتکێشان سوکە تەعاروفێکمان کرد و لە ناو ماشێن دەرمانهێنای و چەند قسەیەکی سەر پێییمان کرد. دیارە کارت هەبوو بۆیە نەمانتوانی زۆر بناخڤێن و پاشانیش هەر ڕێک نەکەوت بتبینمەوە.

مامۆستای بەڕێز. لام وایە یەکێک لە دەردە سەرییەکانی نەتەوەی کورد ئەوەیە کە مێژووی خۆی بە چاکی نازانێ، بە داخەوەش تا ئێستا حیزبەکانی خۆمان لە بری خەمخواردن بۆ ئەم مەسەلەیە، خەریکی شەڕن. بۆیە ئێمەی تامە زرۆی مێژووی خۆمان نەک تەنها لە مێژووی پارچەکانی دیکەی کوردستان ئاگاداری تەواومان نیە، بەڵکە لە هی پارچەکەی خۆشمان بێ ئاگاین.

دوای گەڕان وسوڕانێکی بێهودە بە دوای خوێندنەوەی( لە بیرەوەرییەکانم) ی جەنابتان، مامۆستای بە ڕێز و خۆشە ویست( ممتاز حەیدەری) دەستی بەزەیی بەسەرماندا هێنا و هەر ٩ بەرگی داینێ و خوێندمەوە. بڕوات هەبێ لە ناو پاس و شوێنە گشتیەکان و لە کاتی خواردنیشدا بە تامە زرۆوە دەمخوێندەوە، تا ئەمشەو کاتژمێر ٣ی سەر لە بەیانی ٦)٥/١٩٩٥ دوا دێڕم تەواو کرد. لێرەدا بە پێویستی دەزانم بە تایبەت پاش تەواو کردنی ئەو شاکارە بە نرخە کە سوپاسی

گەرم و مەزنتان لێبکەم، چونکە بە ڕاستی خەمێکی گەورەت لە ولات لە کۆڵ کردوومەوە بە وەی کە لە ماوەیەکی کورت دا شارەزاییەکی بەر چاوم لە مێژووی خەباتی قۆناغێکی گرنگی بزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمان لە ڕۆژ هەلات وەگیر کەوت، هەر وەها مێژوو و ڕۆڵی تێکۆشەرانەی جەنابت هەم وەک تاکە کەس و هەم لە ریزی( ح. د .ک. ا).

ڕەنگە زۆر شت دوای خوێندنەوە سەرنجی ڕاکێشا بم، بەلام لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە لە مێژووی حیزب حیزبانێی حیزبەکانی کوردستان و دونیا بە تایبەتیش لە ڕۆژ هەلاتی ناوە ڕاست و ولاتە پاشکەوتوەکان کەم وا ڕێکەوتوە کە لێپرسراوێکی مەزنی حیزبی لە کاتی سزادان یا خود دەر نە چوونی بە لێپرسراو یان بە هۆی هەر شتێکی دیکەوە ئامادە بوو بێت وەک ئەندام کاری کرد بێت. یان وازی هێناوە، یان خود کاری دیکەی کردوە. بەلام لە مێژووی ڕووداوەکانی تایبەتی ژیانی سیاسی جەنابت ئەو یاسا تەسک و سلبییەی شکاندوە. پێم وایە ئەو هەلوێستانەت گەر ئێستاش نرخی نە بوو بێت ئەوە بێگومان لە داهاتوو بۆ نەوەکانی دیکە بایەخی تایبەتی دەبێت.

ماموستای بەڕێز! بەهۆی ئەو بیرەوەرییانەوە گەلێ ڕوو داو و کەسایەتیمان ناسین کە چۆن و بە چ شێوەیەک ڕوویانداوە و کاریان کردوە. من خۆم ڕێزم بۆ هەموو تێکۆشەرێکی کورد و غەیرە کورد هەبوە و دەبێت. بەلام ئەوەی کە تۆ لە سەر هەندێ بەرپرسیارانی کوردستانی خوارو و ڕۆژهەلات نووسیوتە، بە هەلە چوو بووین. من دیسان لێرە دوو پات و هەزار پاتی دەکەمەوە کە ڕێزی بێ پایانم بۆیان هەیە بە تایبەت ئەوانەی چوونەتە ریزی نەمرانەوە و لە پێناوی ولاتەکەیان گیانیان بەخت کردوە. کتێبەکان هەلەی چاپی زۆری تێکەوتوە، ئەگەر لە کوردستان با و بوارت بدایە ئەوا ئەرکی ڕاستکردنەوەمم لە ئەستۆی خۆم دەگرت، بە سوپاسەوە. کتێبەکانی جەنابت ولوتفی مامۆستا مومتاز تۆزێک باری خەم و ئارەزووی لێ کەم کردمەوە. سوپاسی هەر تکتان دەکەم. لە گەڵ هیوای ساغ و سلامەتی و تەمەن درێژیت بۆ تەواوی نەتەوەی کورد. برای بچوک و دلسۆزتان دلشاد قادر هەینی ١٩٩٥/٥/٦

**نامەیەکی سەر ئاواڵە لە لایەن کۆمەڵی لە کوردەکانی دانیشتووی سوید**

لایەنی هەرە خەراپ و تاڵ و داخدار ژیانی ئەم دواییە لە ئوروپا ناکۆکی و کێشەی نێوان هێزە سیاسیەکانی کوردبوە بە تایبەت شەڕی کورد کوژی دوو حیزبی چەکداری کوردستانی عیراق کە ناخی هەموو نیشتمانپەروەرێکی هێناوەتە ژان و بازاری بۆ شەڕ فرۆش و مشە خۆر و دوو زمانان کردۆتەوە و ویژتە هۆی سەرشۆڕی کورد لە هەندەران و دوژمنانی کوردی بە خۆ خۆش کردوە.

شەڕی کورد کوژی نێوان پارتی و یەکێتی نەک هەر خوێنی لاوانی کوردی بە خۆڕایی دەڕشت و دەسکەوتی ڕاپەڕینی خەڵکی فیداکار و زەحمەتکێشی دەخستە مەترسییەوە، بەڵکوو پڕیشکی پەڕیبوە نێو کوردەکانی دەرەوەی وڵاتیش و ڕوناکبیرو نیشتمانپەروەری دڵسۆز و بێلایەنی زامدار کردبوو. پاش پێوەندی تەلەفوون و دیتن و لێدوان کۆمەڵێک لە کوردەکانی دانیشتووی سوید ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٢٩ کۆ بووینەوە و پاش باس و داخ دەر بڕین لە هەڵوێست و سیاسەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ئەم نامەیەی خوارەوەمان نووسی و دامان بە نوێنەرانی دوو حیزبی ناو براو:

ئەمەش دەقی نامەکەیە :

حکومەتی هەرێمی کوردستان

پارتی دیموکراتی کوردستان- یەکگرتوو

یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ئێمە بۆ ئەو شەڕە خۆکوژییەی کە لە جەنگی دەستە و یەخەی حیزبەکانتانەوە کە لە دوا ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا سەری هەڵداوە، ئێوە بە بەر پرس دەزانین. ئەم شەڕەش ئەوە دەسەلمێنێ کە هەر دوو حیزب( یەکێتی و پارتی) بە هەموو ئەندامان و هەڵسوڕێنەرانیەوە ئەو ئەمانەتە پیرۆزەی کە بە خوێنی هەزاران ئاوارە و دەر بەدەر هاتۆتە دی و شەرەفی پارێزگاری کردنی بەم حیزبانە درا، بۆیان ناپارێزرێ. ئەگەر چی تابوری پێنجەم وەک خۆ دزینەوەیەکە لەو هەموو گفتوگۆیانەی لە گەڵ ئەو حیزبانەدا دەکرێ بۆ شاردنەوەی ئەو ناتەباییە نافیکری و عەقڵیەتە ئاینییەی کە ساڵانێکی دوور و درێژە لە هەرێمی

حیزبایەتی هەر دوو لایەنەوە بۆ ناو دەروون و فیکری هەموو کوردێکەوە شۆڕ بۆتەوە، بە چەشنی ئەو دابەشکردنی لایەنی حیزبییەش بۆتە هۆی دوو کەرتبوونی هەست و فیکری مرۆڤی کورد، کە هەر لە دنیای منداڵێکەوە ئەو تێکدان و دوو کەرتکردنە دەست پێدەکات تا دووروونی کەنەفتێکی سەر جێ.

ئێستا کوردستان بۆتە گۆڕە پانی ڕمبازێنی زەرد و سەوز کە لەو پەلاماردانەدا گۆڕەپانێک لە خوێن نەخشێنراوە، تا بێت سنووری ئەو گۆڕە پانە فراوانتر دەبێت، لە شاخەوە بۆ شار و لە شارە وە بۆ دۆزەخ. دوا ڕۆژی هەموو کوردێک پێوەندی بە ئەنجامی زۆرانبازی ئەو دوو حیزبە وە هەیە یە کە یەکێکیان ئەویتریان لە ئەردی دۆڕاندن بدا کە ئەمەش هەروا ئاسان نیە و حەمامێکی خوێن بەرپا دەبێ. لە چ مێژوویەکدا بیستراوە کە لە شەڕی برا کوژیدا براوە هەبێ؟ چ جای ئەوە شۆڕش لە نێوان دوو حیزبی کوردی هاو زمان و هاو خەباتدا بێت. زۆرتر بە دەنگەوە هاتن بۆ وەستاندن و بەر بەستکردنی ئەم جەنگە زیاتر فریا کەوتنی هەرەس نە هێنانی ئەو هەیبەتی حیزبایەتییەتانە.

با چیتر عەقلی شاخ و بەر بەرەکانی بۆ مانەوەی تاکە حیزبی نەمێنێت. ئێستا ڕاستیی هەموو ئەو ڕووداوانەی لە چیادا ڕوویان دەدا لە شاردا دەبینرێن. میللەت برسێیتی و دوو بارە بوونەوەی حیزبایەتیتان تا ڕادەیەک قەبوڵ دەکات ئەگەر شەرەف و کەرامەتی بپارێزرێت و پارێزگاری لە بوون و مانەوەی بکرێت. ئێستاش شەهیدەکان ئێسقانی ناو گۆڕەکانیان گەرمە، ئێوەی هەر دوو حیزبی زەرد و سەوز بەر پرسیارن بەم قۆناغەی کە چارەنووسی هەموو کوردێکی پێوە بەستراوە. دەبێ هەموو ئەندامان و کادیرانی هەر دوو حیزبتان بزانن کە ئەو ڕاپەرینەی ڕوویدا، ڕاپەرینێکی زێڕین بوو، میللەت شەرەفی پارێزگاری کردن و سەروەری خۆیدا بە ئێوە. ئەگەر ئەم دەستکەوتە لە بەین بچێ، ئەوە هەر گیز چاوەڕوانی ئەوە مەکەن کە ئەو شەرەفەتان پێ ببەخشرێتەوە. ئێستا ڕووداوەکان لە شاخدا نین و لە بەر چاوی میللەتدا ڕوو دەدەن. ئەم تاعونە لە شاخەوە هات بۆ شار، ئێستاش لە شاردا لە دەرگای هەموو خێزانێکی کورد دەدا. شەڕی خۆ کوژی بوەستێنن و ڕەگی شێر پەنجەی برا کوژی ببڕنەوە، با چیتر خوێنی کورد بە دەستی کورد نە ڕژێتە سەر خاک و ئەرزی کوردستان. ١٩٩٤/٥/٢٩

**سێمینارێک لە سەر ئەرکی لاوانی کورد لە دەرەوەی وڵات لە کاترین هۆڵم**

کۆمەڵەی لاوانی کورد لە بازێری کاترین هۆڵم لە ڕێگای کتێبخانەی ئەم شارەوە داوەتی کرد بووم کە سەبارەت بە ئەرکی لاوان لە دەرەوەی وڵات باسێک بە ڕێوە بەرم. ڕۆژی ١٩٩٤/١٢/١٧ چوومە ئەو شارە و میوانی کاکەبرا و حەمیدی تەیموری ئەندامانی حیزبی دیموکرات بووم. ئەوان پێشتر هێندێ پلاکاتیان لە بارەی سێمینارەکە و ژیان و تێکۆشانی من بڵاو کردبۆوە. سێمینارەکەمان بە بەشداری کۆمەڵێک لە لاوانی کوردی دانیشتووی ئەم شارە و زۆر لە نیشتمانپەروەرانی دیکەی کورد بە ڕاوەستانی دەقیقەیەک بۆ ڕێز گرتن لە گیانی پاکی شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان دەستپێکرا. من بە گوێرەی توانا نیزیکەی سەعاتێک سەبارەت بە ئەرکی لاوانی کورد لە ئاوارەیی سەریانم پەشاند. وەک : گرنگی دان بە فێر بوون و خوێندن، ناساندنی هویەت و ناو و نیشانی کورد، پاراستنی داب و نەریتی جوانی کوردەواری، ناساندنی خەبات و تێکۆشانی کورد بۆ ڕزگاری، ڕێز گرتن لە خەباتی مێژوویی کورد لە ڕابردوودا، ناساندنی کولتوور و ئەدەب وداب و نەریتی کوردی بە لاوانی خۆجێیی ئەم وڵاتانەی تێیدا دەژین، لە بیر نەکردنی زمانی زکماک، ڕێز گرتن لە دایک و باب و هۆگری بە مێژوو و زمان و شێعر و ئەدەب و موسیقای کوردی، وەر گرتنی شتە باشەکانی ئورووپا بۆ خزمەت بە دوارۆژی نەتەوەکەمان و خۆ پاراستن لە شتە خەراپ وبڵحەکانی ئورووپایی، تێکۆشان بۆ یەکێتی و کۆبوونەوە و ئاڵۆ گۆڕی بیر و ڕا لە گەل کوردەکان و بەشداری لە شایی و شینی هاونیشتمانیەکان و... هتد.

زۆربەی بەشداربوانی سێمینارەکە پرس و پەیڤیان دەهێنا سەر باسی ڕووداوەکانی خوارووی کوردستان کە تووشی شەڕی کورد کوژی ببوو و خەڵکی بە گشتی داخدار و بریندار کرد بوو. داوایان دەکرد کە هەڵسەنگاندنێک، پێکگرتنێک لە نێوان کار و کردەوەی کۆماری کوردستانی ١٩٤٦ و حکوومەتی فیدراڵی خوارووی کوردستان بکرێ.

وەڵامی ئەم پرسیار و داوایە هاسان نەبوو. بە گوێرەی یاسای گەشە و پێشچوونی کۆمەڵایەتی، دەبوایە لەو ماوەیە دا نەتەوەکەمان لە هەموو بارێکەوە

بەرەو پێش چوویایە. بەڵام بە داخەوە دەبینین لە بواری بە ڕێوە بردنی شێوازی دەسەڵاتداری و پێکهێنانی کۆمەڵی شارستانی و لە بەر چاو گرتنی بەرژەوەندی گشتیی مەسەلەی نەتەوەیی، نەک هەر نەچۆتە پێش، بەڵکوو بۆ دوایەش گەڕاوەتەوە. ساڵی ١٩٤٦ لە ماوەی یازدە مانگ تەمەن و دەسەڵاتی کۆماری کوردستاندا، تەنیا یەک تیرۆری سیاسی کرا. لە کاتێکا کۆمەڵگای ئەو دەمی کوردەواری لە چاو ئێستا بە ڕاستی کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی عەشایری نە خوێندەوار بوو. لە هەموو کوردستانی ئێران سێ کەس لە زانستی کۆمەڵایەتی و سیاسی وئابوریدا دوکتورایان نەبوو. ئێستا دەبینین لە خوارووی کوردستان بە سەدان زانا و پسپۆر و دوکتورای جۆر بە جۆرمان هەیە. بەڵام ئەوەش دەبینین کە پاش ٥٠ ساڵ لە ژێردەسەڵاتی حکوومەتی فیدراڵدا پتر لە دەیان ترۆری سیاسی کراون. بە سەدان کەس کوژراوە. دزی و ڕێگری هەر باسی ناکرێ. دەزگا و کەرستەی خەستەخانە و ئامرازی کشت و کاڵ و هەرچی سامانی نەتەوایەتی هەبوو، دوای ڕاپەڕین و بە ڕواڵەت ئازاد بوون، هەمووی دزرا و تاڵان کرا و ناودیو کرا. شوورەیی و قەباحەتی ئەم کارە دزێوە لە وەدایە کە بەشی هەرە زۆری ئەم تاوانە لە لایەن کار بەدەستانی حیزبەکانی دەسەڵاتدار و فەرماندەکانی پێش مەرگە و چەکدارانەوە بە ڕێوە چوە.

لە یازدە مانگی تەمەنی کۆماری کوردستاندا مەئمورێکی گومرگی حکوومەتی میللی بە ناوی ئەحمەدی بابانزادە جەوازی ساختەی بۆ هێنانی شتوومەک لە کوردستانی گەرمێنەوە دابوو بە ناشنایەکی خۆی. لێی ئاشکرا بوو، ڕۆژنامەی کوردستان لە سەری نووسی، ڕایانکێشا بۆ دادگا و دەرکرا و سزا درا. ئێستا دزی و گیرفان پڕ کردن لە نێو دام و دەزگای حیزبەکانی دەسەڵاتدار و حکوومەتی کوردستان و چەکدارەکاندا بۆتە کردەوەیەکی ناشەریفی ئاسایی. بۆ کورد زۆر شەرم و جێگای داخە کە هێزی سیاسی دەسەڵات بگرێتە دەست و بەسەر چارەنوسی وڵات و نەتەوەی خۆیدا زاڵبێ، بەڵام کارێکی ئاوا بکا و یان وڵات بە شێوەیەک ئەو تۆ بە ڕێوە بەرێت کە ئەمنێستێ ئینترناسیۆناڵ کتێبێ ٤٠٠ لاپەڕەیی لە سەر جنایەت و ئینسان کوژی و دەست درێژی و زوڵم و زۆری لە سەر بڵاو بکاتەوە.

لە سەر دەمی کۆماری کوردستان ساڵی ١٩٤٦ مەهاباد ببوە قیبلە گا و پەنا

و نیشتمانی هەموو کوردێک لە هەر بەشێکی کوردستان. کوردێک ڕووی کردبایە کوردستانی ڕۆژ هەڵات لە لایەن خەڵک و حکوومەتی میللی کوردستانەوە بە بێ فەرق و جیاوازی پێشوازی لێدەکرا و بە گوێرەی لێهاتوویی لە هەموو کار و باری ئیداری و کۆمەڵایەتی سەربازی وکولتوریدا بەشدار دەکرا و کاری حکوومەتی پێ دەسپێردرا. بەشداری بارزانیەکان لە هێزی بەرگریدا و بەخشینی پلەی ژەنراڵی بە سەرۆک بارزانی نەمر، نموونەی بەرچاو وجێگای شانازی کۆماری کوردستانن. بەڵام ئێستا کوردەکانی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان و بە تایبەت ئازادیخوازان و تێکۆشەرانی ڕێگای رزگاری لە کوردستانی فیدراڵ و بە تایبەت لە مەڵبەندی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانیدا دەکوژرێن و دەگیرێن و دەدرێنەوە بە حکوومەتی کۆماری ئیسلامی و کەس لە سەر وماڵی خۆی ئەمین نیە. جا بەمحاڵە پێککرتن و هەڵسەنگاندنی ئەم دوو ڕووداوە گرنگانەی کوردستان تۆزێ زەحمەتە و هەر کەس خۆی دەبێ بیری لێبکاتەوە.

سیمینارەکە بە باسی خەست و بەشداری بەشداربوانی کۆبوونەوە کۆتایی پێهات و گەڕامەوە بۆ ستۆکهۆڵم.

**یەکێتی نووسەرانی کوردستان،**

دەمێک بوو لە نێو ڕوناکبیرانی دانیشتووی ستۆکهۆڵم بۆ پێکهێنانی یەکێتی نووسەرانی کورد باس وگفتگۆ لە گۆڕێدا بوو. پێشتر یەکێتی نووسەران هەبوو. گۆڤارێکیشی بە ناوی چرا دەر دەکرد. هەر چەندە نیزیکەی ٥٠ کەس وەک ئەندام ناوی خۆیان نووسیبوو، بەڵام لە ڕاستیدا گۆڤارەکە تەنیا بە زەحمەت و تێکۆشانی دوو کەسی نیشتمانپەروەر، کاک خەبات عارفی شاعیر وکاک رزگار بەڕێوە دەچوو. هەموو کار و هەڵسوڕانی یەکێتی و نووسین و بڵاو کردنەوەی گۆڤارەکە کەوتبوە سەر ئەستۆی ئەم دوو برادەرە و زەحمەتیان دەکێشا. یەک دوو جار ئەندامانی یەکێتی بۆ کۆبوونەوە بانگ کران، جاری وا هەبوو سێ کەس ئامادە دەبوون. ئیتر ئەم دوو برادەرەش لە توانایاندا نەما کە بە تەنیا گۆڤار دەربکەن و یەکێتی بەڕێوە بەرن و یارمەتیشیان پێ نەکرێت و ئەندامانیش تەنانەت بۆ کۆبوونەوەش ئامادە نەبن. یەکێتی ئیتر نەیتوانی درێژە

بە ژیانی بدا و هەڵوەشایەوە.

پاش ماوەیەک برادەرانی کوردی کرمانج هەڵەسوونەیان هێنایەوە کە یەکێتی زیندوو بکەنەوە. داوایان لە شاعیر و نووسەرانی کورد کرد کە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا بۆ دامەزراندن و هەڵبژاردن و دیاریکردنی دەستەی نووسەرانی گۆڤار کۆ بنەوە. ڕۆژی ١٩٩٥/١/٢٢کۆ بوونەوە بۆ زیندوو کردنەوەی یەکێتی نووسەرانی کورد نیزیکەی ٣٠ کەسێک ئامادە بوون. لە برادەرانی کوردی کوردستانی خوارو و ڕۆژهەلاتی کوردستان بێجگە لە نووسەری ئەم دێڕانە و کاک سەعید کوێستانی یەک کەس نەهاتبوو. کۆبوونەوە دەستەی بەڕێوە بەری و نووسەرانی گۆڤاری هەڵبژارد و چەند ژمارە گۆڤاری چرا بە کرمانجی پیتی لاتینی دەرچوو. من وەک ئەندامی دەستەی نووسەران یەک دوو وتاریشم بە پیتی لاتینی تێدا بڵاو کردەوە و ساڵێکی بردە سەر، بەڵام لە برادەرانی سۆران کەس بەشداری نەکرد.

لە کۆنگرەی ساڵانەدا بڕیاریاندا کە یەکێتی نووسەران ببێتە ئەندامی فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردییەکان لە سوید. من ئیتر وازم لێهێنا و نەمویست ببم بە ئەندامی بەناو ڕێکخراوەیەکی بێ ناوەڕۆک و بێ کەلک و بە دەرمتان. ڕێکخراوەیەک کە ببێتە مەیدانی ململانی حیزبە سیاسییەکانی کورد و سەرەڕای ئیمکاناتێکی زۆری مادی هیچ سود و کەلکی نەبێ. یەکێتییەکە بوو بە یەکێتی نووسەرانی کوردەکانی باکوری کوردستان و لێرەشدا دا بەشبوونە مێژووییەکەی نەتەوەیی لە بواری ئەدەب و کولتور لە دەرەوەی وڵاتیشدا بەر دەوام مایەوە.

**سێمینارێک بە بۆنەی ٥٠ ساڵەی دامەزرانی کۆماری کوردستان - ١٩٤٦**

کۆمەڵەی کوردی لە سوندسڤاڵ داوەتی کردم کە بە بۆنەی پەنجایەمین ساڵی دامەزرانی کۆماری کوردستان بچمە ئەو شارە و لە سەر ئەو ڕووداوە گرنگە باسێک بکەم. ڕۆژی ١٩٩٥/١/٢٦ سواری فڕۆکە بووم و شەو لە نێو برادەرانی وێندەرێ دانیشتنێکی خۆشمان بردە سەر. ڕۆژی دوایی لە سالۆنی کۆمەڵە دا بە بەشداری زۆربەی کوردەکانی دانیشتووی سوندسڤاڵ بە کورتەی توانا لە سەر بار و دۆخی ئەو دەمی کوردستانی ئێران و هەل و مەرج و چۆنیەتی

دامەزرانی کۆماری کوردستان و دەستکەوتەکانی نەتەوەیی و شێوازی بە ڕێوە بەری و گیر و گرفتەکانی سەر ڕێگای حکوومەتی میللی و ...هتد قسەم کرد. بەشدار بوانی کۆڕەکە بە تایبەت کاک حەسەنی قازی لە باسەکەدا بەشداری گەرمیان کرد و وەلامی پرسیارەکان درایەوە. تەلەڤیزیۆنی سوندسڤاڵ پێشنیاریان کرد چاو پێکەوتنێک و وتووێژێکیش بۆ تەلەڤیزیۆنەکەیان بە ڕێوە بەرین. لەم چاوپێکەوتنەی تەلەڤیزیۆنیدا کاک حەسەنی قازیش بەشداری کرد. بەڕێوە بەرانی تەلەڤیزیۆنەکە بە ڵێنیان دا کە کۆپییەکی فیلمەکە وەک یادگارێک بۆ خۆم بنێرنەوە، پاش چەند ساڵانیش بە دەیان جار کە چاومان پێک دە کەوتوە، بە تۆزێک شارەقەوە دەیانگوت ئەو جار فیلمەکەت بۆ دێنینەوە، یا بۆت دەنێرینەوە. بەلام نەتیجەکەی ئەوە بوە کە مەجبور بووم بڵێم درۆیان کرد و تا ئێستاش بەڵێنی خۆیان نەبردە سەر. جا نازانم ئەگەر خولا بکات کاک جەلال دەباغ بەوە نارەحەت نەبێ کە بڵێم کورد کەمتر قەول و بەڵێنی خۆی دەباتە سەرو نەیکاتە ڕەخنە.!؟

**نامەیەکی دۆستانە**

١٩٩٥/٢/٢لە لایەن دوکتور گول مراد مرادی یەوە ئەم نامەیەی خوارەوەم پێگەیشت . من ئەو بەڕێزەم نەدەناسی و قەت بە خزمەتی نەگەیشتبووم. نامەی دوکتور گول مراد مرادی کە بە کوردی وفارسی تێکەڵ نووسراوە بۆیە دەبێ لاپەری ئەم نووسراوەی پێ برازێنمەوە. ئەوەش دەقی نامەکەیە:

«... دوهەمی مانگی فوریە ١٩٩٥ . ماموستای هێژاو مەزن مام کەریمی حسامی.

ئیجازە فرموون نامەکەم لە تەک شیعرێک( هەلبەستێک) لە شاعیری نەمر ماموستا هێمن هاو رەزم و هاو خەباتکەری خۆتان کە لە شیلان ئاوی ١٣٢١دا ووتویە، دەسپێک بکەم

کوردم ئەمن
گەرچی تووشی ڕەنجە ڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم. مەردم ئەمن
گەر لە برسان و لە بەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم

نۆکەری بێگانە ناکەم تا لە سەر هەردم ئەمن

ماموستای بەڕێز، بە داخەوە پێویستە ئیدامەی نامەکەم بە زمانی فارسی بنوسم. چونکە لە منداڵی لە بەر هەژاری نە توانستم حەتێ برۆمە مەکتەوی فارسیش( کوردی!دکە شتێک مەیێژە) هەموو زمانە بێگانەکانیش لە مەکتەوی شەوانە خۆم فێر کردووم. لێرەوە ئیتر نامەکە بە فارسیە و وەرگێڕاوەی دەنووسمەوە،

ماموستای بەڕێز و گەورەم ! گیرو گرفتی ئێمەی کورد هەر لێرەوە دەست پێدەکات، کە تا ئێستا شانسمان نەبوە لانی کەم بە زمانی دایکی خۆمان خوێندن و نووسین فێر بین. ئیمڕۆش لە سەرانسەری کوردستان، زیاتر لە نیوەی منداڵەکانمان دەرەتانی ئەوەیان نیە بچنە مەدرەسە کە لانی کەم نەک بە زمانی دایکیان بەڵکوو بە زمانێکی بێگانەش بخوێنن. جگە لەم گیر و گرفتە بنچینەیە و سەدان تەنگ و چەڵەمەی تری گەورە و بچوک، بە داخەوە دەبێ خەم و خەفەتی گیر و گرفتی ئەوتۆ بە گیان بکڕین، کە بەدەستی خۆمان دروستمان کردوە، واتە دەبێ شاهیدی شەڕی نێو خۆیی تایفەیی و دەستەیی و تەنانەت فەردی بین لە بەشەکانی کوردستان و لە نوروپاش.

لە بارەی تەواوی مەسەلەکانی دوایی و کێشەکانی کۆن بێگومان ئێوە زیاتر ئاگادارن و پێویست نیە دوو بارە بکرێنەوە. جگە لەوەش مەبەستی من لە نووسینی ئەم دێڕانە ئەوە نیە کە خوێ بە بریتان دابکەم، بەڵکوو مەبەستی بنچینەییم لە قۆناخی هەوڵدا تەنیا تازە کردنەوەی عەرزی ئیرادەت و سەرەتای پێکهێنانی پێوەندیی بەردەوام لە گەڵ ماموستای بە ڕێز و تێکۆشەری وەک ئێوە بوە، نەک کردنەوەی سفرەی دەردی دڵ. کە وابوو دەردی دڵەکان ڕادەگرین بۆ کاتێکی تر کە ئەگەر تەمەن وەفای کرد و نە کەوتینە بەر نیشانەی تیرۆریستەکانی حاکمە مێشک ویشکەکان.

هەر وەک بە تەلیفون ڕام گەیاند ئەوە نامیلکەی مێژو ورواياتی نەورۆزتان بۆ دەنێرم. زۆر شاد دەبم ئەگەر ڕۆژێک بتوانین بە زمانی کوردی بلاوی بکەینەوە. تا ئێستا لە چوار گۆڤاری ئەڵمانیدا و لە گۆڤاری ئارش- ی فارسیشدا بلاو بۆتەوە.لە ڕێگای دۆستی بە ڕێزم دوکتور عەزیزی فەیز نژادەوە ئاگادار بووم کە ماموستای بەڕێز سێ لە چواری سەدەی ژیان و خەباتی کۆڵنەدەرانەتان

تێپەڕاندوە، بەم بۆنەوە سەر لەنوێ حەفتا و پێنج ساڵەی« لە دایک بوونتان»
پیرۆز بایی پێ دەڵێم. هیوادارم ڕۆڵەکانی خەڵکی بێبەشمان سالانی درێژی تر
لە زانیاری و ئەزموونی خەباتی بێ وچانتان کەلک وەر بگرن. لە گەڵ سڵاوی
زۆر و ئاواتی سلامەتی و لەش ساخیت و بە هیوای ئاسۆیەکی ڕوون بۆ
گەلەکەمان. گول مراد مرادی.»

دوکتور گولمراد مرادی یەک لە ڕوناکبیر و زانایانی برایانی گۆڕانە.
دوکتورای لە سەر کۆماری کوردستان ١٩٤٦ بە زمانی ئەڵمانی وەر گرتوە و
هەر وەک نووسەرانی بەرچاو تەنگی فارسی ئێرانی و هێندێ نووسەر و
ڕوناکبیری ترسەنۆکی کورد کە ناوێرن خۆ لەو ڕاستیە بدەن کە کۆماری
کوردستانی ١٩٤٦ بیر و ڕیشەی سەر بەخۆیی هەبووە و بۆ ئازادی و سەر
بەخۆیی کوردستان دامەزراوە، لە هەموو کتێبەکەی ولە نووسراوەی
دیکەشیدا ،کۆماری کوردستانی بە خود موختاری داناوە و لە لێکۆڵینەوەی
زانستی و لێکدانەوەی ڕووداوەکان و سیاسەت و کردەوەی حکوومەتی میللی
کوردستان خوی بواردووە. لە ستیمیناره جیاوازەکانی باسی ئێران و
کوردستانیش دا هەر بەم بۆچوونەوە بەشداری کردوە و لە خودموختاری زیاتر
هیچی تری بە کۆماری کوردستان ڕەوا نەدیوە. لە سەر ئەهلی حەق و بابەتی
تریش گەلێک وتاری بە زمانی فارسی بلاو کردۆتەوە.

**نەورۆز**

ئەم ساڵیش دوور لە نیشتمان نەورۆزی ١٣٧٤ی هەتاوی( ١٩٩٥)- مان لە
ماڵەوە لە گەڵ چەند دۆست و برادەر پێشوازی لێکرد. ئەمساڵیش کوردەکانی
ستۆکهۆڵم نەورۆزی کوردیان وەک نیشتمانەکەیان لەت و پەت کەرد. هەر دەستە
و تاقمی سیاسی و کۆمەڵەی کولتوری کورد بەجیا نەورۆزیان پیرۆز کرد!. لە
بەرانبەر لێکبلاوی و ناکۆکی کوردەکاندا، نیزیکەی ٢٠ هەزار ئێرانی بە بیر و
بڕوا و دەستە و حیزب و ڕێکخراوی جیاوازەوە، پێکەوە یەک نەورۆزیان گرت و
لە یەک جێگا بۆ بەڕێوە بردنی داب و ڕەسمی نەورۆز لێک کۆبوونەوە. کوردیش
یەک نەورۆزیان وەک بەشە گۆشت دابەش کرد و هەر حیزب و دەستەیەک،
نەورۆزی بە هی خۆی دەزانی. نەک بە هی نەتەوەی کورد و گۆیا( پیرۆزی
دەکرد.)!!

٣٠/٤/٩٩٥ لە ماڵەوە خەریکی نووسینم و گوێ دەدەمە رادیوی هەمبەستەگی فارسی. ئەم جۆرە ڕادیویانە بە فارسی و کوردی و زمانەکانی تری بێگانەی پەنا بەر، خوا نەیبڕێ چەندی بڵێی لە سوید زۆرن. مرۆڤ هەر پێچی رادیوی بادا، دەتوانێ قسە و باسی سەیر و سەمەرە گوێ بداتێ. هێندێکیان بۆیە دەبن جار و بار مرۆڤ گوێیان بداتێ ، هیچ نە بێ لە بەر گۆرانیەکان.

بەڵێ : ئیمڕۆ لە ڕادیوی فارسی« همبستگی» پتر لە هەشت ڕێکخراو و تاقم و دەستەی ئێرانی بە بۆنەی ڕۆژی یەکی ئەیارەوە، ڕۆژی نێونەتەوەیی کرێکارانی جیهان، بە نوێنەرایەتی چینی کرێکاری ئێران، پیرۆز بایی لە کرێکارانی ئێران دەکەن. بە راستی بە بیستنی دەنگی ئەو هەموو نوێنەرانەی چینی کرێکار و ئەو هەموو پیرۆز باییە، مرۆڤ بۆ چینی کرێکاری ئێران و زەحمەتکێشانی ئەم وڵاتە خەفەت دایدەگرێ کە وا خۆی لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی مەلاتاری و سەرمایەی هار دا ، دەتلێتەوە و دە چەوسێتەوە و لە ئورووپاش ئەو هەموو نوێنەر و حیزب و پێشڕەوەی هەیە و بەردی چینی کرێکاری ئێران لە سنگی دەدەن..!

**بێزاری و نەفرەت لە شەڕی کورد کوژی لە کوردستانی عیراق**

شەڕی نەفامانە و ماڵوێرانکەرانەی نێوان یەکیتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عیراق نەک هەر کۆشکی ئاوات و تاسەی خەڵکی سەبارەت بە درێژە پێدانی تەمەنی پارلمان و حکوومەت و هیوا بە دوا ڕۆژی دەسەڵاتێکی سەقامگرتوویی نەتەوەیی لەم بەشەی کوردستان ڕماند و توشی نسکۆ و ناهومێدی کرد، بەڵکوو مەسەلەی کوردیشی بە چەشنی گشتی لە نێو کۆڕ و کۆمەڵ و دەوڵەتانی جیهاندا سوک و بێ بایەخ کرد. شەڕی هێزە چەکدارەکانی خوارووی کوردستان کە ڕاستە و خۆ بە فیتی دوژمنانی کورد و بۆ بەرژەوەندی تەسکی نارەوای حیزبایەتی ساز کرا، ئەم بەیت و باوەی دوژمنانی کوردیشی وەڕاست گێڕا کە: کورد ناتوانێ کار و باری خۆی خۆی بە ڕێوە بەرێت و هەر دەبێ بێگانە بە مەیلی خۆی وبۆ بەرژەوەندی خۆی هەڵیسوڕێنێ و کایەی پێبکات.

ئەگەر لە کوردستان شەڕ بوو بەهۆی کوژرانی هەزاران خەڵکی بێتاوان و خەڵەتاو و بە فیڕۆ چوونی ملیۆنها دۆلار سامان و سەروەتی کوردستانی وێرانکراو، لە ئوروپا و ئەمریکا و ولاتانی دیکەش پزیشکی دووبەرەکی و کێشە و ناتەبایی پەڕاندە نێو کوردەکانی ئاوارە و دەر بەدەر و مەیدانیشی بۆ تاقمێکی زڕە ڕوشنبیر و بێ کولتور و جنێو فرۆش و ماستاو سارد کەرەوە خۆشکرد و لە نێو خەڵکی ئوروپا وای بێ ڕێز و سوک کردن کەم کەس لە رووی هەڵدەهات خۆی بە کورد بناسێنێ. لە سەر کارکردی شوم و نگریسی ئەم شەڕەی دەستکردی دوژمنانی کورد، زۆر گوتراوە و نووسراوە لە تام چۆتە دەر و لێرەشدا هەرچی بگوترێ زیادییە و لە چاو بێزاری و نەفرەتی زۆربەی کۆمەلانی خەڵکی کورد( جگە لە تاقمێکی هەلپەرستی شەڕ خۆشکەری بێ پرنسیپی دم هەراش) وەک قەترە بە دەریا وایە.

ڕۆژی ١٩٩٥/٣/٢٧ دۆستی بەرێز و خۆشەویستم قەرەنی قادری تەلەفونی کرد و گوتی:« لام وایە جگە لەوەی کە لە ڕادیۆکانی ئێرە جار و بار قسە دەکەین، دەبێ هەڵوێستێکی سەربەخۆشمان لە سەر شەڕی وێرانکەری کوردستانی عیراق هەبێ. مەسەلەکە زۆر ئالۆز بوە، تورکیا و ئێران هەر یەک لە لایەکەوە دەستیان خستۆتە نێو مەسەلەی کوردستان وبە کردەوەش لە شێواندن و گەرمکردنی شەڕی کورد کوژیدا دەوریان هەیە.» گەیشتینە ئەم ئەنجامە کە من شتێک بنووسم ولە گەل دۆست و برادەرانی کوردستانی ئێران پرس و ڕاوێژ بکەرێ و ئەوانی هاو دەنگ بن لە گەڵمان، ئیمزای بکەن و بلاوی بکەینەوە و نوسخەشی بۆ سەرکردایەتی دوو هێزی شەر کەر بنێرین.

تەلەفونم کرد بۆ کاک حەمەدەمینی سراجی زۆری پێ باشبوو. شتێکم نووسی و لە گەڵ کاک حەمەدەمین پێیدا چووینەوە و نەختێ دەستکاریمان کرد و بە تەلەفون دەگەڵ دۆست و برادەر و چەند کەسێتر باسکرا و کاک حەمەدەمین و کاک قەرەنیش هەر یەکە لە گەڵ دۆست و برادەران باسیان کرد و دەست کرا بە کۆ کردنەوەی ئیمز ا و لە ماوەی چەند ڕۆژاندا پتر لە ١٠٠ کەس لە کوردەکانی ڕۆژ هەلاتی کوردستان ئیمزایان کرد و یا بۆ نووسینی ناویان دەنگیاندا. نوسخەمان نارد بۆ مەکتەبی نوێنەرایەتی پارتی و یەکێتی. لە رادیۆ کوردییەکانی ستۆکهۆلم خوێنرایەوە. لە گەڵ کاک حەمەدەمین و کاک قەرەنی

قادری چووینە ماڵی کاک خەلیل بێکەس کە ئەو دەم لە نێو ئێمەدا پیاوی خاوەن فاکس هەر ئەو بوو. نووسراوەکەمان بە فاکس نارد بۆ رادیۆ کوردی دەنگی ئەمریکا. بە داخەوە کارگێڕانی بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا وەک دەقەکەیان بە کەیفێ نەبوو بێت، نەیانخوێندەوە و تەنانەت بە قەدرایی حەیرانێکی کوردی و یا ژینگەیەکی ئەمریکا و یا گۆرانی لادێی ئەمریکاییش گرنگیان بە تێکۆشانی ١٠٠ ڕوناکبیر و نیشتمانپەروەری کورد نەدا کە بانگەوازی شەڕ ڕاگرتنیان بەرز کرد بۆوە.

ئەمەش دەقی نووسراوەکەیە:

١٩٩٥/٤/٧

مەکتەبی سیاسی پارتی دێموکراتی کوردستان – یەکگرتو

مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

دوای سڵاو : بە پێویستی نازانین دەرد و ژانی ئەم زامە باس بکەین کە لە سایەی سیاسەتی چەوتی خۆ کوژی ئێوە و لە ژێر پێنانی مافی ئینسانی و بەرژەوەندی نەتەوەیی، جەستە و قەوارەی باشوری کوردستانی بە خەڵک و ئاخەوە ڕەزیل کردوە و پریشکی نگریس و چەپەڵی ئەو شەڕە داوێنی بەشەکانی دیکەی کوردستانیشی گرتۆتەوە.

شەڕی بێجێ و ناڕەوای ئێوە لە کوردستانی باشور، دم بەدمەی سوکی تەبلیغاتی ئێوە نەک هەر بۆتە هۆی ڕیسوایی و سەر شۆڕی کورد لە دەرەوەی وڵات، نەک هەر بۆتە هۆی سارد بوونەوە و پاشگەز بوونەوەی ئەو بڕوکە پشتیوانیەی کۆڕ و کۆمەڵە سیاسیەکانی جیهان، بەڵکوو بۆتە هۆی ئەوەش کە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان بە ئاشکرا و بە زۆرەملی بەرنامەی کورد قڕانی خۆیان لە کوردستاندا پیادە بکەن.

ئاکار و سیاسەتی ڕووخێنەرانەی ئێوە جگە لە بە فیڕۆدانی خوێنی سەدان ڕۆڵەی ئازاد و فیداکاری کورد، بۆتە هۆی ئەوەش کە لە لایەک حکوومەتی تورکیا بە کەڵەگایی بە بیانوی ڕاونانی پێشمەرگەی پارتی کرێکارانی کوردستان لەشکر

بێنێتە نێو خاکی ژێر دەسەلاتی حکوومەتی هەریمی کوردستان و کەرامەت و سەروەری دەسەلاتی نەتەوەیی کورد بخاتە ژێر پۆستاڵی عەسکەری وەحشی

تورک و له لایەکی دیکەشەوە کوردە پەنابەر ولێقەوماو و نیشتمانپەروەرانی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان له ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دوو حیزبی ئێوەدا ڕووت بکرێن و بکوژرێن و بە دەست بەستراوی بدرێنەوە بە حکوومەتی ئیسلامی ئێران و نەک هەر ئەوە، بەڵکوو بۆ ڕازیکردنی ویستی دەوڵەتی ئازادیکوژی تاران ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران دابخەن و چەند میلیۆن کورد له بیستنی دەنگێکی ڕەوا و ئازادیخوازی کوردی بێبەش بکەن. ئێمە کۆمەڵێک نیشتمانپەروەری کوردی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان کە لە پێناو ئازادی و ڕزگاری لە ژێر دەستیی و زۆرداریدا دەر بەدەر بووین و سەر بە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسیش نین، سەرەڕای ئەوە کە لە پشتیوانیکردنی بزووتنەوەی کوردستانی باشوور دریخیمان نەکردوە و لە هاو دەردی و ڕەخنە و بێزاری کوردەکانی ئورووپاش دژی سیاسەتی خۆ کوژی ئێوە بەشدار بووین، ناتوانین لە ئاست کارەسات و ڕوو داوە داخدارەکانی نیشتمانەکەمان بێدەنگ و بێلایەن بوەستین. ئێمە لە گەڵ مەحکوم کردنی پەلاماری دڕندانەی حکوومەتی تورکیا بۆ سەر باشووری کوردستان، هەموو جۆرە دەست تێوەردان و ڕەشەکوژی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانیش لە کوردستانی عیراق مەحکوم دەکەین. هەر وەها هەموو جۆرە زەخت و فشارێک بۆ سەر هێزە سیاسی و کوردە پەنا بەرەکانی بەشەکانی تری کوردستان له لایەن هەر کەس و هەر ڕێکخراوەیەک بێ، بە کارێکی دژی نیشتمانی و دژ بە دیموکراسی و مافی ئینسانی دەزانین و بە توندی مەحکومی دەکەین. ئێمە لە گەڵ دەربڕینی بێزاری لە شەڕی کورد کوژی نێوان پارتی و یەکێتی، داواتان لێدەکەین تا دەرفەت لە کیس نەچوە، بە وەستاندنی شەڕ و چارە سەر کردنی ناکۆکیەکان لە ڕێگای وتو وێژی ئاشتیانە و ڕێز گرتن لە بیر و ئاواتی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و واز هێنان لە سەپاندنی دەسەڵات بە زۆرە ملی و هێزی چەک، پیلانی دوژمنانی کورد کۆڕ بکەن و نیشتمانپەروەری و لە خۆ بوردوویی خۆتان بەرانبەر بە بەرژەوەندیی گەل و نیشتمان بە دنیا ڕابگەیێنن. ئەزموونی ڕابردووی بزووتنەوەی کورد چەوتی و زیانی سیاسەتی پشت بەستن بە دوژمنانی بە جوانی دەر خستوە، دڵنیاین مێژوو لە تاوانی هیچ کەس خۆش نابێ. لە لایەن ١٠٠ کەس لە نیشتمانپەروەران و ئازادیخوازانی کوردستانی ئێران لە سوید.

### پارلمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات

لە سەرەتاکانی مانگی ئەپریلدا کومیتەی ئامادە کردنی پارلمانی کوردستان داوەتی کردم کە لەڕێ و ڕەسمی دامەزرانی پارلمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات دا بەشداری بکەم. ڕۆژی حەوتی ئەبریل کاروان سەعید کارتی داوەتی بۆ هێنام.

ڕۆژی ١٠ی ئەپریل سەعاتی ١٢و ٢٠دەقیقە بە قەتار بەرەو بروکسێل(بلژیکا) کەوتمە ڕێ. چەند گۆڤار و ڕۆژنامەم لە گەڵ خۆ هەڵگرت و لام وایە بۆ سەفەری وا درێژ باشترین هاودەم و هاورێ کتێب و ڕۆژنامەیە.. من لەم بارەوە ئەزمونی بەنرخم هەیە. لەو جۆرە سەفەرانەدا کە کەمیش نەبوون، چەند کتێبم خوێندوونەوە. سەعاتی هەشتی بەیانی گەیشتمە بروکسێل. لە قەتار هاتبوومە خوار، گوێم لێبوو یەکێ گازم دەکات، ئاوڕم داوە خوالێخۆشبوو، دۆست و هاورێیی بەرێز کاک نەبی قادری بوو. ئەویش داوەت کرا بوو. یەکترمان گرتەوە و تەلیفونمان کرد بۆ ئەو ئادرێسەی لە کارتی داوەت دا هەبوو. پاش ماوەیەکی نە کەم برادەرێک هات و بردیانین بۆ دەفتەری کۆمیتەی ئامادە کردن. پاش نان و چایەکی پارتیزانی سواری ترومبیلیان کردین بۆ لاهە. برادەرێکی دیکەی کوردی باکوریشمان لە گەڵ سوار ببوو. لە تەواوی ڕێگادا ئەم برادەرە لە گەڵ شۆفیرەکە( کە هەرتکیان کوردی باکور بوون) لە تورکی بەدەر یەک وشەیان بە زماندا نەهات. پاش ماوەیەک ئاژوان برادەری شۆفیر سیغارێکی داگیرساند و ڕووی لەمن کرد و گوتی:« ماموستاتۆ پێ نارەحەت نابی ئەز سیغار دەکێشم؟» گوتم : نا، بیکێشە. هەر بە قەدرایی ئاخافتنی تورکیەکەت پێ نارەحەتم. فەرقی نیە. تورکی بپەیڤی و یا سیغار بکێشی.» کاک نەبی ڕەحمەتی زۆر پێکەنی و چەند ڕۆژ پێکەوە بووین، کاک نەبی لە بیری نەدەچۆوە. ئێمەیان گەیاندە لاهە. میوان زۆر بوون و بە شێوەیەکی لە ڕادە بەدەر ڕێک و پێک و باش کارەکان تەرتیپ درابوون. دەبوایە هێندێ لە میوانان بە سەر ماڵاندا دابەش بکەن. کاک نەبێ گوتی: کاک کەریم! ئەوەندە بەسەر ماڵاندا دابەش کراوین، بێتام بوە. تۆ وەدەنگ وەرە و بڵێ ئێمە لە هوتێل دەبین.

برادەری بەر پرس هاتە لام و گوتی ماموستا هون چدبێژن ؟ گوتم ئێمە

دەخوازین له هوتێل بین ئەگەر جێگا هەبێ. گوتی جێگا هەیە، له هوتێل(بێل ئایر)ژوورێکی دوو ژووری خاوێنیان پێ نیشاندایین و چووینە هوتێل. ئەوەی بۆ من سەرنج ڕاکێش بوو، ئاخاڤتنی نێو خۆی برادەرانی کوردستانی باکور بوو. لام وابوو هەموویان کوردیان دەزانی و یا بڕێکیان هەر دەزانی. بەلام جگە له (ڕۆژ باش)یەک وشەی دیکەیان بە کوردی نەدەگوت. باسی گیر و گرفتی زمانمان دەکرد، کاک نەبی گوتی : لێیان گەڕێ، بەتۆ چار ناکرێ، تورکی خۆیان پێ باشترە. له سالۆنی هوتێلەکە دانیشتبووین، دوو برادەر بە تورکی قسەیان دەکرد. خوا لێخۆشبوو دوکتور حەسەنی حسامی یەک بە خۆی نەڕاندی و گوتی: تۆ ئەوە پارلمانی کوردستانم بۆ تەشکیل دەدەی و(هەرە گێدەر سەن)- م بۆ دەلێی. بڕێکیش بەوە پێکەنین.

ڕۆژی ١٩٩٥/٤/١٢ له سالۆنێکی گەورە کاتژمێری ١٠(پارلمانی کوردستان له دەرەوەی ولات) دەستی بە کار کرد. میوانی زۆری بێگانە له نووسەر و سیاسی و پارلمانتاریست و کەسایەتی سیاسی و کۆمەلایەتی ولاتانی ئورووپا( ئەلمان، ئیتالیا، ئوتریش، ئینگلستان، بیلژیک، دانیمارک، رووسیا، سویس، سوید، فرانسە، قبرس، هولەند، یونان ) بەشداری کۆبوونەوە بوون. خەلکێکی یەکجار زۆری ڕەمەکی کوردیش له سەرانسەر ی هولەند و بەلژیک و ئەلمان و دانمارک و سوید هاتبوونە بەشداری ئەم ڕووداوە گرنگە. چونکە هەوەلجار بوو کە کورد له دەرەوەی ولات بە ئاشکرا پارلمانێکی دابمەزرێنێت. دیارە له ژێر ناوی( پارلمانی کوردستان له دەرەوەی ولات) ڕووداوەکە بەڕێوە دەچوو. بەلام له ڕاستیدا دەبوایە بەناوی:( پارلمانی کوردستانی باکور له دەرەوەی ولات) ناو دێر کرابایە. چونکە کوردەکانی باکوری کوردستان ئەویش پارتی کرێکارانی کوردستان و کەسانی سەر بەو حیزبە ئەم پارلمانەیان دادەمەزراند. هیچ حیزب و ڕێکخراو و کەسایەتی سیاسی و ناسراوی نەک هەر بەشەکانی دیکەی کوردستان، تەنانەت هی باکوری کوردستانیش بەشداری ئامادەکردن و بەڕێوە بردن و دامەزرانی نەبوون. ئەو ئەندامانەی کە بەناوی نوێنەری پارلمان سوێندیان دەخوارد، خۆیان دیاریان کرد بوون و له لەلایەن کۆمەلانی خەلکەوە هەلنەبژێردرابوون بێجگە له یەک دوو کەسی بەڕێوەی باشوری کوردستان کە خۆیان پێوە هەلاوەسیبوو، کوردی هیچ یەک له بەشەکانی تر بەشدار نەبوون

ئەوانەی بۆ پارلمانیان دیاری کرد بوون بەم چەشنەی خوارەوە سوێندیان دەخوارد:

Sond----- Di bin hemû mercan de, ezê îradeye gelê xwe» bingeh bigirim , ji bo azadiya kurdistanê bixebitim, tu cudahiyê nexim navbera gelên kurdistanê û biawaye ki layîq nûneriya berjeweenddiyên
wê bikim û mafê wê biparêzim. ji bo gelên kurdistanê armanca min damezrandina civateke demokratîk wekhewî u azade
Ezê di xebatên xwe de, tu berjewendiyên Sexsî nedim ber çav, wekhevî û yekîtiye netewî biparezim, eze bi sehîd û nixên kurdistanê ve girêdayî bim. Li hember dîrok û mirovahyê, le hember gel û wwelatê xwe, binamûs û serefaa xwe sond dixwwim. sox didim.

پێکهێنانی ئەم پارلمان و دەزگایە لە بواری تەبلیغات و پڕ و پاگاندەوە یەکجار زۆر گرنگ و دەنگێکی زۆری دایەوە. دامەزرانی پارلمانی کوردستان حکوومەتی تورکیای پەشاند . بوو بە هۆی دەربڕینی نارەزایی و پرۆتێستی رەسمی دەوڵەتی تورکیا لە حکوومەتی هولەند، بەڵام دەوڵەتی هولەند وەڵامی نەدایەوە. دەوڵەتانی ئێران و عیراق و سوریا کە سەبارەت بە مەسەلەی کورد و خەباتی کورد هەمیشە سڵ و لە سەر هەستن و زوو دژکردەوە نیشان دەدەن، لە بەرانبەر دامەزرانی پارلمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، گوێچکەی خۆیان کپ کرد و هەر وەک هیچ شتێک رووی نەدابێ هەر باسیشیان نەکرد.
دوو مەسەلە لەم کۆبوونەوە یە و لەم رووداوە گرنگەدا سەرنجیان راکێشام و لە دەفتەری یاد داشتەکانمدا جێگای خۆیان کردۆتەوە.
یەکەم : نەزم و تەرتیبات و رێک و پێکی بەڕێوە بردنی کارەکان و بەشداری خەڵکێکی زۆر و شادی خەڵکی بەشدار بوو، لە پێکهاتنی ئەم پارلمانە کە بە

ڕاستی جێگای پێزانین بوو.

دووەم : هەڵوێست و بۆچوون و سیاسەتی دامەزرێنەرانی پارلمانی کوردستانی لەدەرەوەی وڵات. وەک باسکرا گەلێک کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پارلمانتاریستی وڵاتانی جۆر بەجۆری بێگانە داوەت کرا بوون و بە نۆرە و لە کاتی خۆیدا داوایان لێدەکرا کە بێنە پشتی میکرۆفۆن و(ماساژێ خۆ) پێشکێش بکەن. واتە بێن وتاری خۆیان بخوێننەوە.

ئەوەی پێوەندی بە کوردەوە هەبێ، نەک هەر هیچ حیزب و هێز و ڕێکخراوی سەرەکی سەر گۆڕەپانی خەباتی کورد بانگ نەکرا بوون، بەڵکوو ئەوانەی داوەتیش کرابوون، ڕێگایان پێ نەدرا کە وتاری پشتیوانی بخوێننەوە و یا بیر و ڕای خۆیان دەرببڕن. ئەوکەسانەی کە داوەت کرا بوون و هێندێکیان نوێنەری حیزبی کوردیش بوون: وەک: کاک نەبی قادری نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستان ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕی( ڕەحمەتی)، کاک حوسێن کرمانج نوێنەری پارتی سەر بەخۆی کوردستان) مامۆستا شێخ خەلیل جندی نوێنەری پارتی کاری سەر بەخۆی کوردستان) عەلی قازی، دوکتور حەسەنی حسامی و کەریمی حسامی...) ئەوانە هیچیان ڕێگا نەدران کە هیچ نەبێ پشتیوانی خۆیان لەم ڕووداوە گرنگە ڕابگەیێنن. بۆیە دەڵێم ڕێگا نەدران چونکە من خۆم دوو جاران داوام کرد و گوتم من بۆ سەیران نەهاتووم. کە داوتتان کردووم، دەبێ ڕێگاش بدەن هێندێ بۆچوونی خۆم لە سەر ئەم ڕووداوە گرنگە دەر ببڕم. جارێک گوتیان : ئەوە کاری دەستەی بەڕێوە بەرییە. جاری دوایە لە گەڵ بە ڕێز ڕەمزی کارتال وەک ڕەخنە داوام کرد. لە گەل محەمەدەمین پێنجوێنیش کە (بە کەرەمی خودای مەزن و لە سایەی تێکۆشانیەوە و بە دەنگی کۆمەڵانی خەڵک) گەیشتبوە پلەی ئەندامەتی پارلمانی کوردستان باسم کرد . ئەویش گوتی: وادیارە وتاریان هەر بۆ بێگانان داناوە.!

قەیدی نەبوو. بڕیاری خۆیان بوو. بەشداری و وتاری ئورووپاییەکانیش گرنگی خۆی هەبوو. بەڵام لە پڕ دیتمان کابرایەکی سریلانکایی لە بزووتنەوەی ( تامیل) هاتە پشتی میکرۆفۆن و پشتیوانی خۆی لە پارلمان و لە کورد ڕاگەیاند و چەپڵەی زۆری بۆ لێدرا. جارێکی دیکەش بۆم ڕوون بۆوە کە خوێنی بێگانە پەرستی و خۆیی بە کەم دانان لە جەستەی کورد دا

بلاو بۆتەوە و فەرقیشی نیە کێ بێت و لە کوێ بێت. ئەگینا فەرمایشتی کابرای تامیلی ئەو سەری دنیا بۆ دەبێ باندۆڕی (تەئسیری) لە وتار و پشتیوانی حیزبێک و هێزێک و کەسایەتیەکی کورد، بۆ کورد کەمتربێ؟

پاش کۆتایی ئاهەنگی پارلمان چوومە بۆن میوانی کاک جەمالی زاریع بووم. برای خۆشەویست هێدی شاعیریش لەوێ بوو، لەسەر پێکهاتنی پارلمانی کوردستان و سەفەرەکەم وتو وێژێکی چاپەمەن پێکهێنا و نارد بووی بۆ گۆڤاری گزنگ و لە ژمارە ... بلاو کرا وەتەوە. ١٦ی مانگ چوومە دانمارک سەردانی مام عەزیز و کاکۆی قادری و شەو خوشکە خەیالی خێزانی خوا لێخۆشبوو کاک نەبی قادری میوانداریەکی کوردانە وخزمانەی لێکردین. ڕۆژی ١٧ی ئەپریل گەڕامەوە بۆ ستۆکهۆلم.

**گەڕانەوەی کاک عومەری قازی بۆ ئێران.**

کاک عومەری قازی پاش ماوەیەکی زۆر زیندان و ئەشکنجە و ئازاری بەر دەستی حکومەتی ئاخوندی دەرباز ببوو، گەیشتبوە کوردستانی عیراق. وەک بۆی باس دەکردم مانەوەی لە عیراقیش زۆر لە ژیانی زیندانی کۆماری ئیسلامی خۆشتر نەبوە. هەر چۆنێک بوو کاک عومەر گەیشتبوە سوید. بەو بۆنەوە کە ماوەیەکی زۆر لە مەهاباد پێکەوە لە تەشکیلاتێکی حیزبی دێموکراتدا هاو کار بووین و دۆستایەتیمان لە برایەتیشی تێپەڕاند بوو(بڕوانە لە بیرەوەرییەکانم بەرگی شەشەم کەریمی حسامی) لە سوید زۆر جار یەکترمان دەبینی و ئەگەر ڕۆژێک یەکترمان نەدیبایە تەلیفونی دەکرد و دەیگوت :« لە کوێی؟ کەسم وەگیر ناکەوێ دوو قسەی خۆمانەی لە گەڵ بکەم. »

کاک عومەر پڕوژەیەکی هەبوو کە ژیانی زیندان و ئازار و ئەشکنجە و سەر بردەی خۆی بنووسێتەوە. بە داخەوە خێزانی کاک عومەر توشی نەخۆشی شێر پەنجە ببوو. پاش ئەوەی لە سوید نۆژداری کرا، ئیتر هیوا بە ژیانی نەما بوو. دەیویست بچێتەوە لە ولات مالاوایی لە نیشتمان و کەس و کاری بکات. ئەو مەسەلەیە بۆ کاک عومەر ببوە داخ و دەردێکی بەژان و قورس. داما بوو، لە گەڵ خێزانی بچێتەوە زیندانێکی سەر ئاواڵە و بەر فراوانی وەک ئێرانی ئێستا، یا خێزانی بەتەنیا بنێرێتەوە و خۆی لە سوید بمێنێتەوە.

ڕۆژی ٩٥/٤/٢٢ تەلیفونم لێکرد گوتم با بچین لە ڕەستورانێکی چینی نانێکی باش بخۆین. گوتی: جا ئەو سەگبابانە نانیان هەیە ؟ قەت لە بیرم ناچێ. لە سەر نانخواردن کاک عومەر گوتی :« ..کاک کەریم توشی ئاستەنگێکی دژوار بووم. هیچم بۆ ناکرێ. مینا خانم تازە تەواو بوە، دەزانێ ناژی. پێ- شی داگرتوە بەم حاڵە بچێتەوە مەهاباد. دەزانم ئەگەر ماوەیەک ڕاوەستێ، تەواو دەبێ. بەڵام بۆ گەڕانەوە بە پەلەیە. ناشتوانم تەنیا بینێرمەوە، هەر چەند لەوێ کەس و کاری هەنە و پێشوازی لێدەکەن، بەڵام ئەگەر بە تەنیا بچێتەوە، بۆ من دەبێتە داخ و دەردێک هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە و بەرم نادا.»

گوتم: بەڵکوو منداڵەکان ڕازی بکەن کە بۆ گەڕانە وە تاڵوکە نەکات. با لێرە لە کن منداڵەکان بێ.

گوتی فایدەی نیە. بڕیاری داوە بگەڕێتەوە. منیش دڵم بڕوانادا هیچی پێ بڵێم. پێم خۆشە تۆ کە سەری دەدەی، بەجۆرێک حاڵی بکەی کە گەڕانەوە هیچ دەردێکمان دەوا ناکات. بەڵکوو بە قسەی تۆ قەناعەتی بێت. ڕۆژی دوایی لە گەڵ دایکی کەماڵ چووینە سەر دانی کە لە خەستەخانەوە بردبوویانە شوێنێکی حەسانەوە کە پاش برینکاری هێندێ نەخۆشی لێدادەنێن. زۆر بە پارێز لە گەڵم باس کرد. دیار بوو بڕیاری گەڕانەوەی دابوو. قسەکانی کاک عومەر و بار و دۆخی ژیانی ئەوان کاری تێکردم و زۆر ناڕەحەت بووم. ئەو کاک عومەرەی ئازا و بە هیممەت و بە شەخسیەت بە دەست چارە نووسێکی تەماوییوە داما بوو هیچی بۆ نەدەکرا.

ڕۆژی ٩٥/٤/٢٧ چووینە فڕۆکە خانەی ستۆکهۆڵم کە کاک عومەر و مینا خانم بەڕێ بکەینەوە. گەلێک لە دۆست و برادەران تەنانەت لە شارەکانی دیکەشەوە هاتبوون بەشداری لە م ڕووداوە داخدارەدا بکەن. تەم و خەفەت بە سەر برادەرانی بەشدار بوودا باریبوو. هەوڵجار بوو عومەری قارەم دەبینی لە کاتی ماڵاواییدا ئاوی لەچاوان بگەڕێ. تۆزێک بەوە هاتمەوە سەر خۆ کاتێ دایکی کەمال دیارییەکی بچوکی دۆستانە و برایانەی لە پاکەتێکدا بۆ مینا خانم دا بە کاک عومەر وئەویش سوپاسی کرد. نازانم برادەرانی دیکە، بەڵام بە ڕاستی ئێمە چەند ڕۆژ ئەو دیمەنە داخدارەمان لە هزر و بەر چاو بزر نەدەبوو. پاش ماوەیکی کەم خەبەر هات کە مینا خانم دوور لە منداڵە کانی سەری ناوەتە

وە و کاک عومەری قازی ئەمجارە بە داخ و کەسەرێکی زیاترە وە بە تەنیا لە مەهاباد ماوەتەوە. لە سوید دۆست و برادەران و منداڵەکانی ٩٥/٦/١١پرسە و سەرە خۆشیان بۆ دانا و بەم هاو دەردییە ڕەنگبێ خەم و خەفەتی کچ و کوڕەکانی تۆزێ کەم بوو بێتەوە، بەڵام بێگومان بۆ کاک عومەر کارەساتێکی دڵتەزێن بوو و زەحمەتە لە بیری بچێتەوە.

لەم سەرە خۆشیە دا پێشنیارم بە کاک ئەمیری قازی کرد کە هەر لە ئێستاوە بۆ یادی ٥٠ ساڵەی دامەزرانی کۆماری کوردستان بیر لە پێکهێنانی کومیتەیەک بۆ ساز دانی سێمینار و شیکردنەوە و ئامەنگێکی شایان بکەنەوە. بەڵام پێشنیارەکەم بە هەوا دا ڕۆی.

٩٥/٤/٢٩ لە لایەن پارتی کرێکارانی کوردستانە وە کۆ بوونە وە یەک لە (کوردستان سەنتەر) پێکهاتبوو، زۆر کەس بەشداریان کرد بوو. برادەرێکیان تەلە فونی کرد و داوای کرد منیش بەشداری بکەم. برادەرێکی بەر پرسیان بە شێوەی ئاخافتن و بو چوونی خۆیان لە سەر کۆنگرەی پێنجەمی پارتی کرێکاران( پێ. کا. کا) بە درێژی قسەی کرد و گوتی: ساڵی ١٩٩٥ ساڵی وەدەست هێنانی ئیقتدار و ساڵی دامە زراندنی دەوڵەتی کوردییە. پارلمانی کوردستانیش لە دەرەوەی وڵات خشتی بناخە ی ئەم دە وڵە ت و دە سە ڵاتە یە. دیارە خەبەرێکی خۆش بوو. برادەر بە شێوەی ئاخافتنی سەرۆک دایگیرساند بوو، دتگوت بۆ خەڵکێکی نەخوێندەواری دوا کەوتووی گوندەکانی چیا دەپەیڤێ و نۆرەی نەدەدا. کاک حەمەدەمینی سراجی هێندێ پرسیاری لێدەکردن، بەڵام ئەو لە ئاشێکی تری لێدەکرد و بە لای وەڵامی سەر ڕاستی پرسیارەکانی کاک حەمەدەمیندا نە دەچوو. من لە بەر نە ساغی نەمتوانی تا ئاخر دابنیشم.

پاشان زۆر درەنگ بیرم لێکردە وە کە بە خۆڕایی نیە ئەو برا کوردانە ی کوردستانی عیراق و ئێران وا بێ هەڵبژاردن و بێ دەنگدانی خەڵک دەبنە ئەندامی پارلمانی کوردستان و کۆنگرەی نەتەوەیی لە دەرەوەی وڵات ، هەر وەک مریەمی ڕەجەوی دەبێتە سەر کۆماری ئێران بێ ئەوەی کەس لە ئێران دەنگی بۆ دابێت. چونکە ئێستا کە هیچ لە گوڕێدا نیە دەبن بە نوێنەری پارلمان، سبەی کە دەوڵەت کوردی لە ژێر دەسەڵاتی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە پێکهات، بێگومان پلەی وەزارت و وەزیری هەر قسەی لێناکرێ.!!

هەر ئەو ئێوارەیە، واتە ٤/٢٩ رادیۆم کردەوە برادەرێکی ئێرانی لە رادیو (چەرمند پەرمند) لە سەر بار و دۆخی ئێران قسەی دەکرد. رژیمی ئاخوندیی تارانی هێنا بوە سەر لوتکە هەڵدێران و قلبوونەوە. بەڵگەشی ئەوە بوو کە لە ئێران قیمەتەکان لە ڕادە بە دەر چوونە سەر و گرانی حەشر دەکا و خەڵک توانای کڕینی شتو مەکیان نەماوە و حکوومەتیش ناتوانی نرخەکان کونترۆل بکات و دەرووخێ و خوداش ناتوانێ دەربازی بکا. دیار بوو کابرا هێندێ کۆنە کتێبی لە بارەی قەیرانی سەرمایەداری خوێند بوونەوە ، کاوێژی دەکردنەوە. بۆم دەرکەوت نەخۆشییەکە تەنیا هەر لایەنێکی نەگرتۆتەوە. ئێمەش لە کوردستانی سەر دەمێک هەموو ڕۆژی دوو شەمۆیان کە لە سالۆنی بارەگای دەفتەری سیاسی قسە مان بۆ خەڵک دەکرد لە کۆتایی وتارەکەماندا حکوومەتی ئێرانمان لاواز نیشان دەدا و دەمان ڕووخاند. تا ڕۆژێکی کاک سمایلی بایزیدی کە فەرماندەی یەکێ لە هێزەکانی پێشمەرگەی حیزبی دێموکرات بوو، هاتبۆوە دەفتەر و هاتە کن من و لە گەڵ قسە و باسی خۆش گوتی :« ئەرێ کاک کەریم ئێستاش ئێوارەی دوو شەمۆیان هەر دەیڕووخێنن؟»

ــــ بەڵێ... لەئاخری وتارەکاندا دەبێ بڕووخێ!

ــــ وەڵلاهی بە ماڵە شێخی نایبینن.

قسەی کاک سمایلی وەڕاست گەڕا. تا ئێستا نەماندیوە، بەڵام لای هێندێ حیزب دروشمی ڕووخان هەر وەک بیست ساڵ لە مەو بەرە. وادیارە فەرمایشتی مەلای مەزبووریش ڕاستە کە دەفەرموێ:« قسەی پیاوان هەر یەکە !» هەر دەیڕووخێنن بێ ئەوەی بزانن چی دێتە جێ کە بۆ کورد باش بێ.!!

**سێمینارلە یۆتۆبۆرگ لە سەر ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران**

کاک شەماڵ برادەرێکی کوردستانی عێراق لە یۆتۆبۆرگەوە تەلیفونی کرد و بە ناوی کۆمەڵەی کوردی لەو شارە داوای لێکردم کە ڕۆژی ٩٥/٥/٧ سەبارەت بە بار و دۆخی کوردستانی ئێران سێمینارێکمان هەبێ. ڕۆژی ٩٥/٥/٦ بە قەتار بەرە و یۆتۆبۆرگ کەوتمە ڕێ. کاک شەماڵ و یەک دوو برادەر لە نیزگەی قەتار چاوە ڕوان بوون. شەو میوانی کاک شەماڵ بووم و ڕۆژی دوایی لە بارەگای کۆمەڵەی کوردی بە بەشداری پترلە ١٠٠ کەسێک لە کوردەکانی

دانیشتووی ئەو شارە کۆڕەکەمان دەستپێکرا.

لە سەرەتادا داوام لە بەشدار بوەکان کرد با شێوەی سیمینار و کۆبوونەوەکان بگۆڕین، بەو مانایە ،باتەنیا کەسێک نەیە لە پشتی مێز دابنیشێ و قسان بکا و دوایەش چەند کەس پرسیار بکەن و وەڵامیان بدرێتەوە. باشتر وایە کە برادەرانی دیکەش لە باسەکە دا بەشداری بکەن و بیر و ڕای خۆیان دەر ببڕن، با بۆچوون و بیر و ڕای جیاواز بێنە گۆڕێ و کەلک لە باسەکان وەر بگرین. برادەران پێشنیار و ویستیان ئەوەیە کە لە کۆڕی ئیمڕۆماندا بار و دۆخی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان بخەینە بەر باس. مەسەلەیەکی دژوارە، پیاو نازانی لە سەر بارو دۆخی ئیمڕۆی کوردستانی ئێران باسی چی بکات؟ تەواوی دام و دەزگا ڕاگەیێنەرەکانی جیهان لە ئاست ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران و لە ئاست سیاسەتی حکوومەتی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان قوڕ و قەپیان کردوە و باسی ناکەن. ئەوەش لام وایە تاڕادەیەکی زۆر بۆ خودی بار و دۆخی هێزە سیاسیەکانی کۆڕە پانی خەباتی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان دەگەڕێتەوە. ئەوەش فەلسەفەی ژیانە. ئەگەر جمو جۆڵ و چالاکی و هەڵسوڕانت هەبوو، ئەوە دەنگ و باسیشت بڵاو دەبێتەوە و دەنگیشت دەبێ و حیسابیشت بۆ دەکەن.

من لە باسەکەمدا لە پێکهاتنی کۆمەڵەی ژ. کافەوە تا کۆماری کوردستان و قۆناخەکانی دوای ڕوخانی کۆمار و تێکچوونی ڕژیمی پاشایەتی و هاتنە سەرکاری حکوومەتی مەلایان و سیاسەت و ستراتیژی و دروشمی هێزە سیاسیەکانی کوردم بە درێژی باس کرد و کەم و کوڕیەکانم ڕوون کردەوە و لە سەر یەک باسەکە بۆ بەشدار بوان سەرنج ڕاکێش بوو. زۆر لە بەشدار بوانی کۆبوونەوە بە دەربڕینی بیر و ڕاو بۆ چوون و پرسیاری جۆر بەجۆر بەشداریان کرد و لە کەش و هەوایەکی دۆستانەدا کۆڕەکەمان کۆتایی پێهات. شەو کاک شەمال لە ماڵی خۆیان میوانداریەکی کوردانەی ساز کرد و تا درنگانێک دانیشتنێکی خۆشمان بردە سەر. ڕۆژی ٩٥/٥/٨ بۆ ستۆکهۆڵم گەڕامەوە.

٩٥/٥/١٠ لە گەڵ کاک حەمەدەمینی سیراجی چوومە خەستەخانەی کارۆلینسکا تا باسی چۆنیەتی نژداری دڵم بۆ بکەن. دیمەنێکی سەیر بوو. پتر لە ٣٠ کەس لە نۆرە دا وێستا بوون بۆ ئەوەی ڕوونیان بکەنەوە کە چۆن سنگیان دەقەڵێشن و دڵیان وە بەر نەشتەر دەدەن. سێستراپەک بە وردیی ڕەوەندی

برینکاری دڵت بۆ باس دەکا. جا وەرە بە پێی خۆت بچوو گوێ ڕابگرە کە چۆن دڵت شەقار شەقار دەکەن.

٩٥/٦/١٢ پاش ماوەیەک کار و هەڵگێڕ وەرگێڕ و پێداچوونەوە، بەرگی یەکەمی( پێداچوونەوە)م ئامادەی چاپکرد. دایکی کەمال کە سەفەری بولغارستانی دەکرد لە گەڵ خۆی بیباتە وێندەرێ و بە یارمەتی برا و دۆستی بەڕێزم دوکتور محەمەد کەریم شکاکی ڕێگایەکی چاپکردنی بۆ بدۆزێتەوە. ئێواریٚ کاک حەمەدەمینی سراجی هات و تەماشای سەر بەرگی کتێبەکەی کرد. یەک دوو هەڵەی زۆر زەقی لیٚ دیتەوە کە من و دۆستی خۆشەویستم بەڕێز ئاکرەیی نووسیبومان و سەرنجمان نەدابوویە. بە ڕاستی سەرنجی کاک حەمەدەمین نەبایە بە هەڵەیەکی زەق و ناحەز تێدەپەڕی. بولغاریش تێی نەدەگەیشتن.

نیمرۆ ٩٥/٦/١٤ محەممەدی خوارزام لە ئامەستەردامەوە تەلیفونی کرد کە لە تایلەندەوە گەیوەتە هولەند. محەممەد ماوەی دوو ساڵ بوو بە ژن و منداڵەوە لە کوردستانی عێراق و لە تورکیا سەر گەردان ما بۆوە و بۆ ئوروپا دەر نەدەچوو. ئاخرەکەی ڕێگای تایلەند و هولەندی دۆزیبووە وەدەرباز ببوو. تەلیفوونم بۆ خوالێخۆشبووکاک نەبی قادری کرد کە بە نامەیەک بە ئەندامی حیزبی بناسێنیٚ بۆ ئەوەی وەری بگرن. دەبیٚ سوپاسی هەڵوێستی دۆستانە و ئینسانانەی کاک نەبی بکەم کە بە فاکس محەممەدی بە پۆلیسی هولەند ناساند بوو، پاش ماوەیک وەریان گرت و ئەویش لە ئاوارەکانی کورد لە هەندەران زیاد بوو کە ئێستا پەشیمانە.

٩٥/٦/٢٤ دەنگبێژ و هونەرمەندی ناسراوی کورد ناسری ڕەزازی بە بۆنەی ٤٠ ساڵەی ڕۆژی لە دایکبوونی داوەت و ئاهەنگێکی لە ڕادە بەدەر شاز و خۆشی ساز کردبوو. کۆمەڵێکی زۆری لە دۆست و برادەرنی کورد داوەت کرد بوو. تا بەیانی شەوەکەمان بە قسەی خۆش و گۆرانی و بە شادی بردە سەر. من دانەیەک کتێبی« دایکی ماکسیم گۆرکی» وەرگێڕاوەی خۆم بەم بۆنەوە پێشکێش کرد. پێم وابوو بۆ ناسر دیاریەکی بە نرخ بێت. چونکە ناسری ڕەزازی هەر هونەرمەند و دەنگبێژی سەر کەوتوو و ناسراوی کورد نیە. ناسر لە گەڵ نووسین و شیعریش سەر و کاری هەیە و کاری بە وەجی کردوون. لە پشتی کتێبەکە ئەم ڕستەیەم بۆ نووسیبووە کە ئامانج و دروشمی ژیانم بوە:« هیوادارم وەک هونەرمەندێکی کورد هەر گیز هەژار و زەحمەتکێشانی کورد فەرامۆش نەکات.»

**سێمینارێک لە سەر کۆماری کوردستان**

برادەرێک بە ناوی سادق سالح بەر پرسی لقی Med T V لە یۆتۆبۆرگ داوای لێکردم کە ڕۆژی ٩٥/٧/٨ لە شاری ئۆرێبرۆ لە سێمینارێکدا لە سەر کۆماری کوردستان لە مەهاباد بەشداری بکەم.

ڕۆژی ٩٥/٧/٦ چوومە ئۆرێبرۆ و میوانی کاک سەعید کوێستانی بووم. شەو تەماشای تەلەڤیزیۆنی MedTV مان دەکرد کە چەند کەسیان بانگ کرد بوو سەبارەت بە ( یەکیەتی نەتەوەیی)باس بکەن. وەک زۆربەی باس و دیالۆک و موناقەشەی کوردیی ئەسڵی باسەکە لە خەتی خۆی لایدا بوو، زیاتر ببوە دمبەدمەی نێوان نوێنەرانی پارتی دێموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی کوردستان و مابەینی نوێنەرانی پە. کا.کا وکۆمکار وکوک، حیزبەکانی کوردستانی تورکیا. مەلا شێخ عیزەدینیشیان بانگ کرد بوو باسی مەم وزینی خانی دەکرد ئەویش بە کەم و کورتی. نوێنەرانی پارتی و یەکیەتی لە جیاتی باسی مەسەلەی ( یەکیەتی نەتەوەیی) بە بەکار هێنانی وشە و زاراوی تایبەت بە خۆیان کاتیان دەبردە سەر.

یەشار کەیا سەرۆکی پارلمانی کوردستان لە دەرەوەی ولات و ماشەڵا نوێنەری پارتی کرێکارانی کوردستان لایان وابووکە لە تورکیا ( یەکیەتی نەتەوەیی) پێکهاتوە. کەسی دیکەش لە تورکیا نیە یەکیەتی لە گەڵ پێک بێنن. نوێنەرانی کۆمکار و کوک. دوو ڕێکخراوەی کوردستانی تورکیا ڕەخنەیان لە هەڵوێستی پە.کا.کا. ئەوە بوو کە لە گەڵ حیزبەکانی تری کوردی کوردستانی تورکیا وتو وێژ ناکەن و یەکیەتی پێک ناهێنن. یەشارکەیا و ماشەڵا لە هەڵوێستی هێزەوە قسەیان دەکرد و دەیانگوت: هەر کەس دەخوازێ بلا بێتە ژێر دەسەلاتی ئێمەوە.

خوا لێخۆشبوو کاک نەبی قادری کە نۆرەی هات گوتی : ئێوە لێرە ڕێگا نادەن کە خەڵکی تر بە تەواوی ناخافتنی خۆی پێشکێش بکا،کە وابوو چۆن داوای دێموکراسی و یەکیەتی نەتەوەیی دەکەن. کاک ئەمیری قازیش کە بەشداری کۆبوونەوەکەبوو، قەڵەمێکی ڕەشی بە سەر خەبات و بزووتنەوەی ٥٠ ساڵەی کوردستانی ئێران داهێنا و گوتی:« ئیمرۆ ڕێبەر و سەر کردە و شۆرش، هەمووی لە پارتی کرێکارانی کوردستاندا ساخ بۆتەوە و دەبێ هەموو لە ژێر ئالای ئەودا بۆ سەر بەخۆیی خەبات بکەین. کاک ئەمیری قازی لە قسەکانی خۆیدا حیزبە کوردییەکانی

بە حیزبی کوردی و کوردستانی دابەشکرد و پارتی کرێکارانی کوردستانیشی بە تاقە ڕێبەر و هیوا و هومێدی کورد دەست نیشان کرد..

ڕۆژی ٩٥/٧/٧ سێمینارەکە بە بەشداری کۆمەڵێک خەڵکی ئۆرێبرۆ دەست پێکرا، جگە لە مامۆستا مەحمودی مەلا عیزەت کە نووسراوەی بەنرخی زۆری هەن لە سەر کۆماری کوردستان، مامۆستا مەلا ڕەحیمی عەبباسی و کاک مەلا حەسەنی نوزهەت زادەش بانگ کرا بوون. مەلا ڕەحیم گوتی لە سەر کۆماری کوردستان هیچ نازانم، من باسێکی دیکە دەکەم. بەڕێوە بەری تەلەڤیزیۆن گوتی : ئەم سێمینارە بۆ باس لە سەر کۆماری کوردستان گیراوە. کە وایە بۆ جەنابت پرسێکمان نیە. بەڵام مامۆستا وازی نەهێنا و لە جیاتی باسی بزووتنەوەی کورد چەند سڵاوە تێکی بۆ خۆشەویستی خودا(د.ر) محەممەدی عەرەبی نارد و بێدەنگ بوو.

کاک مەلا حەسەنی نوزهەتزادەش چەند شیعرێکی ئەحمەدی خانی خوێندەوە. منیش لە گەڵ مەحمودی مەلا عیزەت بە کورتی لە سەر کۆماری کوردستان و گرنگی ئەو لە مێژووی خەباتی نەتەوەی کوردا قسەمان کرد. بەڵام بەڕاستی کات نە بوو کە بە تێر و تەسەلی باسەکە شی بکرێتەوە. شەو لە ماڵی کاک حوسێنی ئازەری میوان بووین، دوکتور محەممەدی ڕەحیمی-یش تەشریفی هات و شەوێکی خۆشی دۆستانە و پڕ لە قسەو باسمان بردە سەر.

### سێمینارێک لە سەر شەڕی کورد کوژی

ڕۆژی ٩٥ /٧/ ٢١ لە سەر داوای تەلەڤیزیۆنیMedTV بۆ بەشداری لە کۆڕێک لە سەر بار و دۆخی کوردستان چوومە بروکسێل. برادەرێک لە فڕۆکەخانە چاوە ڕوان بوو. یەکترمان دیتەوە و چووینە دەفتەر. جا وەرە سیغارت بۆ بکێشن و گوێت لە تورکی بێت. من لە بەر نەخۆشی دڵم لە سیغار بێزارم و نارەحەت دەبم. ناچار لە گەڵ برادەرێک کە دەچوە لاهە، سوار بووم و چووم لە کەمپی پەنا بەران محەممەدی خوارزام دیتەوە و تاوێک لە لایان دانیشتم و شەو درنگانێک گەڕاینەوە بۆ بروکسەل.

ڕۆژی ٩٥/٧/٢٢ بە بەشداری دوکتور کەمال میراودەلی، دوکتور جەببار قادر، برادەرێکی کوردی سوریا بە ناوی محەممەد دەوران، نوێنەری ئەرەنەکا، سەعدی پیرە نوێنەری یەکیتی نیشتمانی، دوکتور کەمال کەرکوکی نوێنەری پارتی لە سەر شەڕی

نێوان پارتی و یەکێتی باسەکە دەست پێکرا. لەو دیاتەدا ڕێزدار کاک عەزیز محەممەد، هادی مەحمود، وریا سەعید بە تەلیفون بەشداریان کرد. من لە ئاخافتنی خۆم دا گوتم: برادەران دەڵێن شەڕی براکوژی. من ئەوە بە شەڕی کوردکوژی دەزانم با لە مەو دوا بە شەڕی کورد کوژی ناو بەرین. چونکە برا یەکتر ناکوژن مەگەر دوژمنی کورد بە گژ یەکیان دابکەن. ئەوە شەڕێکە دوژمنانی کورد بۆ لە بەینبردنی کورد بە دەستی کورد سازیان کردوە. لە هەمووی خۆشتر دمبەدمەی نوێنەرانی پارتی و یەکێتی بوو کە هیچیان پێیان لە ڕاستی نەدەنا و یەکتریان تاوانبار دەکرد. پێشنیار کرا کە هەیئەتێک پێک بێت و بۆ ناوبژیکەری بچێتە کوردستان. من گوتم: نە باسەکەی ئێمە لێرە و نە چوونی هەیئەت بۆ کوردستان فایدەیان هەیە، باشتر ئەوەیە هەیئەتێک ساز بکرێ و بچێتە تاران، داوا لە حکومەتی ئێران بکات، بانگیان بکاتە تاران و بە...... ئاشتیان بکاتەوە. ئەم کۆبوونەوانە هیچ فایدەیان نەبوو. دوژمنانی کورد وەها دەستیان خستبوە نێو کێشەکە و ئاگریان خۆش کرد بوو، مەگەر خۆیان کوژاندبایانەوە ئەگینا بە تێکۆشەرانی کوردخامۆش نەدەکرا.

**ڕۆژەکانی نەخۆشخانە:**

وەک پێشتر بۆیان دیاری کردبووم دەبوایە دەڵم بکەوێتە بەر نژدەریی دوکتوران و ڕوونیش نەبوو ئەنجامی چی دەبێت. ڕۆژی ١٩٩٥/٨/٢ چوومە نەخۆشخانەی کارۆلینسکا. برادەرێکی وەرگێڕی کوردیشیان بانگ کردبوو کە قسەکانی دوکتورم بۆ بکا بە کوردی. یەک لە هەڵەکانی گەورەم ئەوەیە کە وا چەند ساڵە لە سوید دەژیم، نەچوومە مەدرەسە وزیاتر لە بەر کاری ڕۆژنامەی سەر دەمی نوێ و نووسینی بیرەوەرییەکانم و شتیتر خۆم پێوە خەریک نەکرد و فێری ئەو زمانە نەبووم. هەر چۆنێک بێ تازە گوزەراوە توشی هەڵەیەکی گەورە بووم.

دوکتور هات و دەستی پێکرد و گوتی: «تۆ دەبێ دڵت عەمەل بکرێ. نژداری دوکتور پێنج سەعات دەخایەنێ. لە پێشدا بێهۆشت دەکەن. پاشان پێنج ڕەگی دڵت دەبڕن و دەمارێک لە قاچی چەپەت دێننە دەر و لە دڵت پێوەندی دەکەن. ئەو ڕەگەی لاقی چەپەت جگە لەوە هیچ ئەرکێکی دیکەی نیە. ئەوەش یەک لە کارەکانی خودای مەزنە. ئێستا لێرە دەبی تا بەیانی و سێستڕا ئامادەت

دەکەن. لە دوای سەعات ١٢ەوە، نابێ هیچ بخۆی و بخۆیەوە.

ڕۆژی دوایی ٩٩٥/٨/٣ کاتژمێری هەشتی بەیانی لە سەر تەختێک درێژیان کردم و کچۆڵەی شلک و ناسک دەوریان دەدام و ئازای بەدەنم هەر تەختەی بە دەست یەکێکیانەوە بوو. کاتێ کە چاوم هەڵێنا، گوێم لێ بوو یەکێک دەیگوت: سەعات حەوتی بەیانیە. بەم حیسابە نیزیکە ٢١کاتژمێر بێهۆش ویا لە بەر دەستی دوکتور و لە ژێر چاوە دێری دابووم. گۆیا وەهۆش هاتبوومەوە، بەڵام وەهۆش هاتنەوەیەکی وا نەبوو. زمانم نە دەگەڕا. زار و لێوم وشک ببوون. چار و بار چەند دڵۆپە ئاویان بە زاری دا دەکردم. نازانم کەنگێ هێنایانمەوە ژووری ئاسایی نەخۆشخانە. ئەوەندە دەزانم کیژگەلی مریەم ئاسا، دەوریان دەدام و بە دەقیقە لێم خافڵ نەبوون.

هەڵوێست و ڕەفتار و ئەخلاق و میهرەبانی و پێراگەیشتن و دڵسۆزی ئینسانانەی ئەو جوانچاکانە ڕاستە و خۆ کار دەکاتە سەر ورە و گیانی نەخۆش. مەگەر هەر مامۆستا دڵزاری شاعیر بە قەڵەمی سیحراوی باسی جوانی و ڕەفتار و ئەخلاقی( لوسا و سوزانە و ماریا و نانینکا و ئۆڤا و.. ) بکا و خوێنە ری پێ بێنێتە زۆق و هەقی خۆیان بداتێ. جا ئەگەر مرۆڤ بێت و ژیانی سەر دەمی هەرزەکاری خۆی بنوسێتەوە، کابرایەکیش کە بە دزینی چیرۆکی فارسیی منالان، دم لە نووسین وەربدا، خۆی هیلاک و شەکەت دەکا تا لە نیزیکەی ٣هەزار لاپەڕەی بیرەوەری ئەم چەند دێرە بدۆزێتەوە و بنووسێ : دەستی کچۆ لانی کوشیوە.!

لە وانە خۆشتر لە خەستە خانە عەجەمێکی شاسەیوان( شەیاغی) نە خوێندەواری تۆزی لە کوردی حاڵیبووی خەڵکی (قزقەڵا و دەلکداش) لە پەنا تەختەکەت شین بێتەوە و پشووت پێ نەدا.

جارێ تا یادەدەمەوە سەر (یەدوڵای شەیاغی)* با لە کانگای دڵمەوە سوپاسی هەستی برایەتی و دۆستایەتی ئەو دۆست و برادەر و هاو ڕێ و هاو وڵاتیانە بکەم کە ماوەی ١٣ڕۆژ مانەوەم لە نە خۆشخانە دا، بۆ یەک ڕۆژیش چ بە هاتن و چ بە تەلیفونی ڕۆژانە لە ستۆکهۆڵم ولە شارەکانی سوید و وڵاتانی ترەوە نە یانهێشتوە هەست بە تەنیایی و بێ خەبەری لە دەنگو باس و قسەی خۆش و باس و خواسی هەمە چەشنە بکەم و لێم خافڵ نەبوو

*- شـەیاغی لە مـەڵبـەندی مـوکـریان و ناوچـەی شـامـات بەو شـاسـەیوانە عەجەمانە دەگوترێ کە نیشتە جێ نین. مـەڕ و مـاڵاتیان هەیە و هـاوینان دەچنە کوێستانەکانی سەهەند و مایبنلاغ و زستانان دێنەوە شاماتی نیزیک میانداو و لە زنج ( خـانووی قامیش)دادەژین. حوشـتریان هـەن و کرێباری دەکەن. بەشـی هـەرە زۆریشیان دزی دەکەن و بەدزی بەرێدەچن

بە تایبـەت کاک حـەمـەدەمینی سیـراجی کە یەک ڕۆژیش نەبوو نەیەتە لام. یەک جاریش نەبوو کە بە دەستی بەتاڵ بێتە لام و وەک هێندێ کەس بە وشـەی( ببورە گوڵ وەگیر نەکەوت)، شـان لە ژێر داب و ڕەسمی سەر دانـی نەخۆش و یا دۆست و برادەران خاڵی بکات. خۆ دەسکە گوڵ و پاپوشکەیەک لە خەستە خانە چ برینی نـەخـۆش دەوا نـاکـات. بەڵام دابێکی جـوان و ڕەچاو کـردنی داب و نەریتی کۆمـەڵایەتیە . ئەوانـەی گوێ نـادەنە داب و نەریتی باو، بڕوا مـەکە گوێ بدەنە هیچ شـتێکی تریش. کاک حەمـەدەمین نـەک هـەر قـەت بە دەستی بەتاڵەوە نەدەهات، بەڵکوو هەمیشـە دنیایەک دەنگ و باسـی ئاژانسەکان و قسەی خۆشی بۆ دەگێـڕامـەوە. لە وانـەش خـۆشـتـر یەکـجـاریش نەبوو کـە خـەسـتـەخـانە و ئاسـایشگای چەپرەکی چێکوسـلۆڤـاکیـای داگیـر کراوی وێرانکراوی شـەڕی دووهەمی جیهانی لە گەڵ خەستەخانە ی ڕێک و پێک و جوان و خاوێنی سوێدی ٢٢٠ ساڵ شەڕ نەدیتووی پێشکەوتویی سەرمایەداری پێک نەگرێ و بەراوردیان نەکات .

. هەر چۆنێک بێ سـەردانـی بەر دەوامی کـاک حـەمـەدەمین وایکردبوو کـە هەست نەکەم لە خەستە خانەم و بە تەنیام. چونکە بە ڕاستی کاک حـەمەدەمین ئەو سـێـزدە ڕۆژە نەک هەر نەیهـێشت بە تەنیـابم ،نەیهـێشت لە ڕووداوەکـانی جیـهـان و کـوردسـتـانیش بێ خـەبەر بم. ناخۆش ئەوەیە ئەو هـەمـوو دڵسۆزی و مـحـەبـبـەت و مـرۆڤـایەتیـەی دۆست و برادەران، تـەنیـا بە وشـەیەکی سـاوی ( سوپاس) قـەرەبۆ دەکرێتـەوە و جێی هـیچیش ناگرێت و دیسـان لە سـوپاسـیش بەدەر هـیـچی دیکەم لە دەست نایە. و هیـوادارم ئەم دۆسـتـایەتیـە لە نێـوان هـاونیشتمانان و دۆستانی وڵاتەکەماندا هـەر وا بەر دەوام بێت.

با خوێنەری بەڕێز تەنیا بە شتی جیددییەوە هیلاک نەکەم . قسەی خۆشیش لە نووسیندا چێژی خۆی هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە هەمیشە خەریکی خوێندنەوەی فەلسەفە و کاری تیئۆریکی نین. کاک ڕەحیمی محەممەد زادە لە ئۆرێبرۆوە تەلەیفونی دەکرد و دەیپرسی. پاش ١٣ ڕۆژ بۆ دەورەیەک حەسانەوە و هاتنەوە سەر خۆ ، بردیانمە خەستە خانەیەکی دیکە، بە ڕاستی چەپرەک و ناخۆش بوو، بە قەولی کاک حەمەدەمینی هەر دەتگوت خەستەخانەی چێکوسلۆڤاکیایە. نەوێستام تا ماوەکە تەواو دەبێ لە وێ بم، بەجێم هێشت و هاتمەوە ماڵێ. ڕۆژێک کە هێشتا هەرلە وێ بووم، کاک ڕەحیم دیسان تەلیفونی کرد و گوتی: ئەوە دوو ڕۆژە تەلیفون دەکەین نات دۆزینەوە، بۆ کوێیان بردووی؟

گوتم کاک ڕەحیم شوێنێکی زۆر ناخۆشە. هەر دەڵێی نەخۆشخانەی بەغدایە. لای خۆی بۆ حەسانەوە هێناویانمە ئێرە.

کاک ڕەحیم گوتی : قەی ناکا. پیاوی چاک بە، بزانە لە کن خۆت دوو تەختانیش بۆ من و بۆ کاک ڕەحیمی ئەمیری پەیدا ناکەی، بەڵکوو ١٥ڕۆژان بێینە وێ و پشوێکمان بێتەوە بەر و بحەسێینەوە.!!

با. بادەینەوە سەر عەجەمی شاسەیوان( شەیاغی). کابرا دوو سێ کچ و کوڕی لە سوید بوون. خۆشی لە تاران دەژیا و هاتبوە سوید و پەنا بەریی وەر گرتبوو،

لە پەنا تەختی من درێژیان کردبوو، شوکر حاڵیشی باش نەبوو. هەموو ڕۆژێ برادەر دەهاتنە لام و بە کوردی دەپەیڤین، تەمەس کابرای عەجەم لە کوردی حاڵی دەبوو، ڕۆژێک هاتە تینیشت تەختەکەم و بانگی کرد :

– حاجیاغا! من خەڵکی قزقەڵا و دەلکداش و سمایلە کە تم. من کوردیم دەزانی، لە بیرم نەماوە.

– تۆ خەڵکی تارانی. گۆیا بۆ سەردانی منداڵەکانت هاتوویە ئێرە. وەک هەموو عەجەمان ئیقامەشت وەر گرتوە. هاتو چۆی تارانیش دەکەی. لە تەڕی دەخۆی و لەوشکی دەنووی. چۆن خەڵکی قزقەڵا و دەلکداشی.؟

– ڕاستە.! حاجیاغا من بەد بەختم. لە تاران خانووم هەیە. ٢٦ میلیونیان پێداوم نایدەم. خومەینی هەموو کەسی کوشت. کورد و عەجەم و کۆمەڵە و موجاهید و تودەی کوشت. تۆ ئاگات لێ نیە. هەمەرا صف میکردند و

میکشتند. برایەکی من لە کوردستان کوژراوە.

- نە کا براکەت پاسدار یا ژاندارم بوو بێ؟ دەنا بۆ لە کوردستان دەکوژرێ.

- نا . ئەوە کۆنە. تۆ حەمەدەمین حاتەمی دەناسی ؟ ئەو دوو ساڵ لە گەڵ من زیندانی بوو.

- نەکا لە سەر قاچاغی و هیرۆئین گیرا بی.

- حاجیاغا ئادەم تا دەژی دەبێ کاسبی بکا. حەمەدەمین پیاوی باشبوو.

کابرا پشووی پێ نەدەدام. کەماڵی کورم هاتبووە لام و کابراش درێژەی پێدەدا. کەماڵ گوتی: بابە چەغەی کەیە با لە کۆڵت بێتەوە. بۆ خۆت ئیستراحەت بکە. پێم گوت ببورە. من گوێ دەدەمە دەنگو باس. بێدەنگ بوو، دەدەقیقە پێ نەچووبانگی کرد:

حاجیاغا تۆ خاڵەمین دەناسی ؟ شێخ مەحمودی قزقەڵا برای خاڵە مین دەناسی ؟ پێدا دەهاتە خوارێ و ناوی ئەو برادەرە حیزبیانەی دێنا کە کاتی خۆی لە گەڵ من لە پێوەندی دا بوون.لە پڕگوتی: تۆ سوڵتان قۆیتاس دەناسی ؟

ناچار لە ژێر لێوانەوە سەگبابێکم دەقەبەڵ کرد. من لە کتێبێ( کاروانی شەهیدان)دا بە درێژی باسی سوڵتان قۆیتاسی تێکۆشەر و کۆڵنەدەرم کردوە. یەک لەو تێکۆشەرانە بوو، تا مردن لە پێناو ئازادی زەحمەتکێشاندا خەباتی کرد. یەک لە دۆستانی خۆشەویستی من بوو. ئێستا سەگباب لێم دەپرسێ : دەیناسی ؟

بێدەنگ دەبوو.. من کتێبم دەخوێندەوە. لە پڕ دەستی پێدەکردەوە. منیش سەگبابێکم لێ قایم دەکرد وەها جێی خۆی دەگرت، مەگەر مەلا عەولای حەسەنزادە لە «کێلە پیاو» دا (سەگبابی) ئاوای چەسپاند بێت.

لە باسی شامات و شار وێرانەوە لە پڕ دەچوە سەر باسی سەهەند و مایندواڵغ نە شارەزایان بووم و نە یەکیان دەگرتەوە.

- حاجیاغا! تۆ عەبدولکەریم- ت دەناسێ؟

- عەبدولکەریم کێیە ؟

- لە مەهاباد دوکانی هەبوو ..

باشە. ئەگەر سەگبابێکم لێ قایم نەکردبایە. دەبوو چی لێبکەم ؟ هەزار عەبدولشەیتان لە مەهاباد هەبوە، من چو زانم عەبدولکەریم کێیە !

عەبدولشەیتان لە مەهاباد هەبوە، من چو زانم عەبدولکەریم کێیە !

فارسییەکەی لە فارسی من قۆرتر بوو. گوتم تۆ بۆ چی بە تورکی خۆت ناپەیڤی ؟

– لە بیرم چۆتەوە، منداڵەکانم هەر بە فارسی دەپەیڤن. لە تاران گەورە بوون. تاران..ئاخ... ئاخ بۆ ئەو ڕۆژە بەیانی زوو حوشترێکم لە شوتی بار دەکرد و لە قزقەڵا هەیدیم لێدەکرد بۆ مەهاباد. دەزانی... مەیدانی ئاردی هەبوو. قاوەخانەی ڕەشە هەبوو. دەتناسی ؟ شووتیم دەفرۆشت. هەموو شتێکم دەکڕی، ڕۆژئاوا دەچوومەوە قزقەڵا. ئەو شێخ مەحمود بە ڕاستی شێخ بوو. خاڵەمین لە بەر ئەو ڕۆی چۆە مەهاباد، چۆە نەغەدە. دەزانی ؟

سەگبابێکم دەقەبەڵ دەکرد. ئەوانەم هەموو دەزانین، چیم لێکردبایە؟

ڕۆژێکیان هات لە سەر سەرم وێستا و بێ ئەوەی چاک و چۆنی بکات، گوتی :

– حاجیاغا! تۆ حاجی تاغی دەناسی ؟ حاجی تاغی... ها....

– دەمناسی... پیاوێکی زۆر باش بوە... دەڵێن هەر کەسێک بۆ پێداویستێک چوو بێتە ماڵی حاجی تاغی، قەت بە ناهومێدی نەگەڕاوەتەوە.

– نا..نایناسی.. ئەو حاجی تاغی لە دنیا هەر یەک بوە ڕاوەستە بۆت باسکەم.

سەگبابێکم حەواڵە کرد و لە بەر خۆمەوە گوتم لە چارە ڕەشی کورد بە دوور نیە. کورد قەت مێژووی خۆی نەنووسیوە، و نایزانێ. هەر بێگانە بۆی نووسیوە. دوور نیە منێکی کە خەڵکی ناوچەم و جگە لەوەی حاجی تاغی لە کوردستان بە ناو بانگە، هیچ نەبێ ئەو شیعرەی سەیفی قازیم لە بەرە کە دەڵێ:

« تاغی لە کوێیە ئەو چادری جوانی: تیپ تیپ بێ میوان سەر سفرە و خوانی

دوو جارانیش میوانی ماڵی حاجی تاغی بووم. ئێستا عەجەمی شەیاغی دەڵێ نایناسی. گوتم بێژە، بۆم باسکە،

– ئەو حاجی تاغی ١٢٠ سەگی هەبوو. مەڕ و ئاژەڵی بە چەند مێگەل دابەش کرد بوو. تەپە ڕەش دەزانی؟ لە خوار تەپە ڕەش.... لە بیرم چوو.. تۆ بڵێ ناوی چیە؟

– پایین ... ئەو شوێنەی کە دەچوون گەزیان لێ دەبڕی بۆ سوتاندن.

– ها.... ڕاست دەکەی.. وەڵڵا تۆ شارەزای... مێگەلی حاجی تاغی لە وێ

دەلەوەڕان. ٢٥ حوشتری حاجی تاغی تەواوی ساڵ لە ڕێگا دابوون. ١٢حوشتر گەنمیان بۆ ئاش دەبرد و ١٣ حوشتر ئاردیان دەهێناوە. شوانێکی عەجەمی هەبوو، ماڵی لە قزقەڵا بوو. عەجەم مرد. کۆشێک منداڵی هەبوو. حاجی تاغی لە خورخورە دوو عارەبەی ئارد و دانەوێڵە و ڕۆن و خواردەمەنی بار کرد و خۆی بە سواری وەپێشیان کەوت و بردی بۆ منداڵەکانی شوانەکەی. دەزانی عارەبە چیە ؟

- سەگی سەگباب چۆن نازانم عارەبە چیە. لای خۆی سەر دەمێک جوتبەندە بووم و کەڵ و عارەبەم هەبوو.

- منداڵەکانی ئەو شوانە هەتا گەورە بوون هەر حاجی تاغی بە خێوی کردن. ئێستا گەورە بوون، لە عەجەبشێر دەژین، هەر بە( بچەهای حاجی تاغی) دەناسرێن.

بێدەنگ دەبوو، دەچوو ڕادەکشا. حەجمینی نەبوو. دەهاتەوە لە پێش تەختەکەی من ڕادەوەستا.

- حاجیاغا عەجەمێک لە قزقەڵا دەژیا ناوی عەلیشا بوو. حتما نە می شناختی، بێگومان نەتدەباسی.

- پیاوی ناچار دەکرد سەگبابێکی پێ بڵێ. ئاخر من عەلیشای عەجەمی دز لە کوێ دەناسم، من لە کاتی خۆیدا عەلیشای زەمبیلم بیستبوو، بەڵام ئەو عەجەم نەبوو. ئەو شێخ بوو. وەک عەجەمی شەیاغی دزی نەدەکرد. ئەو لە ڕێگای خەلیفە و کۆلکە مەلاو نوشتە و خەرافاتەوە ڕەش و ڕووتی هەژاری کوردی دەڕووتاندەوە. بە ئاشکرا دزی و ڕێگری پێ نەدەکرا.

- حاجی تاغی بانگی عەلیشای کرد و گوتی واز لە دزی بێنە، چیت گەرەکە دەتدەمێ. دزی مەکە.

- ناتوانم حاجی. دزی نەکەم خەوم لێ ناکەوێ.

- تۆ دزی لە فەقیران دەکەی. ئەگەر توانیت دزی لە شوانەکانی من بکەی، هەر چەند مەڕی بیدزی بۆ خۆت.

حاجیاغا! شوانەکانی حاجی تاغی هەموو تفەنگیان پێ بوو. عەلیشا دەچێ ساردی پایز لە پایینی تەپە ڕەشی خۆ لە مێگەلێکی حاجی تاغی مات دەکا. هێندێ گۆشت لە گەڵ خۆی دەبا و دەیهاوێتە پێش سەگەکان. شوان لە پەنا

ئاگر خەویان لێ دەکەوێ. زارکی ئاغەڵ دەکاتەوە و مێگەل دێتە دەر وەدوای خۆی دەدا بۆ خوڕخوڕە کن حاجی تاغی. دەڵێ ئەوەتا ئەو مێگەلم دزیوە. حاجی تاغی مێگەلەکە دەدا بە عەلیشا و دەست لە دزی هەڵدەگرێ.

١٣ ڕۆژان لە پەنا من بوو. جگە لە منداڵەکانی خۆی سەگبابێک دەرگای لێ نەدەکردەوە. برادەرانی ئێمەش هەموو ڕۆژە ئێوارە و سبەی لای من بوون. عەجەم سەری سوڕ مابوو. هاتە سەر سەرم.

– حاجیاغا ! کورد هەموو پیاوی باشن. عەجەم هەموو سەگ و سەگبابن. من بابم موللا(مەلا) بوو. دەیگوت : عەرەب بە شەق ئیسلامیان لە ئێمە چەپاند. پاشان گوتیان ئێمە ئیمامان هەیە. بەوە فریویان داین. باوکم مەلایەکی باش بوو، دەیزانی درۆیە، مەلا هەموو درۆ دەکەن وەک خومەینی کە دەیگوت هەموو ئیرانیەک پوڵی نەوت وەر دەگرێ. خەڵکی ئێرانی کەر کرد تا بە دەستی خۆیان شایان لابرد. ئیمامیان هێنا، ئەویش ئەو هەموو خەڵکەی کوشت.

پاش ١٣ ڕۆژ لە دەست عەجەمی شەیاغی وله خەستەخانە دەرباز بووم. بیرەوەری خۆش و شیرینم لە گەڵ خۆ هێنانەوە ماڵێ و تامردنیش لە دایکی کەماڵ و کەماڵ و شلێر و کاک حەمەدەمین و هەموو برادەرانی کە لە خەستەخانە لێم خافڵ نەبوون و سەریان داوم و لە دوکتور و سێسترا جوان و میهرەبانەکان سوپاس دەکەم.

**سەفەر بۆ بولغارستان**

ڕۆژی ١٩٩٥/٩/٢٠چوومە سۆفیا بۆ ئەوەی ئەو کتێبەی بۆ چاپکردن ناردبووم بزانم چی بەسەر هاتوە. من لە سۆفیا بووم، کۆمکار بۆ بەشداری لە یادی ٣٠٠ ساڵەی حەزرەتی خانی نەمردا، داوەتنامەیەکی بۆ نارد بووم کە ٢١و٢٢ی ئوکتۆبر لە ئەڵمان بەڕێوە دەچوو، بە داخەوە لە بەر ئەوەی بۆ سەر دانی جەعفەری خوارزام دەچوومە تورکیا، شانازی بەشداری ئەو یادە پیرۆزەم بە نسیب نەبوو.

ڕۆژی ١٨ی ئوکتۆبر لە سۆفیاوە بەرە و تورکیا سواری ئوتوبوس بووم و لە تێرمیناڵی ئەستەمبوڵ لە ئوتوبوسی قەیسەریەم دەپرسی، لاوێکی ڕیشداری قوت گوتی: تە کرمانجی؟

ئەرێ. کرمانجم.
- ئەزیش کرمانجم.
دەستی کرد بە پرسیاران. کاتێ گوتم لە سویدەوە هاتووم و دەچمە قەیسەریە، پرسیارەکانی کردە سیاسی. لە چالاکی کوردەکانی سویدی دەپرسی. پاشان پرسیاری ئاپۆی دەکرد. هێندێ جنێوی بە چیلیری سەرۆک وەزیری تورکیا دا و لە گەڵم هات پاسی قەیسەریەی نیشان دام و بلیتی بۆ کڕیم و گوتی:
- ئەز لە ور دەبم. کاتی گەڕایەوە دەبێ میوانی من بی.
لە گەڵ سوپاس ماڵاواییم لێکرد و شەو درنگ گەیشتمە قەیسەریە. جەعفەری خوارزام ماوەیەکی زۆر بوو لە تورکیا مابۆوە و هەر چەند دەفتەری رێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان وەری گرتبوو، بەڵام دیار نەبوو بۆ کوێی دەنێرن. لە گەڵ کاک ئەحمەدی نەخشی و کاک محەممەدی مەحزوونی بانەیی لە تەرمیناڵی قەیسەریە چاوە ڕوانم بوون.
چووینە ماڵی جەعفەر و تا درنگی دوای نیوە شەو دانیشتین و لەو دانیشتنە خۆشانە بوو. کاک محەممەدی مەحزونی و کاک ئەحمەدی نەخشی لە توێی باسەکاندا هەر یەکەی شتێکیان گێڕایەوە کە هەر لەوێ لە دەفتەری یادداشتەکانمدا تۆمارم کردن.
کاک محەممەدی مەحزونی گوتی:« ئەکرەم بەگی ئەحمەدی کە ماوەیەک لە عیراق لە زیندانی بەعس دابوە گوتوویە: لە زیندانی ئەبو غرێب لە گەل لاوێکی کوردی ئێران لە ژوورێکدا زیندانی بوە. ڕۆژێک ناو و نیشانی یەکتریان پرسیوە. گوتوویەتی: من ئەحمەد تۆفیقم. دوای چەند ڕۆژ هاتوون بانگیان کردوە. گوتوویە: ئاگادار بە ئەوە دەمبەن ئیعدامم دەکەن.»
کاک ئەحمەدی نەخشی-یش لە قسەکانیدا گوتی :« دوای شۆڕشی گەلانی ئێران نیزیکەی ٢٠ کەس لە خەڵکی ناوچەی سەردەشت کۆ بووینەوە بچین لە تۆژەڵە سەری مام جەلال بدەین. گەلێکی بە خێر هێناین و قسە زۆر کران و مام جەلال گوتی: واز لە حیزبی دێموکرات بێنن. مەلا مستەفایەکی دیکە لە کوردستان ساز مەکەن. بچنە لای مەلا شێخ عیزەدین و پشتیوانی لێبکەن. دیکتاتۆر دروست مەکەن. ئێمە لەو قسانە واقمان وڕ ما. گەڕاینەوە و گوتمان

نەدایە و بە خڕی ڕەگەڵ حیزبی دیموکرات کەوتین.»

پاش بە سەر بردنی چەند ڕۆژی خۆش مانەوە لای جەعفەری خوارزام و منداڵەکانی و دەرباز بوون لە بەڵایەکی لابەلا گەڕامەوە بۆ بولغارستان. بەڵایەکەش ئەوە بوو: لە ستۆکهۆڵم لایەنگرانی پارتی کرێکارانی کوردستان بە نیشانەی هاودەردی لە گەڵ گیراوە سیاسیەکانی تورکیا مانیان گرتبوو. منیش چوو بوومە سەردانیان لە وێ ڕەسمی ئاپۆیان هەڵواسیبوو. من ڕەسمی مانگرتوەکانم گرتبوو، ڕەسمی ئاپۆشیان ڕەگەڵ کەوتبوو. لە قەیسەریە ڕەسمی منداڵەکانی جەعفەریشم گرت و فیلمەکەمان دا بە ڕەسامێک بیشواتەوە و چاپیان بکا. کابرا ڕەسمەکانی ئامادە کرد بوو، داینا بوون. کە وەرمان گرتەوە، جەعفەری خوارزام وەریگرت و ڕەسمەکانی لە پاکەت هێنا دەرێ و دەستی منی گرت و گوتی : خاڵە بابڕۆین. خێرابە. گوتم چیە؟ با سەیریان بکەین بزانین چۆنی چاپ کردوون.

– هەستە با بڕۆین. چاو لێکردنیان ناوێ . هاتینە دەر، گوتی خاڵە ئەوە ڕەسمی ئوجەلانە. کابرا نەیناسیوە، یا سەیری نەکردوە.، لێمان بگرن، نەجات بوون نیە. ئیتر نەیهێشت سەیریان بکەم. غاریدا ، دوور سندوقێکی زبڵی دیار بوو، ڕەسمەکانی دڕاند و هاویشتیە زبڵدانەوە و خێرا دوور کەوتینەوە.

لە بولغاریا بەرگی یەکەمی پێداچوونەوەم چاپکرد و بە پۆستەدا هێندێ کتێبم ناردنەوە سوید خۆشم گەڕامەوە.

٩٥/١١/١٨ لە کۆبوونەوەیەکدا بەشداریم کرد کە هێندێ لە کوردە پوڵدارەکانی سوید بە مەبەستی ساز کردنی ئەنستیتویێکی کوردی لە سوید سازیان کرد بوو. گەلێک کەسیان لە ڕووناکبیرانی کورد بۆ ڕەستورانێک داوەت کرد بوو بە میوانداریێکی تەواوەوە. وەک لە بیرم بێ چەند کەسیان هەر یەکەی بەڵێنی ٢٥ هەزار کرۆنیان دابوو کە بناغەی ئەنیستیتوییێکی کوردی کە بە( وەقف)یان ناو دەبرد، پێ دابمەزرێنن. باسێکی زۆر لە سەر پێکهاتنی ئەنستیتۆ و کتێبخانەی کوردی کرا، بیر و ڕای جۆر بەجۆر لەم بارەوە هاتنە گۆڕێ. بەڵام بەداخەوە وەک زۆربەی کۆبوونەوە و سێمینارە کوردییەکان لە گۆڕینەوەی قسە و دەر بڕینی بیر وڕا بەدەر، هیچی لێ شین نەبوو. دانیشتنەکە لە ئاخریدا بە قسەی خۆش و گۆرانی گوتن کۆتایی هات. سەعاتی چواری دوای نیوە شەو،

پۆلای نانوازادە، تەلیفونی بۆ سالحی برای کرد، هات من و کاک حەمەدەمینی سراجی گەیاندەوە مالێ.

١٩٩٥/١٢/٣١ کاک ئەحمەدی کاکە مەمی نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە سوید تەلیفونی کرد و گوتی:«.. کاک کەریم ماموستا مەلا عەولا لێرەیە و سبەینێ کۆبوونەوەیەکی خۆمانیی پێک دێنین و ئەوانەی بەشداری دەکەن پێیان ڕادەگەیێنین. بەم بۆنەوە داوا دەکەین جەنابیشت بەشداری بکەی.»

گوتم کاک ئەحمەد من ئەندامی حیزب نیم و لە کۆبوونەوەکانی حیزبی دێموکراتدا بەشداری ناکەم. نامیلکەیەکم لە وەلامی درۆ و بوختانی بێشەرمانە ی مەلا عەولادا نووسیوە و بۆ ئێوەشم ناردووە، لە کۆبوونەوەکەدا لە جیاتی بەشداری من ئەوی بخوێننەوە.

دوای نیو سەعات دیسان کاک ئەحمەد تەلیفونی کردەوە و گوتی: « کاک کەریم ببخشە. من بە هەلە چوو بووم. دەبوایە تەلیفون بۆ کاک کەریمی پورقوباد بکەم، بەلام لێم تێکچوو بوو.»

پێم شتێکی سەیر نەبوو، دەمزانی ڕاست ناکا. سیستمی لە قالبدراوی ئەم جۆرە حیزبایەتیە شتی ئاوای بە دواوەیە. پاش ئەوەی من جوابی« نا » م داوەتەوە، ئەمجار پێیان گوتوە، بچوو بلێ تۆمان بانگ نەکرد بوو، من بە هەلە حالی ببووم. ئەحمەدی کاکە مەمی کەسێک نیە بە هەلە حالی بێ و تێنەگا. من پێشتر خەبەرم هەبوو کە بە ئاسۆیان گوتبوو بە کەریمی پورقوباد بلێ بچێتە کۆبوونەوە. ئاسۆ خۆی بە منی گوتبوو کە بە کەریم پور قوبادم ڕاگەیاندوە. جارێکی دیکەش ئەوەم بۆ ڕوون بۆوە کە لە سیستمی لە قالبدراوی ئەم جۆرە حیزبانەدا کە ئاوی دێموکراسی و ئازادی فەردیان بە بەردا نەچوە، شەخسیەتی مرۆڤ چۆن تێک دەشکێ و بە خۆڕایی و بە ناچاری تووشی درۆ و تەنانەت سوکە ئارەقە کردنێکیش دەبێ. من گومانم نەبوو کاک ئەحمەد لە تەلیفونی دوایدا نارەحەت بوو، بەلام ئەندامی( حیزب) بوو، (حیزب) ئەمری پێکرد بوو، دەبوایە ئەنجامی بدات. دەبوایە بە شەرمەوە درۆ بکات. ئەدی ( سانترالیزمی دێموکراتی) مانای چیە ؟!!ئەو ڕۆژە چەند میوانم هەبوون، ئەوانیش لەو تەلیفوون و کارە حیزبیانە واقیان وڕ مابوو. ئەوەش نموونەیەکی ئەو ئەخلاقە

بوو کە دوکتور قاسملوی شەهید هێنابوویە نێو حیزبی دێموکرات. من ئەحمەدی کاکە مەم-یم دەناسی، ئەگەر ئەمری (حیزبی) نەبایە لە وانە نەبوو تووشی درۆیەکی وابێت کە لێی بێزار بوو. لە ماوەی ناسیاریمان و یا خۆ هاو خەباتیماندا پێکەوە دۆست بووین و نامەیەکی لە سەر بیرەوەرییەکانمی نووسیوە نیشانەی دۆستایەتیمان بوە. بەڵام چیبکات؟ ئەمری ( حیزبە) و هیچ نەدەکرا، بۆیە منیش هیچم لێ لە دڵ نەگرت.

**ساڵی ١٩٩٦**

ساڵی ١٩٩٥مان بە ڕێکرد، بێ ئەوەی هیچی خۆش و بە کەلک و پڕ بایەخی بۆ مەسەلەی کورد و ڕزگاری نەتەوەکەمانی لە گەڵ خۆ هێنا بێت. تەنیا خۆشیەکی لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٦ ماڵە پچکۆلەکەی ئێمەی داگرتبوو، بریتی بوو لە بەشداری خوارزاکانم لە دانیشتنی شەوی هەوەڵی ساڵ بە ماڵ و منداڵەوە. بە ڕاستی ماڵەکەمان هەرچەندە دوو هودە و متبەق بوو، بەڵام وەک گەورە ماڵێکی ڕیش سپی تایفەی لێهاتبوو. بە تایبەت زرەی تەلیفونی یەک دوو دۆستی خۆشەویست لە وڵاتەوە نیتر کەش و هەوایەکی خۆشتری بە شەوەکەمان بەخشیبوو. تۆ بڵێی هیچ شتێ لەوە خۆشتر بێ کە پاش نیزیکە ٢٠ ساڵ دۆستێک و تێکۆشەرێکی وەک کەریی خامچی لە وڵاتەوە تەلەفونت لێ بکا و لێت بپرسێ و داوای پێداچوونەوە و بیرەوەرییەکانت لێبکات. ؟

**چەند میوانی بە ڕێز**

٩٦/١/١٦ پروفیسور عیسمەت شەریف و دوکتور جەببار قادر کە بۆ دامەزراندنی ئەنستیتۆی کورد لە سوید هاتبوونە ستۆکهۆڵم. شەو شانازی میوانداریان دابوو بەمن ئەم ئەنستیتۆ ساز کردنەش لە ئوروپا بۆ کوردان وەک گەمەی لێهاتوە. ئەوەی لەبیرم بێ هەوەڵجار دوکتور کەمال فوئاد ئاکادێمی کوردی لە ئالمان دامەزراند، پاشان لە ستۆکهۆڵمیش شتێکیان بە ناوی ئەنستیتۆی کورد دامەزرانە. وەک بزانم لە بۆن و لە بەرلین و لە بەلژیکا ودیسان لە ستۆکهۆڵم و ڕەنگە لە شوێنی دیکەش وەک چاو لێکەری ئەنستیتۆی کورد دامەزرا بن و هیچیشیان بۆ کورد لێ پەیدا نەبووە. لەم دانیشتنەدا دوکتور جەمشید حەیدەری و کاروان سەعیدیش بەشدار بوون. شەومان بە قسەی خۆش و باسی سیاسی بردە سەر. دیارە

لە دانیشتنی ئەو تۆ دا کاتی لێو تەڕ کردن، قسەکان خۆشتر دەبن.... پرۆفیسۆر عیسمەت شەریف هێندێ قسەی سەیر و نەزانراوی لە سەر پەیوەندی مامۆستا برایم ئەحمد بە ئیسرائیلییەکانەوە بۆ باس کردین کە تا ئەو دەم نەمزانیبوون.

**یادی پەنجا ساڵەی کۆماری کوردستان لە تەلەڤیزیۆنی مەد دا**

ڕۆژی ٩٦/١/١٨ لە سەر داوەتی تەلەڤیزیۆنی ME D بۆ بەشداری لە یادی کۆماری کوردستان دەبوایە بچمە بروکسێل. سەعاتی شەشی ئێوارە لە گەڵ کاک نەجمەی غولامی و چوار برادەری دیکە کە ئەوانیش بۆ بەشداری لە یادی ساڵڕۆژی کۆماری کوردستان بانگ کرا بوون، سواری فڕۆکەیەکی قوڕازە بووین و بە سەعاتێک درنگترگەیشتینە بروکسەل. برادەرانی تەلەڤیزیۆن چاوە ڕوانمان بوون. شەو بردیانین بۆ ڤیلایەک کە میوانیان دەوێ دەکردن. وەک کاروانسەرایەکی شارەکانی کوردستان دەچووکە هەر کەس بۆ خۆی تەختێک و پێخەفێکی چەند کەس تێدا نوستووی وەبەر دەکەوت و سەری لێدەکردەوە. بەیانیش کە هەڵدەستا هەرکەس یا دەستەیک بۆ خۆی دەیتوانی نان وچایی ساز بکا. هێلکە و ڕۆن و نان و پەنیر و ماست و خەیار و تەماتەش چەندی بڵێی لە وێ ئامادە بوو. جگە لە وەش وەک بچیە هوتێل و یا کاروانسەرایەکی ئەستەمبوڵ، یەک وشەی کوردیت گوێ لێ نە دەبوو. تەنیا ئەگەر میوانی کوردی خواروو لە وێ بان، بە کوردی قسەیان دەکرد. ئەگینا برادەرانی سەر بە تەلەڤیزیۆن و پارتی کرێکارانی کوردستان و پارلمانی کوردستان بە زمانی تورکی خۆیان قسەیان دەکرد و کوردی و موردی لە گۆڕێدا نەبوو. لەو سەفەرەدا بوو، لە دەفتەری بروکسەل دانیشتبووین،برادەرانی بەر پرس لێیان پرسیم: « مامۆستا بیر و ڕای تۆ چیە، ئەم چبکەین؟ پێشنیارت چیە؟

ــ مەکتەبێکی تورکی دابنێین، بۆ ئەوەی ئێمەی کوردەکانی سۆران فێری تورکی بین.

ــ چوا ؟ حەنەک دەکەی .

ــ نا حەنەک ناکەم. ئێوە ئیشەڵادەبنە حکومەت و دەوڵەتی هەموو کوردستان دادەمەزرێنن، زمانی ڕەسمیش دیارە ئەو دەم تورکی دەبێ و ئێمەش مەجبورین نەشێ فێری بین. من ئەوە دوو ڕۆژە لێرەم، لە ڕۆژ باش زیاتر یەک وشەی کوردیم گوێ لێ نەبوو. هەموش کوردی دەزانن، بەڵام تورکیەکەتان پێ خۆشترە.

ئێوارەی ٩٦/١/٢٠ ئاهەنگی یادی ٥٠ساڵەی کۆماری کوردستان لە ساڵۆنێکی مەزنی بارەگای تەلەڤیزیۆنی MED بە سرودی میللی ئەی ڕەقیب، بە کەمە دەستکارییەکی بێ جێوە دەستپێکرا. یاشار کەیا سەرۆکی پارلمانی کوردستان لە دەرەوە، عەلی قازی، جەلیلی گادانی و عەبدوڵا نوجەلانیش بە تەلیفون هەر یەکەیان بە گوێرەی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆیان بە بۆنەی دامەزرانی کۆماری کوردستانەوە قسەیان کرد. مەلا عەولای حەسەنزادەش بە تەلیفون وەک سکرتێری حیزبی دێموکرات تۆزێ بە حیزبەکەی هەلا گوت و مێژووی نەتەوە و حیزبەکە و کۆماری کوردستانی بە پێلاوی مەلایانە پێشێل کرد و بێ ئەوەی تۆزێ لە ڕەوتی بە سەرهاتەکانی کوردستان و پێکهاتن و لە بەینچوونی ئەم ڕووداوە گرنگە ئاگادار بێ، کۆماری کوردستانی بە فتوایەکی مەلایانە کردە خود موختاری.

من بە درێژی بە پێچەوانەی فەرمایشتەکانی جەنابی مەلا بە گوێرەی ئەو سەنەد و بەڵگانەی کە سەربەخۆیی کۆماری کوردستان نیشان دەدەن، هەل و مەرج و گرنگیی پێکهاتنی کۆماری کوردستانم ڕوونکردەوە، بە جۆرێک کە سکرتێرێکی دیکەی بەشێکی تری حیزبی دێموکرات کە ( شۆڕشگێڕیشی) لێ زیاد کردبوو کاک جەلیلی گادانی لە وتاری خۆیدا گوتی:« هەموو قسەکانی کاک کەریم پشت ئەستور دەکەم».

کاک نەجمەی غولامی و هونەرمەندانی دیکە بە گۆرانی وموسیقای خۆش، ئاهەنگەکەیان ڕازاند بۆوە. شەو بردیانینەوە کاروانسەرای گۆرین. ڕۆژی دوایی نە دەبوایە سەفەر بکەم، چونکە دەیانویست لە سەر چەند مەسەلە بۆ تەلەڤیزیۆن وتوو وێژم لە گەڵ بکەن. تەواوی ڕۆژ بێکارم. باشبوولای باوە ز و دلێر و سیروان خۆم بە خوێندنەوەی ڕۆژنامان خەریک دەکەم. جێگای ڕاکشان و ئیستراحەتیش نیە. لە گەڵ سیروان و میرحەم بە قسە و باس ڕۆژ دەبەمە سەر. باوە ز و سیروان خەڵکی ناوچەی کەرکوکن. دوای ئەوە ی حکوومەتی بەعس لە کەرکوک دەری کردوون، لە چەمچەماڵ گیرساونەوە. پاشان هەر وەک هەموو ڕووناکبیر و نیشتمانپەروەرانی خوارووی کوردستان لە بەر بار و دۆخی داخداری شەڕی کورد کوژی ڕوویان کردۆتە ئورووپا و لە بەشی سۆرانی تەلەڤیزیۆنی MED کار دەکەن. لە سەر کارەکەیان زۆر چالاکن و باشی لێدەزانن. لە گەڵ میوانانی MED TV زۆر میهرەبانن.

سەعاتی ١٩ی ئێوارە دەچینە ستۆدیۆیەکی دیکە. پتر لە سەعاتێک سەبارەت بە هەل و مەرجی دامەزرانی کۆماری کوردستان و کار و دەستکەوتەکانی و هۆیەکانی

تێکچوونی و دەوری بارزانی نەمر، وەڵامی پرسیارەکانی سیروان دەدەمەوە. بە دوای سیرواندا، باوە ز لە سەر کۆنگرەی نەتەوەیی پرسیار دەکا و وەڵام وەر دەگرێتەوە. من کۆنگرەی نەتەوەییم بە بێ بەشداری هەموو حیزبە سەرەکییەکانی کوردستان پێ شتێکی فۆرمالیتەو بێ سەر ئەنجامە. نەمزانی داخوا دەقی وەڵامەکانی منیان بڵاوکردەوە یان نا. پاشان میرحەم لە سەر ڕۆژنامەگەریی کوردی پرسیار دەکا. سەعاتی ١٢ی شەو تەواو دەبین و دەمنێرنەوە بۆ ڤیلای گۆرین. ئەمجارە تەنیام. یەک کوردی سۆرانی لێ نیە. گوێم داوەتە تورکی و بێدەنگم. ڕۆژی ٩٦/١/٢٢ دەگەڕێمەوە بۆ ستۆکهۆلم.

**یادی پەنجا ساڵەی کۆماری کوردستان لە ڤالشۆپینگ**

٩٦/١/٢٦ لە سەر داوەتی کۆمەڵەی کوردی لە شاری ڤالشۆپینگ بۆ سێمینارێک لە سەر کۆماری کوردستان بەرە و ئەو شارە کەوتمەڕێ. هاوڕێ عەزیز محەممەد و مەهاباد قەرەداغی شاعیر و برادەرێکی دیکە بەناوی کاک ئەحمەد لە ئیزگەی قەتار چاوە ڕوان بوون. جگە لە نرخی سەفەرەکە و خۆشی دیداری هاو نیشتمانان، زەحمەتی پێشوازی کاک عەزیز محەممەد بۆ من جێگای شانازی بوو. لە ئیزگەی قەتارەوە یەکسەر چووینەماڵی کاک عەزیز. لام وایە بڵێم ماڵی دایکی فێنک تەعبیرێکی ڕاستتر بێ. چونکە کاک عەزیزیش لای دایکی فێنک هەر میوان بوو. گەمەی دە ورانە و هیچی لە گەڵ ناکرێ. خودای گەورە هەر خۆی دەزانێ چەند جوان کارەکان ڕێک دەخا و دەیان ڕەنگێنێ.! بە قەولی مەلایەکی باڵەکی کە دەیگوت: « خودای تەعالا کاری وا دەکات ئەزی لێ خەجاڵەتم »

ڕۆژی دوایی بە گوێرەی بەرنامەی دارێژراو، سەعاتی ٣ی دوای نیوە ڕۆ بە بەشداری زۆربەی زۆری کوردەکانی دانیشتووی ئەو شارە سێمینارەکە دەست پێکرا. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو لە وەتا لە ئورووپام، بۆ هەوەڵینجارە ببینم کۆبوونەوەی کوردەکان ڕاست لە کات و سەعاتی دیاریکراودا دەست بەکار بکا. باسێکی چڕ و بە کەڵک لە سەر کۆماری کوردستان دەست پێکرا. زۆربەی برادەرانی ئامادە لەوێ، بە پرسیار و موناقەشەی بابەتی بەشداریان لە باسەکەدا کرد.

میوانداریی ڕێزدار مەهاباد قەرەداغی و کاک مستەفا ئەم یەک دوو شەوە فەرامۆش ناکرێ. ڕۆژی دوایی کاک فەهمی کاکەیی بە پیتزایەکی خۆماڵی کە خۆی

دروستی کرد بوو داوەتی کردین کە تام و چێژی تایبەتی هەبوو. جگە لە نووسینەکانی شیرینی کاک فەهمی و شێوەی جوانی دەرسگوتنەوەی بە زارۆکان، دوو کاری فرە گرنگی کاک فەهمی سەرنج ڕاکێش بوون و لە بیر ناکرێن.

یەکەم شانازخانی خێزانی لە کرمانجی کوردەکانی سووریاوە فێری سۆرانی کردوە. بە لەفزێکی ئەوە ندە شیرین و پاراو کوردی دەگوت، هەر خۆش بوو بیدوێنی و بە سۆرانی وەڵامت بداتەوە. خۆ ئەگەر شاعیر و نووسەر و مامۆستاکانی خوارووی کوردستان هەر یەکەی خانمێکی کرمانج ئاوا فێری سۆرانی بکا، زمانەکەمان بەرەو یەکێتی و ساخ بوونەوە هەنگاو دەنێ.

دووەم شێوەی داهێنانی کاک فەهمی بۆ دەرسی زارۆکان. ئەو ڕەسمی شتی جۆر بە جۆری بە زارۆکان نیشان دەدا، منداڵ لە ڕووی ڕەسمەکە وە پیتەکان دەناسێ و بە کوردی ناوەکەی دەڵێتەوە ولە بەری دەکات.

ئەو سەفەرە خۆشە ڕۆژی ١/٢٩ بە زەحمەتی بەرێکردنی کاک عەزیز و خوشکە مەهاباد قەرەداغی، بە دنیایەک بیرەوەری خۆش و لە بیر نەکراو کۆتایی هات و گەڕامەوە بۆ ستۆکهۆڵم.

٩٦/٢/٥ ڕێزدار مامۆستا عەبدولعەزیز تەیب ئوستانداری دهۆک لە سەفەری ئەمریکا دەگەڕایەوە لە گەڵ چەند کەس لە برادەرانی هاتە سەر دانم. یەک دوو سەعات بە باسی سەفەرەکەی و بارودۆخی کوردستان و پێڕاگەیاندنی سڵاوی کاک مەسعود بارزانی شادی کردم.

٩٦/٢/١١ لە سەر داوەتی کۆمەڵەی کوردستانی شاری نیکلیستونا بۆ سێمینارێک لە سەر کۆماری کوردستان ١٩٤٦ چوومە ئەو شارە. برادەرانی کۆمەڵە پێشتر ڕۆژ وکاتی سێمینارەکیان بە شاردا بڵاویان کرد بۆوە و زۆرکەس بەشداریان کرد بوو. من بە گوێرەی زانیاری و بۆ چوونی خۆم، هەل و مەرجی دامەزرانی کۆماری کوردستان و دەستکەوت و کەم و کورییەکان و بار و دۆخی نێو دەوڵەتی و هۆیەکانی تێکچوونم باس کرد. کۆبوونەوەکە بە باس و پرس و بەرسیڤ و موناقەشەی دۆستانە کۆتایی هات. ئێوارێ لە ماڵی باوکی تارا بە قسەی خۆش و میوانداریەکی کوردانە شەومان بردە سەر.

شەوی ٩٦/٢/١٤ بۆ ئێمە شەوێکی خۆش و بەڵام هەر لەو کاتەشدا ناخۆشی بەدواوە بوو.

خۆشیی وشادمانییەکە لەوە دا بوو بە بۆنەی گەڕانەوەی کاک عەزیز محەمەدی بەڕێز شانازی میوانداریی کاک عەزیز و باوکی سەر بازمان بە نصیب ببوو. کاک حەمەدەمینی سیراجی و ڕوناک خانی خێزانی و هونەرمەندانی خۆشە ویست مەرزیە و ناسری ڕەزازی و کاک فەهد گەردەوانی و کاک خۆشناو-یش بەشداری ئەم دانیشتنە بوون. دانیشتنەکەمان بە چەند گۆرانی خۆمانەی بێ موسیقای ناسر و مەرزیەی بە ڕێز گوڵباران دەکرا.

بەڵام ناخۆشیەکەی بۆ ئێمە قورس بوو. چونکە کاک عەزیز سەرەڕای ئەوە کە بارودۆخی سلامەتی تەواو نەبوو، بە تەنیا سەفەری دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ کوردستان. بە ڕاستی تا خەبەری گەیشتنەوەی بە ساخ و سلامەتیمان پێگەیشت، هەر لە دڵە ڕاوکەدا بووین.

٩٦/٢/١٧پارتی کرێکارانی کوردستان کۆبوونەوەیەکی بۆ هێندێ ڕووناکبیری کوردی دانیشتووی سویدی پێکهێنا و کۆمەڵێک لە نووسەر و ڕوناکبیری هەموو بەشەکانی کوردستانی داوەت کردبوو. برادەرێکیان بە ناوی سینا پتر لە سەعاتێک بێ ئەوەی نۆرەی کەس بدا قسەی کرد. ئەو برادەرە وەک بۆ کۆمەڵێکی نەخوێندەواری گوندێکی دواکەوتوو تەبلیغات بکا قسەی دەکرد. لەبەر ئەوەی هیچی لێ تێ نەدەگەیشتم و بەو جۆرە تەبلیغاتەش گوێم پڕ ببوو، بەر لەوەی کۆبوونەوە تەواو بێت، وەدەر کەوتم. کاک حەمەدەمینی سیراجی باسێکی بابەتی لە گەڵ دامەزراند بوو، من بە جێم هێشت و نازانم بە کوێ گەیشت.

٩٦/٣/١٦ کاک حەمەدەمینی سیراجی خەبەری داخداری مردنی حەسەنی باباتاهیری بە تەلیفون پێراگەیاندم و گوتی: سەرەخۆشیان بۆ داناوە. پێشتر لەم ڕووداوە ئاگادار نەبووم وادەیەکی دیکەم هەبوو دەبوایە بچم و بەداخەوە نەمتوانی بچمە پرسەی کاک حەسەنی بابا تاهری و نەشم زانی کێ پرسەی بۆ داناوە. کۆچی دوایی کاک حەسەنی بابا تاهیری بەلای منەوە خەسارێکی گەورە بوو. ڕەنگە کاک حەسەن لای خەڵک بە مرۆڤێکی ئاسایی ناسرابێ و تەنیا حیسابی سابلاغی گەری بۆ کرا بێ کە نەخۆشییەکی تەشەنە داری بێتامە. بەڵام مرۆڤی ئازا و نیشتمانپەروە کاتی ترس و تەنگانە لە خەڵکی تر جیا دەکرێنەوە و کاک حەسەنی باباتاهیری بەو خەسڵەتانە لە گەڵ خەڵکیتر فەرقی

هەبوو.

من پێش ڕۆیشتنم لە کوردستان ساڵی ١٩٥٨کاک حەسەنم وەک قوتابیەکی دەبیرستان دەناسی و بە گوێرەی بار و دۆخی خەباتی ئەو دەمی جار و بار سلاوێکی دۆستانەمان لێک دەکرد. کاتێکی ساڵی ١٩٧٩ گەڕامەوە کوردستان، کاک حەسەنی بابا تاهیری فەرمانداری مەهاباد بوو. بەلام فەرقی نەکرد بوو. ئەمجارە لێک نیزیکتر بووین. هەلوێستێکی کوردانەی نیشتمانپەروەرانەی هەبوو. لە ڕووداوەکانی کوردستاندا هەمیشە بەرە و پشتیوانی لە داوا و مافی ڕەوای کورد هەلوێستی دەگرت. هەوڵی دەدا ئاسایشی شار بپارێزێ. ئازایەتی و کوردایەتی کاک حەسەنی بابا تاهیری لە کێشەی شەڕی نەغەدەدا خۆی نواند. لە کومیسیۆنی ئاشتی شەڕی نەغەدە لە ورمێ، لە بەرانبەر ئوستاندار و فەرماندەی لەشکردا هەلوێستی گرت و ئازایانە بەرپەرچی قسە و بۆچوونی ئوستانداری دایەوە. کاتێ ئوستاندار گوتی: تۆ مەئموری دەولەتی، وەزیفەت نیە ئاوا هەلوێست بگری؛ لە وەلامدا گوتی: من خزمەتکاری میللەتی خۆمم. ئەگەر دەفەرمووی هەر ئیستا ئیستیعفا دەنووسم، بەلام ناتوانم لە فەرمایشتە ناهەقەکانی ئێوە بەرگری بکەم. لەو کۆ بوونەوەدا ا تەنیا کاک حەسەنی بابا تاهیری بوو کە پشتی وتار و بۆچوونەکانی منی دەگرت. ئەو دەم ئازایەتی و نیشتمانپەروەری کاک حەسەنی بابا تاهیریم زیاتر بۆ دەر کەوت کە لام وایە خەڵک ئاوایان نەناسیبوو. پاش سارد بوونەوەی کێشەی نەغەدە ڕۆژێک تەلەفونی کرد و گوتی:« قەولێکم پێبدە تا شتێکت پێ بڵێم. قەولم پێدا بێ ئەوەی بزانم چیم پێ دەڵێ: گوتی : سبەینێ لە سەعاتی دەی بەیانیەوە دەچینە ماڵی عەزیزی حسامی. هەتا وەدەر دەکەوین، جگە لە تەختە و قسەی سەیر و خۆش، یەک وشە باسی سیاسەت ناکەین. با ڕۆژێک مێشکمان بحەسێتەوە.» بڕیارەکەمان بردە سەر و لە میوانداری دۆستانە و کوردانەی کاک عەزیزی حسامی کۆنە دۆستی خۆم، چێژمان وەر گرت. جێگای داخ بوو نەمتوانی لە پرسەی ئەم ڕۆڵە نیشتمانپەروەر و ئەم دۆستە خۆشەویستە دا بەشداری بکەم و بە یەک دوو وشە لە بارەی ئازایەتی و نیشتمانپەروەری ئەو لە دوورەوە مالاوایی لێبکەم.

**سەفەر بۆ بولغارستان**

٩٦/٤/١٧ بۆ چاپکردنی بەرگی ١٠ی بیرەوەرییەکانم چوومە بولغارستان. لە بولغارستانیش وەک ستۆکهۆڵم هەموو ڕۆژێ گوێم بۆ بەشی کوردی ڕادیۆی دەنگی ئەمریکاڕادەگرت. ڕۆژێک بەبۆنەی ١٠ساڵای کۆچی دوایی شاعیری میللی و ناوداری کورد ماموستا هێمن قسەکانی کاک ئاوات عەلیاری نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی بڵاو کردەوە کە تۆزی سەرنج ڕاکێش بوو. ڕۆژی ٩٦/٤/٢٣) ئەم نامەیەی خوارەوەم بۆ بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا نوو سی، بەڵام کارگێرانی بەشی کوردی نە بڵاویان کردەوەو نەوڵامێکیان دامەوە. ئەمەش دەقی نامەکەیە.

«.... تێکۆشەرانی بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا!

لە گەڵ سلاو، خۆشیتان و سەرکەوتنتان لە پاراستنی شێوەی دێموکراسی بەرنامەکانی ڕادیۆدا بە ئاوات دەخوازم. داوا کارم ئەم کورتە نووسراوەی منیش لە چوار چێوەی باسی شاعیری ناوداری کورد « هێمن» دا بڵاو بکەنەوە.

ڕوونکردنەوەو یا نووسراوەی کاک ئاوات عەلیاری بە ڕێزم سەبارەت بە باس لە یادی ١٠سالی کۆچی دوایی هێمن بیست. لە پێشدا ئەگەر ئەو بۆ چوونەی کاک ئاوات بۆ چوونی حیزبی دێموکرات بێ، جێگای دڵخۆشیە کە حیزبی دێموکرات گەیشتبێتە ئەم بۆ چوونە کە کاک ئاوات لە بارەی هێمنەوە باسی کرد. بەڵام تۆزێ ورد بوونەوە لە نێوەرۆکی قسەکانی کاک ئاوات مرۆڤ دەخاتە گومانەوە، لە بەر دوو تێبینی :

یەکەم: کاک ئاوات دەڵێ: « نەزەری حیزبی ئێمە لە بارەی هێمنەوە هەر ئەوەیە کە دوکتور قاسملو لە پێشەکی تاریک و ڕووندا نووسیویەتی.» دیارە ئەو دەمەی کە ماموستا هێمن ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزب و خۆشەویستی بێهاوتای هەموو کوردستانی خواروو بوو، قاسملوو زۆر لەوە باشتری لە سەر هێمن دەنووسی. بەڵام کاک ئاوات ئەم بەیاننامە دزێوە بە ژێر لیچەوە دەکات کە بە ناهەق و نارەوا بە خەتی ماموستا مەلا عەوڵاو ڕێنوێنی دوکتور قاسملو و بە ئیمزای دەفتەری سیاسی، هێمن بە جاش ناو دەبات. ڕەنگە لەوەش ئاگادار نەبێ کە کەریمی حسامی وەک بەر پرسی تەشکیلاتی مەهاباد، دوای جیا بوونەوەی تاقمی ٧ کەسە لە دۆڵی شێخان لە گەڵ برادەرانی تەشکیلات چوە

دەفتەری سیاسی و لە سەر وشەی جاش بۆ هێمن و غەنی بلوریان لە گەڵ دوکتور قاسملو و مەلا عەولا تووشی دمبەدمەی توند بوو. من لە نووسینی وشەی جاش لە بەیاننامەکەدا رەخنەم گرت و ئەوانیش دەیانگوت جاشن. بە پێچەوانەی بۆ چوونی دەفتەری سیاسی، تەشکیلاتی مەهاباد کارەکەی ئەوانی مەحکووم کرد، بەڵام بە جاشی ناو نە بردن. با کاک ئاوات بەرگی ٧ی بیرەوەرییەکانی کەریمی حسامی بخوێنێتەوە.

ئێستا ئەگەر ئەو بۆچوونە تازەی کاک ئاوات بۆ چوونی حیزب بێ، هەڵوێستێکی باشە، بەڵام حیزبی دێموکرات بەم ڕوونکردنەوەی کاک ئاوات ناتوانێ پاکانە بۆ گرتنی هێمن و ئاوارە کردنی و بە جاش ناو بردنی بکات. دەبێ غیرەتی ئەوەی هەبێ لە گیانی پاکی هێمن و لە خەڵکی کورد کە هێمن دەپەرستن داوای لێبوردن بکەن.

دووەم : گومانەکە ئەوە دەم بە هێزتر دەبێ کە مرۆڤ گوێی لە پلارو پەلاماری کاک ئاوات دەبێ بۆ سەر ئەو شاعیر و کەسانەی کە لە سەر هێمن و کردەوەی حیزبی دێموکرات لە گەڵ هێمن قسەیان کردوە. لام وایە ئیتر ئەم جۆرە ئاخافتن و بوختان و لاتاوانە باویان نەماوە. بە تایبەت کاک ئاوات ئێستا لە ئەمریکا دەژی. بوختان و لاتاوی ( داخ لەدڵی و نەزانی و چوونە ئامێزی دوژمن و ئەم جۆرە قسانە..) کۆن بوون و تەنیا لە ژێر لولەی تفەنگی پێشمەرگە و لە کن ڕێبەرانی حیزبی دێموکرات دا دەگوتران. کاک ئاوات باش دەزانێ، چوونە ئامێزی دوژمن و پاڵ دان بە دوژمنەوە بە باڵای ڕێبەرانی کورد براوە و باسکردنی ئیتر باوی نەماوە. ڕێز گرتن لە دێموکراسی کە کاک ئاوات باسی دەکا، ئیتر نابێ ئەم جۆرە بەیت و باوە سواو و کۆنانەی بە دواوە بێت.

نووسینەکەم درێژ بوو. بەڵام باسەکە لە ڕادیۆی ئێوەدا هاتۆتە گۆڕێ و منیش وەک کەسێکی نێو جەرگەی ئەم باسە بە پێویستم زانی بەشداری بکەم. خۆشیتان. براتان کەریمی حسامی. ٩٦/٤/٢٣

من ئێستا لە بولغاریاوە ئەو نامەتان بۆ دەنووسم. بەڵام ئادرێسم لە سوید ئاوایە:

P.box, 70 66 164 07 kista, sweden. tel : 08 752 99 05

لە سۆفیا هەموو بەرگەکانی بیرەوەرییەکان و بەرگی یێەکەمی پێداچوونەوەم بە کتێبخانەی میللی بولغارستان پێشکێش کرد. دیریکتۆری کتێبخانەی ناو براو نامەیەکی سوپاس و پێزانینی بۆ نارد بووم کە وا بولغارییەکەی ئەو نامەیە لە پاشکۆدا بلاو دەکەمەوە.

**داوەتێکی حیزبییانە**

ڕۆژی ٩٦/٦/١٩ گەڕامەوە بۆ ستۆکهۆلم. فاکسێکی سەیرم لە لایەن ڕێکخراوی پارتی دیموکراتی کوردستان- عیراق- وە پێگەیشت. دەقی فاکسەکە بەمجۆرەیە: ( زمانەکەی دەسکاری نەکراوە)

«... بۆ بە ڕێز کاک کەریمی حسامی. سلاو و ڕێز - وەزارەتی ڕوشنبیری هەڵەستێ بە یاد کردنەوەی(٣٠٠) سێ سەد ساڵ تێپەڕ بوون بە سەر داستانی « مەم و زین» شاعیر و فەیلەسوفی گەورەی کورد « احمدی خانی) لە ڕۆژانی(٢٠-٦/٢٢) فیستیڤاڵێک بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کراوە لە دهۆک، ئەوەی شایانی باسە دەعومت نامە بێ گوێ دانە هەڵویست و پەیوەندی سیاسی بۆ ڕوشنبیران و نووسەرانی کورد چوە.

بە ڕێزیشتان لە لایەن لیژنەی بەرزی فیستیڤاڵەکەوە دەعومت کراون بۆ ئەم یادە بەرزە، هیواداریین بە ئامادە بوونتان یادەکە دەوڵەمەند و سەر کەوت بکەن.

تێبینی :

- خەرجی هاتو چۆ لە سەر بەڕێزتانە
- لیژنەی فیستیڤاڵەکە خەرجی میوانداریتان نەخاتە ئەستۆی خۆی

تکایە بۆ زیاتر زانیاری پەیوەندی بەم تەلفون و فاکسەی خوارەوە بکەن لە لەندەن.........

جگە لەوە کە ئەم فاکسەی ڕێکخراوی پارتی پتر لە دێڕەکانی هەڵەی زەقی ڕێزمانی کوردی تێدابوو، ئیتر بۆ ئەوەی ( خەرجی میوانداری) نە کەوێتە سەر ئەستۆی ئەم وەزارەتە ڕۆشنبیریە بێ پارە و فەقیر و بێ داهاتە و تووشی ئەو خەرجە گەورەیە نەبێ کە لە دهۆک مرۆڤ بە نان و ماستیش ڕۆژ دەباتە سەر و پارەی زۆری ئەم ( خەرجە میوانداریيە) بۆ کاری گرنگی (حیزبی و سیاسی) سەرف بکەن، ئیتر نە پەیوەندیم پێوە گرتن و نە ئامادەی (فیستیڤاڵە) کەش بووم.

له ماڵەوە خەریکی ئامادە کردنی بەرگی دووەمی پێداچوونەوە بووم.

**داوەتێکی دۆستانە**

ماوەیەک درەنگتر ئەم داوەتنامەی لیژنەی باڵای یۆبیلی زێرینی پارتی دیموکراتی کوردستان- م پێگەیشت کە ١٩٩٦/٦/٢٣ نوو سرا بوو :

پارتی دیموکراتی کوردستان - یەکگرتوو. مەکتەبی سیاسی . لیژنەی باڵای یۆبیلی زێرین.

بۆ کاک کەریمی حسامی بە ڕێز. سڵاوێکی گەرم.

بە بۆنەی یۆبیلی زێرینی(یادی پەنجا ساڵە)ی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان خۆشحاڵین داوا لە بەڕێزتان بکەین بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگەکانی ئەم بۆنە پیرۆزە کە لە ڕۆژانی ١٠/١٦ی ئابی داهاتوو بەڕێوە دەچێت کە ڕۆژی بیرەوەری دامەزراندنی پارتیمانە. لەم بارەیە هەر دوو لقی ئەوروپا و ئەمریکای پارتیمان هەر یەکە بە پێی کاری خۆی هەڵدەستێت بە جێ بەجێ کردن و دابینکردنی پێداویستیەکانی هاتنتان بۆ کوردستان. لە گەڵ ئەو پەڕی ڕێزماندا... لیژنەی باڵای یۆبیلی زێرینی پارتی دیموکراتی کوردستان ، ١٩٩٦/٦/٢٣

بە خۆشییەوە چاوە ڕوانی کاتی سەفەر و ڕۆیشتن بۆ کوردستان بووم. داوەتەکە بۆ بەشداری لە ئاهەنگی پەنجا ساڵەی پارتی جگە لەوەی مەغزای خۆی هەبوو، چوونەوەی کوردستان و چاو پێکەوتنی دۆست و برادەری خۆشەویستیش نیعمەتێک بوو کە بە ڕاستی بە ئاواتی بووم. بەڵام جاری واش هەیە شتێکی لابەلات لێ پەیدا دەبێ و ڕیسەکەت لێ دەبێتەوە خوری. وەک لە سەفەری من پەیدا بوو و نیعمەتەکە بۆوە بە زەحمەت.

مامۆستا مەلا محەممەد ساڵحی ئیبراهیمی( شەپۆل)بۆ سەردانی کوڕەکانی هاتبوە ستۆکهۆڵم. بەڵام هەر سەردانی کوڕەکان نەبوو، بەڵکوو بۆ دۆست و برادەرانیشی سەفەرەکەی شادی هێنەر بوو. بە تایبەت بۆ من وەک بەتایبەتی بۆ سەردانی من هاتبێ ئەوەندە بە دیداری شاد بووم.

١٧/٧/٩٩٦ مامۆستا برا چوکەی خۆی بە سەر کردەوە و لە ماڵێ دانیشتبووین باسی دەرد و داخی کوردمان دەکرد و باسی سمایلاغای

سمکۆش هاتە گۆڕێ. مامۆستا فەرمووی: « مەلا ئەحمەدی تورجانی زادە لە قەولی مەلا محەممەدی کاکی کە سەر نووسەری ڕۆژنامەی« کورد » بوە لە ورمێ بۆی گێڕاوەتەوە:« سمکۆ خەبەری داوە کە ڕۆژنامە دەرچوو، چەند ژمارەیەک بۆ چاریە بنێرن. ئەویش بە مەلا ئەحمەد دا چەند دانە لە ژمارە یەکی ڕۆژنامەی (کورد)ی بۆ دەنێرێ. ئێوارە دەگاتە وێ و سمکۆ بە خێر هاتنی دەکات. سمکۆ عادەتی وا بوە کە بەیانان قاوڵتی لە ژووری خواردوە و نە هاتۆتە کن میوانان، بەڵام ئەو ڕۆژە بەیانی هاتۆتە دیوەخان و لە گەڵ میوانان کە پڕبوە لە ئاغاو سەرۆک عەشیرەتی کورد قاوڵتی کردوە و پاشان بە مەلا ئەحمەدی گوتوە؛ کوا ڕۆژنامەکان بێنە هەر کەسەی دانەیەکی لە پێش دابنێ. پێدا هاتوە هەریەکەی ڕۆژنامەیەکی لە پێش داناون، دانەیەکیشی لە پێش سمایلاغا داناوە. سمکۆ لیرەیەکی هاویشتۆتە سەر ڕۆژنامەکە و بە وانی دیکەشی گوتوە هەر کەس لیرەیەک لە سەر ڕۆژنامەکە دابنێ. پاشان گوتوویە ئەوە بۆیە نیە خەرجی چاپی ڕۆژنامەکە دابین بکات، بە ڵکو لە بەر ئەوەیە ڕۆژنامەیەکی لەم هەل و مەرجە دا بە زمانی کوردی دەر بچێ، دەبێ بە زێڕ بقەبڵێندرێت.»

**هێرشی پاسدارانی ئێرانی بۆ سەر بنکەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە دەڤەری کۆیە.**

۹٦/۷/۲۸ ڕێکخراوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە سوید ئەم بەیاننامەی خوارەوەی بۆ فاکس کردم

«.... ڕاگەیەندراوی دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

هاو نیشتمانە بە ڕێزەکان !

خەڵکی بە شەڕەفی کوردستان !

ئازادیخوازانی سەرانسەری جیهان !

هەر وەک چاوەڕوان دەکرا و پێشتریش هۆشدارمان دابوو، ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی پیلانی خائینانەی خۆی بۆ لێدانی بنکەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و بنە ماڵەی کوردە ئاوارەکانی کوردستانی ئێران و پێشێل کردنی حورمەتی خاکی وڵاتێکی دراوسێی دەست پێکرد.

شەوی ٥ لە سەر ٦ی گەلاوێژی ۱۳۷٥ ڕێکەوتی ۲٦ لە سەر ۲۷ی ژوئیەی

١٩٩٦ هێزێکی چەند هەزار کەسیی سوپای پاسدارانی ئێران بە هەموو جۆرە چەکێکی قورس وەک تۆپخانە، کاتیوشا و تانگەوە لە سنووری مەریوانەوە هاتە نێو خاکی کوردستانی عیراق و هەر ئەو شەوە گەیشتە سولەیمانی و لە« معسکر السلام » جێ گیر بوو. کەمتر لە ٢٤ سەعات دوای گەیشتنی، بەرەو ناوچەی کۆیە کە بنکەی دەفتەری سیاسیی لێیە، وەرێکەوت و شەوی ٢٨ی ژوئیە لە زۆر نوختەی ستراتێژیی دەور و بەری کۆیە دامەزرا.

هێزە پەلامار دەرەکان لە سەعاتی ٦/٥ی بەیانی ئەمڕۆ ٢٨ی ژوئیەوە بە خەستی تۆپ بارانی بنکەکانی حیزب و ئۆردوگای کوردە ئاوارە ئێرانییەکانی دەست پێکردوە کە تا ئێستا بەر دەوامە و لە سەعات ١٠ی ئەم بەیانییەشەوە پەلاماری زەمینی دەست پێکردوە و ئێستا شەڕێکی قورس لە نێوان پاسدارانی کۆنە پەرستیی ئێران و پێشمەرگەکانی حیزب بەر دەوامە.

ئێمە لە کاتێکدا ئەو پەلامارە دڕندانەیە ئاشکرا دەکەین، لە هەموو هاو نیشتمانان، لە تێکڕای حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان و لە گشت کۆڕو کۆمەڵە نێو نەتەوەییەکان داوا دەکەین، بە هەر ڕێگایەکدا بۆیان دەکرێ بۆ ڕاگرتنی هێرشی ڕێژیمی ئێران تێبکۆشن و نە هێڵن ئەو تاوانە دژی ئینسانییەی بە سەردا تێپەڕێ.

دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.
١٣٧٥/٥/٧(١٩٩٦/٧/٢٨)

خەبەرێکی دڵتەزێن و تەکاندەر بوو. هەر چەندە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ پینە کردنی وابەستەگییەی خۆی بە ڕێژیمی کورد کوژی ئێرانەوە هێندێ نووسراوەی بڵاو کردنەوە، بەڵام هیچیان نەیاندەتوانی ئەم پەڵە ڕەشە لە داوێنی یەکێتی نیشتمانی بسڕنەوە.

بە دوای بڵاو بوونەوەی بەیاننامەی حیزبی دێموکرات دا، کۆمەڵێک ڕوناکبیر و نیشتمانپەروەری کورد لە سوید کۆ بوونەوەیەکمان پێکهێنا و ئەم نووسراوەی خوارەوەمان ئامادە کرد و نیزیکە ٥٠٠ ئیمزا و دەنگی پشتیوانی و مەحکوم کردنی ئەو پەلامارە دڕندانەیە کۆ کرایەوە لە ڕادیۆ کوردییەکانی لۆکاڵ لە ستۆکهۆڵم خوێنرایەوە.

ئەمەش دەقی نووسراوەکەیە:

بە پێی هەواڵەکانی وڵات و دەرەوەی وڵات، لەم دواییانە دا هێزەکانی دەوڵەتی ئێرانی داگیرکەر، سنووری باشووری کوردستانیان بەزاندوە و لە ناوچەکانی بندەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە گەیشتوونەتە سولەیمانی و لە وێشەوە چوونەتە کۆیە. لە ئەنجامدا سەر لە بەیانیی ڕۆژی ١٩٩٦/٧/٢٨ پەلاماری بنکەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان و ئۆردوگای پەنابەرانی کوردی ئێرانیان داوە و ژمارەیەک لە تێکۆشەران و هاو وڵاتیان کوژراو و بریندار و دەر بەدەر کراون.

هێنانی سوپای پاسداران، بە کۆڵی لێپرسراوانی ناوچەکە، بۆ لێدانی حیزبی دێموکرات لە قوڵایی باشووری کوردستاندا، خەیانەتێکی نەتەوایەتی و بێ وێنەیە. ئەم دڕندایەتییەی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەو تیرۆرو کوشتارو فشارەی کە لە ماوەی دوو ساڵی شەڕی ناو خۆیی لە باشووڕ دا دژی حیزبی دێموکرات و هێزە سیاسییەکانی تری ڕۆژهەڵات و پەنابەرانی کوردی ئێران ئەنجام دراون، گەیاند بە لوتکە. شەڕی ناوخۆیی تەنیا پرۆسەکەی باشووری کوردستانی تێک نەشکاندو بەس، بەڵکوو زەبری لە پارچەکانی تری وڵاتەکەشمان وەشاند. بێگومان سەودا کردن بە حیزبی دێموکراتی کوردستان، بەشێکە لە بەرهەمی شەڕی ناو خۆیی.

ئێمە کۆمەڵێک لە ڕوشنبیران و کەسایەتییەکانی کوردی دانیشتووی سوید:

یەکەم- بەزاندنی سنووری باشووری کوردستان لە لایەن دەوڵەتی داگیر کەری ئێران و پەلاماری وەحشیانەی بۆ سەر بنکەکانی حیزبی دێموکرات و ئۆردوگای پەنابەرانی کوردی ئێران، بە توندی مەحکووم و ڕیسوا دەکەین.

دووهەم-داوا لە UN و هێزە هاو پەیمانەکان دەکەین کە باشووری کوردستان لە پەلامار دانی دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتەکانی تری ناوچە بپارێزن.

سێهەم- داوا لە کۆمەڵانی گەلەکەمان و هەموو هێزە کوردستانییەکان - ئەوانەی کە لەم تاوانە دا هاو بەش نین-دەکەین کە بە هەڵوێستی عەمەلی خۆیان پشتیوانی لە هێزە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران بکەن و گیانی ژن و منداڵ و پەنابەرانی کوردی ئێران بپارێزن و هەر چییەکیان پێدەکرێ دژی هێزە داگیرکەرەکانی ئێران، ئەنجامی بدەن.

١٩٩٦/٧/٣٠ ستۆکهۆڵم.

دیارە ڕادیۆی یەکێتی نیشتمانی لە سوید بە شێوەی تەبلیغاتی خۆی و بە پێی کولتوری قسەکەرەکانی بەر پەرچی ئەم هەڵوێستەی دایەوە و حاشاشی لەو کارەساتە داخدارە دەکرد.

کریس کۆچێرا ڕۆژنامە نووس وکوردۆ لۆگی ناسراوی فەرانسەیی لە کتێبی تازەی خۆیدا بە ناوی« خەباتخوازیی کورد» کە لە ساڵی ١٩٩٧ دا چاپ کراوە و بەشی کوردستانی ئێرانی لە لایەن ناسر حەسەن زادەوە کراوە بە کوردی، لەم بارەوە دەنووسێ:«...ڕۆژی ٢٦ی ژووئیەی ١٩٩٦ دوو هەزار پاسداری شۆرش لە نیزیک پێنجوێن سنوور دەبەزێنن و دەچنە سولەیمانی و شەو لە مەعسکەر سەلام کە یەکێک لەو قەڵا گەورانەیە کە صدام لە ساڵەکانی ١٩٨٠دا دروستی کردبوو دەمێنێتەوە. ڕۆژی دوایە ئەو هێزانە کە بە سەد کامیۆن و تۆپی ١٣٠ملم و ١٥٥ملم، مووشەکی کاتیوشاو مووشەک هاوێژی« حسین» کە ١٢٠کم بوردی هەیە تەیار بوون و لە لایەن سێ سەد پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە ئیسکۆرت کرا بوون، وەڕێ دەکەون. ئەوان کاتێک دەگەنە بەرزاییەکانی هەیبە سوڵتان کە بە سەر دەشتی کۆیە دا زاڵە، لە ڕۆژەکانی ٢٨و٢٩ی ژووئیەدا دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە لە کۆنەوە قەلایەکی ئەرتەشی عێراق و لە چەند کیلۆ میتریی شاری کۆیە هەڵکەوتوە لە گەڵ پێنج ئۆردووگاکەی حیزب لە دەورو بەر بۆردوومان دەکەن. پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکرات کە چوونە پێشی هێزەکانی ئێرانیان هەنگاو بە هەنگاو خستبووە ژێرنەزەر، توانیبوویان سەنگەر بگرن و خۆیان پەنا بدەن، بەلام لەو تۆپ بارانەدا ماڵی بنە ماڵەکانی پێشمەرگەو نەخۆشخانەی یارمەتییە دەرمانییە نێو نەتەوەییەکان و ڕێکخراوی پزیشکانی جیهان وێران دەبن و تەنیا ئەو قوتابخانەیەی فرانس-لیبرتێ سازی کرد بوو، هیچی لێ نایە.

تۆپخانەی ئێران هەر وەها ئۆردوگای جێژنیکان لە نیزیک شاری هەولێر کە سەدان کوردی ئێرانی لێ دەژین وە بەر تۆپ دەدا. ڕۆژی ١٨ی ژووئیەی ١٩٩٦ سەعاتی ١٠ی بەیانی یەکە یەکی پاسدارانی شۆرش لە هەیبە سوڵتان دێنە خوار بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر دەفتەری سیاسی، بەلام پێشمەرگەکان پاشە کشەیان پێدەکەن. پێشڕەوی ستوونەکەی ئێران گەیشتبووە دەروازەی کۆیە و چەند پاسدارێک بە لیباسی یونیفۆرمی خۆیان چوو بوونە نێو شار... دوای

ئەوە کە فرۆکەی هاو پەیمانەکان لە پاش نیوەڕۆی ٢٩ی ژووئیەی ١٩٩٦ بە سەر سەری هێزە ئێرانیەکان دا دەفڕن، شەوێ ئەو هێزانە هەر بەو ڕێگایە دا کە پێی دا هاتبوون دەگەڕێنەوە. پارتی دێموکراتی کوردستان قبوڵ ناکا بەشێکی ستوونەکە بە ڕێگای حاجی ئۆمەراندا بگەڕێتەوە. ئێرانییەکان لە هاتنیش دا ویستبوویان بەو ڕێگایە دابێن.»

**باسێکی لاوەکی**

ئیمرۆ ١٩٩٨/٩/٩ کە ئەم یادداشتانە ڕێکوپێک دەکەم و دەیانهێنمە سەر لاپەڕەی کۆمپیوتەر، بەر دەوام ڕادیۆش کار دەکاو گوێ دەدەمە دەنگوو باس. ئەوەش شێوە کاری منە کە پێی ڕاهاتووم و بەبێ ڕادیۆ یا گۆرانی کوردی، بە تایبەتیش حەیرانی ڕەسو گەردی و ئازیزە و پایزەی حاجی سمایل و گۆرانی ماملێ و ناسر و مەرزەی ڕەزازی، ناتوانم کار بکەم. دەنگوو باسی سەرنج ڕاکێشی ئیمرۆ، بەشی زۆری هەر باسی قەیرانی ڕووسیایە. ڕووسیا توشی قەیرانێکی سیاسی و ئابوری و کۆمەلآیەتی بوە، تەنانەت چوونی سەر کۆماری ئەمریکاش نەیتوانی چاری بکات. کلینتۆن لە سەفەری خۆیدا بۆ مۆسکۆ هەوڵ و تێکۆشانەکەی هەر ئەوە بوو کە لە زانستگای مۆسکۆ بە خوێندکاران بڵێ: پشتی یەلتسن بگرن یا کۆمونیزم نە گەڕێتەوە. لە بالیۆزخانەی ئەمریکاش لە مۆسکۆ لە گەڵ نوێنەرانی هێزە سیاسیەکانی ڕووسیا هەر ئەو فەرمایشتەی دوو چار کردەوە. برسیەتی و بێکاری و دزی و مافیاو لە بەر یەک هەڵوەشانی بنکەو بنەمای ئابووری ڕووسیا کە بەرهەمی هەوڵ و تەقەلای چەند ساڵەی ئەمریکا یە، بۆ کلنتۆن و یەلتسن گرنگ نەبوو، ئەوەی گرنگ و جێگای مەترسی بوو، تەنیا گەڕانەوەی کۆمۆنیزم بوو، سیستمێکی کە ساڵە هایە بە فەوتاو و مردوو و لە بەین چوو ناوی دەبەن.

لە گەڵ گەڕان بە نێو یاد داشتەکانمدا تووشی ئەم کورتە نووسراوەش بووم کە ڕۆژنامەی (Doma)چاپی بولغارستان لە ژمارە ١٤/٥/١٩٩٦دا نووسیبووی. من ئەو دەم لە بولغارستان بووم و دەقی نووسراوەکەم لە دەفتەری یادداشتەکانمدا تۆمار کرد بوو. ئەمەش دەقی وەرگێڕاوی نووسراوەکەیە :

«...١- ژەنراڵ( بۆریس گرومۆف) کە یەلتسن بۆ تەبلیغاتی هەڵبژاردن بۆ

شارەکانی ناردوە، رایگەیاند کە پشتیوانی لە یەلتسن دەکات. چونکە هاتنە سەر کاری کومونیستەکان گەڕانەوەیە بۆ دواوە. ناو براو هەر وەها گوتی: ئەگەر یەلتسن لە هەڵبژاردندا سەر بکەوێ، هیوا دارە بکرێتە وەزیری بەرگری.

٢- پاتریخا ئەلیکسێی دووەم( گەورەترین قەشەی ڕووسیا) داوای لە خەڵکی ڕووسیا کرد کە پشتیوانی لە یەلتسن بکەن و لە مەترسی کۆمونیستان وریایی دا بە خەڵک. ناو براو گوتی : گەڕانەوەی کۆمونیستەکان بۆ دەسەڵات مەترسیەکی گەورەیە.

بە دیتنی ئەم قسانەی گەورەترین قەشەی ڕووسیا تێلگرافی پاپی دوازدەهەمی واتیکانم وە بیر هاتەوە کە بە بۆنەی سەر کەوتنی فرانکۆی فاشیست لە شەڕی نێو خۆی ئەسپانیا و کوشتاری دەیان هەزار کەس بۆ فرانکۆی نارد بوو. لە تێلگرافەکە دا دەڵێ:« دڵ و گیانی خۆم لە بارەگای خودای تەعالا دەکەمە قوربانی لە گەڵ ئەو جەنابە سەبارەت بە سەر کەوتنی ئەسپانیای کاتۆلیک. سوپاسی دەکەین.»

یا پیروز بایی ڕێبەری میللی و مەزهەبیی کوردستانی ئێران لە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان  بە بۆنەی کوشتاری کۆمونیستەکانی کورد و عەرەبی عیراقی بە دەستی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان لە پشت ئاشان. دیتم فەرقی نیە، چ قەشەی ڕووسیابێ و یا پاپی کاتۆلیک و یا مەلای موسڵمان دەبێ پشتی سەر کەوتوو بگرن هەر چەند جنایەت و تاوانیش بێ.

٣- گۆڤارێکی تازەی ڕەنگیی دەستی کرد بە بڵاو بوونەوە. لە ١٠ میلیۆن تیراژ بە خۆڕایی و بە بێ پارە لە ڕووسیا بڵاو دەکرێتەوە. ناوی گۆڤارەکە ئەوەیە:( خودا بمانپارێزێ) ٢٠ ڕۆژنامە نووسی ٣٠-٤٠ ساڵە کاری تێدا دەکەن. گۆڤارەکە بە یارمەتی سەرمایەی شەخسی دەر دەچێ کە دیار نیە خاوەنی کێیە و پارەی ئەم گۆڤارە لە کوێوە دێت..»

لەگەڵ دیتن و بیستنی قەیران و بار و دۆخی ئیمڕۆی ڕووسیا، لام وابوو چ قەیدی نیە ئەم باسە لاوەکیە بێتە نێو یادداشتەکانم و ڕەنگە بۆ پەزیش زیانی نەبێ. نەک هەر ئەوە لە وانەیە بۆ لێ ورد بوونەوەی سیاسەت و ڕوو داوەکانی جیهان و شارەزایی لە گەڵ گەمەی پشتی پەردەی سیاسەتی جیهانیش بێ کەلک نەبێ. دوور نیە بۆ ئەو کەسانەش کە سەردەمێک خۆیان بە خەباتگێری

ڕێگای ئازادی چەوساوەکان دەزانی ، ئێستا کە بە زەرق و بەرقی بەهەشتی سەرمایەداری چەوسێنەر شاد بوون، ببێتە مایەی توانجێک و بڵێن حسامی ئێستاش هەر لەعنەت لە زۆردار و چەوسێنەر و فریودەر و هەلپەرستان دەکات.

**گەڕانەوە بۆ سەر دەفتەری یادداشتەکانم**

پاش ئەوەی برادەرانی ڕێکخراوی پارتی دیموکراتی کوردستان- یەکگرتوو لە سوید فیزای سوریاو بلیتی چوون و گەڕانەوەیان بۆ ئامادە کردم، ڕۆژی ١٩٩٦/٨/١٢ بۆ بەشداری لە ئاهەنگی ٥٠ساڵەی دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە گەڵ کاک حەمید بروار و کاک ڕەشید عارف و کاک لوتفی باکسی سەعاتی ٧/٣٠ بەیانی بەرەو ڤیینا کەوتینە ڕێ. پاش ماوەیەک وێستان لە فڕۆکە خانەی ڤیینا، سواری فڕۆکەیەکی سوری بووین و نیزیک بە نیوەڕۆ گەیشتینە فڕۆکەخانەی شامی شەریف.! لە مەرکەزی جەوازات وەرەقەمان پڕ کردەوە و کاک ڕەشید عارفیش لێمان بوە چاو ساخ و دەڕاست کە لام وابوو هیچ پێویستی نەدەکرد. کاتێ پاسپۆرتیان لە من وەر گرت و کابرا خستیە نێو کۆمپیۆتەر، پرسی: ئەسلی. بە ئەسڵ خەڵکی کوێی. بەر لەوەی من وەڵامی بدەمەوە، کاک ڕەشید عارف هەڵیدایە و گوتی: ئێران. ئەوەندە بەسبوو بۆ ئەوەی کە من و کاک لوتفی باکسی لە برادەرانی عیراقی جیا بکەنەوە. کوردە عیراقیەکانیان بۆ لایەکی دیکە بردو ئەمەشیان ڕاگرت. تازە هیچ نە دەکرا، کاک رەشید عارف لە خۆوە کارەکەی تێکدا بوو. پاش نووسین و چاو لێکردن بۆ پارە، تێپەڕ بووین و سەر بازەکەی پەنا کابرای نووسەر، بێ ئەوەی هیچ شەرم بکا گوتی: بەخشش. پێنج دۆلارم دایە سوپاسی کرد. لە سوریا نەبێ، پێم وانیە لە هیچ دەوڵەتێکی دنیا ئاوا بە ئاشکرا داوای پارە لە موسافیر بکەن. دیارە کوردستانی باشوریش چونکە دراوسێی تورکیا و سوریایە، لەم دابە دزێو وشەرمەزارییە بە دوور نیە و بەڵگەی زیندووم بە دەستەوەیە و خودا بکا یەکێک بڵێ وانیە . تورکیاش نا کرێ لەم گەریانە هەڵباوێژرێت.. سەیر ئەوە بوو لوتفی گوتی: زۆرت دایە. یەک دۆلاریشی وەردەگرت. چووینە ژوور. فڕۆکەخانەی چی. کاروانسەرایەکی چۆڵ و هۆڵ. چەند کەسی گومرگ و حەمباڵ دەهاتن و دەچوون و چاویان لە دەستی موسافیران بوو، شتێکیان بدەنێ. جانتاو کیفمان

هەڵگرت و کەس نەبوو باسی گومرگ و پشکنین بکا، چووینە دەرێ.

برادەرانی دیکە لە وێ و لە گەرمای سووتێنەر دا چاوە ڕوان بوون. سواریان کردین بۆ ( هوتێل النخیل). لای ئێوارە درنگ کاک عومەربۆتانی نوێنەری پارتی لە سوریا پەیدا بوو، شەو بردینی بۆ ڕەستورانێکی خۆش و میوانداریيەکی شایاز. پاشان کاک عومەر گوتی: ناوی ئێوە لە سەر ڕوبارە بۆ پەڕینەوە. بەڵام تا چەند ڕۆژی تر بۆ قامیشلی فرۆکە نیە. باشترە بە ماشێن برۆن تا وەدوا نەکەون. ئێمە لە خوامان دەویست زووتر بگەینە قامیشلی و لە ڕوبار بپەڕینەوە و بگەینە ئاهەنگی پارتی کە ٨/١٦ دەست پێدەکرا .

ڕۆژی ٨/١٣ سواری ماشێنێکی لەندرێوەر بووین و بەرە و قامیشلی. لە ڕێگا لە ڕەستورانی ئەلبورج لاماندا . شوێنێکی تا بڵێی جوان و خۆش و پاک و خاوێن. نان و ماست و پەنیر و هەنگوێن و کەرمیەکی خاوێن و خۆشمان خوارد. لە وێوە کەوتینە ڕێ و دوای ٦ سەعات ڕێگا گەیشتینە کۆبانی. ناوچەیەکی کوردانە و وەک دەیانگوت ٣٦٠ گوندی کوردان لەو ناوچەیە دا هەیە. لە پێش چایخانەیەک ڕامان گرت. دەنگی گۆرانی کوردی دەهات. ئێمە هاتینە خوار و چووین لە بەر هەیوان لە سەرمێزێک دانیشتین. برادەرێک هات بە کراسێکی درێژ و پێڵاوێکی سەرپێیانی عەرەبی ئاسا ، ( ئەگەر کاک جەلال دەباغ پێی نا خۆش نەبێ) . دەرکەوت کوردە و خاوەن چایخانەیە. بە خێراتنی کردین و ناوی خۆی گوت: حوسێن - باوی هۆگر. پاشان ڕووی کردە من و گوتی: ناوی تە چیە. تە لە تەلەڤیزیۆنی MED دەر چووی.

گوتم: ئەز هەڤاڵی سەلاح بەدرەدینم، تە ئەو ناس دەکەی؟

ـــ ئەرێ ناس دەکەم. ئەو سەرۆکی هاوکرە. تە نە هاڤاڵی وی.

ـــ گوتم ئەو سەرۆکی هەموو کوردی سوریایە.

ـــ بلا ئەو سەرۆکی خۆی بێ بەسە.

هەموو پێکەنین. کاتێ ویستمان پارەی چایخانە بدەین. پارەی لێ وەر نەگرتین.

بە کورتی پاش ٩ سەعات ڕێگا و گەرمایەکی بێتام، گەیشتینە قامیشلی پێتەختی کوردان.! هەر لە سوریا ناوی هوتێلێکیان بە شۆفیر گوتبوو. برادەرانی مەکتەبێ قامیشلی هوتێلێکی دیکەیان ڕێزێرف کردبوو. چووینە

هوتێلی یەکەم کە لە سوریا ناویان دابوو. لە گەڵ تەویلە هیچ فەرقی نەبوو. من گوتم من لێرە نابم. چوار پێنج کورد لە دەورمان کۆ بوونەوە و هاتن منیان بە خێراتن کرد و گوتیان تە لە تەلەڤیزیۆن دەرچووی. هوتێلی باش هەیە و هەڤاڵان هەمو لەوێ دێنە خوار. گوتم ئێمە میوانی پارتین، ئیتر ڕۆیشتن. بردیانین بۆ هوتێلەکەی تر. تۆزێ بە ناموستر بوو. یەکێ لە برادەرانی مەکتەبی پارتی لە قامیشلی هاتە لامان و گوتی مەحمود لە سەر ڕوبارە، خەڵکی تر ڕەوانە دەکا دەبێ ئەو بێتەوە ناوەکانتان بدا بە بەر پرسی موخابەرات. گوتمان عومەر بۆتانی گوتوویە ناوەکانتان لە سەر ڕوبارە و سبەی دەپەڕنەوە.

کابرا گوتی: عومەر بە ئێمەی گوتوە کە لێرە ناوەکان تەقدیم بکەین، دەبێ مەحمود بێتەوە ناوەکان بدات.

شەو لە چێشتخانەیەکی شاز میوانداریان کردین ، بەڵام تامی نەبوو، چونکە وەک ئەوان باسیان دەکرد، دەبوایە ناوەکان بچنەوە دیمشق و لە وێوە موافەقەت بکرێ. چەند ڕۆژێکی دەکێشاو ئێمە نە دەگەیشتینە ١٦ای مانگ کە ڕۆژی جێژنەکە و دامەزرانی پارتی بوو.

بەیانی بردیانین بۆ مەکتەبی پارتی لە قامیشلی. مەحمود ناوەکانی نووسین و گوتی هەوڵ دەدەم. عومەر ناوەکانی نەداوە، دەبێ من لێرە تقدیمیان بکەم. سەر لە نوێ ناوەکانمان نووسی و دامان بە مەحمود.

١٤/٨ هەموومان زۆر نارەحەتین. عومەر بۆتانی درۆی لە گەڵ کردووین. ناو و ئیجازەی پەڕینەوەی نە ناردوە. تازە مەحمود قایمەی نوێ کردۆتەوە تا بیدا بە موخابەرات و ئیجازەی پەڕینەوە وەر بگرێ.

من لە ڕێگای مەکتەبی پارتیەوە برادەرانی کاک سەلاح بەدرەدینم دیتەوە. حەمەدەمین هاتە هوتێل و بردمی بۆ ماڵی خۆیان. کاک مستەفا جومعە و دوکتور عبدولکەریمی برای کاک سەلاح و یەک دوو برادەری دیکەیان لەوێ بوون و ئەوانیش داوەت کرابوون و چاوەڕوانی پەڕینەوە بوون. دوکتور عبدولکەریم پێی دادەگرت کە لە هوتێل نەبم و بچم لە ماڵی ئەوان بمێنمەوە. بۆ ئێوارەش دوکتور عەبدولکەریمی برای کاک سەلاح داوەتێکی گەورەی ساز کرد و چەند برادەری داوەت کرد بوون و باس و پرسیارێکی زۆر هاتنە گۆڕێ.

ڕۆژی ١٥/٨ بەیانی دەسکۆی مێردی موعتەبەر شیروانیم لە هوتێل چاو

پێکەوت. هاتە لام و گوتی لە دوورەوە دەتناسین. ئەویش لە ئەمریکاوە هاتبوو بۆ بەشداری لە ئاهەنگی ٥٠ ساڵەی پارتیدا دەچوە کوردستان. هێندێ کتێبم لە گەڵ خۆ بۆ برادەرانی هەولێر برد بوو، گوتم بەم حاڵە وا دیارە ئێمە ڕێگا نادرێین. کتێبەکانم دا بە دەسکۆ بۆ موعتەبەری خوشکی کاک قەرەنی قادری وەک دیاری . تەلەفونم بۆ عومەربۆتانی کرد و گوتم ئەم ئۆینە چیە.؟ ئێوارە مەحمود هات و گوتی: موافەقەت کراوە، بەڵام بەرقیە نەهاتوە. سبەی دەڕۆن. شەو دوکتور خەلیل ڕەشید داوەتی کردین. دوکتور خەلیل ڕەشید کوردێکی سوریا و ساڵی ٩٨٤ لە ئەستەمبوڵ لە گەڵی ببوومە ئاشنا و لە سۆفیا هاتبوە ماڵمان، پیاوێکی دڵسۆزی جوامێری نیشتمانپەروەری تێگەیشتوو. ماڵێکی سەر ئاواڵە و میواندارییەکی تەواو کوردانە و دانیشتنەکە ئەوەندە خۆمانە و دۆستانە بوو، خەمی سەفەری لە بیربرد بووینەوە. برادەرانی لە گەڵم بوون، پێیان سەیر بوو، دەیانگوت ئێمە لێرە پترمیوانی تووین تا میوانی پارتی. ڕۆژێکی دیکە دوکتور عەزیز فەرمان داوەتێکی پیاوانەی کرد ئەویش سەر دەمێک لە سۆفیا دەیخوێندو نێوانمان خۆشبوو. چوو بوە سۆڤیێت و هاتبۆوە لە قامیشلی خەستەخانەی تایبەتی دانا بوو. لە هەمووی خۆشتر کاک لوتفی باکسی بوو. کاتێ ئەو برادەرە کرمانجانەی قامیشلی وا لە دەورەم دەبوون و داوەت و میوانداریان دەکرد، کاک لوتفیم هەر لە گەڵ بوو، لە گەڵ زۆریان بە خزم دەرچوو کە یەکتریان نەدەناسی. بنەچەکە و بنەماڵەی خۆیان دەبردەوە سەر یەک و دەر کەوت هەموو ناسیار و خزمی یەکترن و هەمووش لە تورکیاوە هاتوون. عەبدوڵا ئوجەلان بە خۆڕایی نەی گوتوە:« لە سوریا نە کورد هەیە و نە کوردستان ئەو کوردانەی سوریا هەموو لە تورکیاوە هاتوون»!

ڕۆژی ٨/١٦ بەیانی مەحمود هات. کاک حەمید برواری و کاک ڕەشید عارفی سوار کرد کە بەرێیان بکات و بە ئێمەی گوت: « بەرقیەی ئێوە نەهاتوە بەڵام دێت،» نامەیەکم بۆ کاک مەسعود نووسی و دام بە ڕەشید عارف و گوتم ئەوە چەند ڕۆژە لێرە ڕایان گرتووم. هەر وەها ئەم وتارەی خوارەوەش کە بۆ پێشکێش کردن لە یادی ٥٠ ساڵەی پارتی نووسیبووم، لە گەڵ نامەکە ناردم بەڵکوو لەوێ بیخوێننەوە، ئیتر لێشی بێخەبەر بووم کە داخوا خوێندرایەوە یان نا، بەڵام دیار بوو ناخوێندرێتەوە، چونکە ئەوان ڕۆژی ١٦ ڕۆیشتن و ئاهەنگەکە

تەواو دەبوو. بەڵام ئێستا کە نوسخەی وتارەکەم ڕاگرتوە لێرەدا بڵاوی دەکەمەوە. ئەمەش دەقی وتارەکەیە:

**پیرۆز بایی لە دامەزرانی پەنجا ساڵەی پارتی دیموکراتی کوردستان**

« زۆر بە شانازی دەزانم کە لە سەر داوەتی لیژنەی باڵای یوبێلی زێرینی پارتی دیموکراتی کوردستان لەم ئاهەنگە پیرۆزە دا بەشدارم و دەتوانم لە نیزیکەوە سال ڕۆژی پەنجا ساڵەی دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، پارتی بارزانی نەمر بە سەرۆکی پارتی و بە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کومیتەی ناوەندی و بە هەموو ئەندام و لایەنگر و دۆستانی پارتی پیرۆز بایی بڵێم.

بەشداری لە ئاهەنگی ساڵ ڕۆژی دامەزرانی پارتی و نیزیکی زیاتر لە پارتی دیموکراتی کوردستـــان ـــ یەککرتو، بۆ ئێمە کوردەکانی کوردستانی ئێران ماناو مەفهومێکی تایبەتی هەیە. لە بیرمان نە چێ کە بیری دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ژێر تەئسیری حیزبی دیموکرات و لە ناو جەرگەی کۆماری کوردستان، هەوەڵین دەسەلاتی نەتەوەیی کورد هەڵقوڵاوەو پاشانیش ماوەی پەنجا ساڵ خەباتی بێ وچانی خۆی لە پێناو ئازادی و سەر بەستی کورد دا درێژە پێداوە. بە داخەوە ئێستا ئێمە پاش پەنجا ساڵ لە هەل و مەرجێکی زۆر دژوارو نا لە باری خۆ جێیدا یادی ئەو ڕۆژە پیرۆزە دەکەینەوە. من چەندە دڵشاد دەبووم کە ببینم هەموو هێزەکانی کوردستان بە تێکڕایی و بە یەک دەنگ پەنجا ساڵەی دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان پیروز بایی دەکەن.

بێگومان گەلی کورد بە گشتی و بە تایبەت کوردەکانی کوردستانی خواروش چەندە شاد دەبوون کە دیتبایان ئیمرۆ لەم کۆبوونەوەو لەم تریبونە دا مام جەلال وتارێکی پیرۆز بایی و بانگی یەکیتی یەکی نەو تۆی پێشکێش کرد بایە کە بە بۆنەی یادی ساڵڕۆژی کۆچی دوایی بارزانی نەمردا لە کۆبوونەوەی جەماوەری هەولێر، بە خەڵکی ڕاگەیاند. هەقیش هەر وابوو. چونکە هەمووی ئەو کەسانەی کە ئێستا لە کوردستانی خواروو بە سیاسی و ڕێبەر و تێکۆشەر دەناسرێن، لە ئامێزی ئەم حیزبە دا پەروەردە بوون و لە ژێر سێبەری هەوەڵین

سەرۆکی پارتی دا پێگەیشتوون و هەڵیانداوە.

برایانی بە ڕێزی پارتی دیموکراتی کوردستان ـــ یەکگرتوو!

لە یادی ٥٠ ساڵەی پارتییەکەتاندا،لە بەرانبەر گەلی کورد، نەک هەر لە کوردستانی خواروو، بەڵکوو لە هەموو بەشەکانی کوردستان ئەرکێکی گرنگی مێژووییتان دەکەوێتە سەر شان، چونکە هێزی سەرەکی پڕ ئەزموون و خاوەن خەباتێکی دوور و درێژی کوردایەتین. هەر بۆیەش گەلی کورد ئیمڕۆ چاوی بڕیوەتە بار و دۆخی داخداری کوردستان و هەڵوێست و کردەوە و سیاسەتی ئەم دوو هێزە سەرەکیەی کوردستانی خواروو کە کوردستانیان لە گەلی کورد کردۆتە جەهەندەم و کارێکی وایان کردوە کە خەڵک ئاوات بە کفن دزی هەوەڵێ بخوازێ. کوردستانی عیراق کە هەمیشە پەناگای کوردی ئاوارەی بەشەکانی دیکەی کوردستان بوە، ئێستا کراوەتە کوشتارگای پەنا بەر و ئازادیخوازانی کورد و لەشکری حکوومەتی داگیر کەر لە نێو دڵی کوردستان و لە ژێر ناوچەی دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا ئاوارە و پەنا بەری کورد وەبەر تۆپ و خومپارە دەدات.

دوژمنانی نەتەوەی کورد دەستیان خستۆتە نێو کار و باری نێو خۆی کوردستانی ئازاد و لە ڕێگای جۆر بە جۆرەوە خەریکن ئەم دەسکەوتە مێژوویەی نەتەوەکەمان لە بەین بەرن و جارێکی دیکەش گەلەکەمان بخەنەوە ژێر نیری کۆیلەتی و ژێر دەستیی. ڕوناکبیرانی کورد لە دەرەوەی وڵات کاتێکی دەنگو باسی وڵات سەبارەت بە کردەوەی چەپەڵ و لە ژێر پێنانی ماف و کەرامەتی مرۆڤ و کوشتنی ژنان و تاڵان و دەر کردن و ڕەشە کوژی دەبیسن، شەرم دەیانگرێ.

هیوادارم پارتی دیموکراتی کوردستان ـــ یەکگرتوو، لە ژێر تیشکی گۆڕانکارییەکانی ئیمڕۆی جیهاندا، لە باری کردەوە و تەبلیغات و ڕێز گرتن لە مافی مرۆڤ و لە دەربڕینی بیر و ڕای موخالیف و شێوەی ڕێبەرایەتی گۆڕانێکیی ئەوتۆ پێک بێنێ کە ببێتە ڕێکخراوێکی بە ڕاستی دیموکرات و کورد شانازی پێوە بکات.

جارێکی دیکەش سەر کەوتنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و سەر بەرزی پارتی دیموکراتی کوردستان ـــ یەکگرتوو بە ئاوات دەخوازم.»

ئەوان ڕۆیشتن و من و کاک لوتفی ماینەوە. تەلیفونم بۆ عومەر بۆتانی کرد، لە وەڵامدا گوتی: مەحمود گەرەک چێ بکا. مەحمودیش دەیگوت عومەر نەیویستوە. بە کورتی سەفەری من لە سۆنگەی ناتەبایی نێوان عومەر بۆتانی و مەحمود گەرگەر سەری نەگرت. برادەرانی حیزبی کومونیستی عیراق دەیانگوت: بەئیمەت گوتبا، یەک ڕۆژ دەمان پەڕاندییەوە. بە مەحمودم گوت خۆم دەڕۆم و ١٠٠ دۆلاریان دەدەمێ لە وانەیە بە سەیارەی خۆیان بمگەیێننە هەولێریش. مەحمود دەیگوت فێری ئەوەمان نەکردوون. لە کاتێکا درۆی دەکرد. هەم خۆیان فێر ببوون و هەم ئەوانیشیان فێر کرد بوو وەک خەڵک لە وێ باسی دەکردن.

لە گەل حەمەدەمینی برادەری کاک سەلاح چووینە ماڵی خوا لێ خۆشبوو جیگەر خوین و لە پەنا قەبرەکەی ڕەسمێکمان گرت. خێزانی پیر و کەوتوو لە جێدا بوو. کیژەکەی بە خێراتنی کردین و قاوەی ساز کرد. عبدالرحمان ئەحمەد بەرزنجی ئەندامی پارتی پێشکەوتن لە وێ بوو، گەلێکی پرسیار کردن. سەعاتی ١٢ گەڕاینەوە هوتێل. هیچ خەبەر نەبوو. بۆ فراوین چووینەوە ماڵی حەمەدەمین. بۆ نیگبەتیان تاقمی ددانم کە لە بولغارستان بۆیان دروست کرد بووم شکا. ڕۆژی هەینیش بوو. حەمەدەمین گوتی برادەرێکمان هەیە لە بولغارستان تەواوی کردوە و دوکتوری ددانە و ناوی شەلالە. گوتم تەلیفونی لێبکە دەیناسم. حەمەدەمین تەلیفونی لێکرد و دوکتور شلال هات. چووینە مەتەبەکەی. ددانەکانی بۆ چاک کردمەوە و ئێوارەش شایی بوو، ژنی بۆ برای دەگوێزتەوە. دەگەڵ کاک لوتفی چووینە شایی. خەڵکێکی یەکجار زۆر بەشداریان کردبوو. کاک لوتفی لە وێش هێندێ خزم و ناسیاری کۆنی دیتنەوە.

ڕۆژی ٨/١٧/ مەحمود گوتی بەرقیە هاتوە. بڕوام بەو نەکرد، تەلیفونم کرد بۆ عومەر بۆتانی، گوتی بەرقیەیان ناردوە. دوای نیوە ڕۆ چوومە سەردانی عەبدوڵای مەلا عەلی، یەک لە کەسایەتیە ناسراوەکانی کوردی سوریا کە ٩ ساڵ لە زیندانی بەعسی سوریا دابوە. باسی زیندانی بۆ گێڕامەوە کە ٩ سالیان گرتوە و پرسیاریان لێ نەکردوە، گازندەیەکی زۆری لە سیاسەتی حیزبە کوردییەکان هەبوو. دەیگوت: بەشاندوویانین و دەمان بەشێن. ٥٠ هەزار کەس پێشوازی لە مەسعود بارزانی دەکا، هیچ ناڵێن. بەڵام ئەگەر وشەی ( ڕێزان) لە

سەر دەرگای دوكان بنووسین، دەیهێننە خوارێ و رێگا نادەن ئەم وشە كوردیە لە دیواریش بنووسرێ. گوتی: كاتێ لە زیندان بووین نامەیەكمان بۆ مەسعود بارزانی نووسی و گوتمان؛ ئێمە بۆ فیداكاری ئامادەین، لە سەر ئێمە پێوەندیی خۆتان تێك مەدەن. بەلام جارێك سوریاسیشیان نەكردین و لێیان نەپرسین. مەسعود و جەلال لە سەر حیسابی كوردی سوریا رێككەوتوون لێرە دامەزراند. گلەیی زۆر بوون و هەر ئەوەندەم پێ یاد داشت كرا و بە پێویستم زانی لێرەشدا تۆماریان بكەم. ئەو رۆژەش تا ئێوارە هیچ خەبەر نەبوو. تەلیفونم بۆ عومەر بۆتانی كرد و گوتم؛ من دەگەڕێمەوە و چیتر لە سەر درۆی ئێوە گیرنابم. هەر لەو برادەرانە لەوێ دۆزیبوومنەوە ، یەكیان بە ناوی مراد داوەتی كردین بۆ دیركێ و عین دیوار لە سەر دجلە. سەفەرێكی خۆش بوو. لەوبەری دجلە جزیرە دیار بوو، لە مالی مرادی تەلەفیزیۆن هەبوو، تەلەفیزیۆنی پارتی وەر دەگرت. ئێمە لە تەلەفیزیۆن تەماشای ئاهەنگی شوان پەروەرمان دەكرد لە دهۆك. هەموو خەلكی گوندەكە گەورە و بچوك لە حەسارێ هاتبوونە سەیری تەلەڤیزیۆن. بەشی زۆری گۆرانی و قسەكانی بە سۆرانی نیشان دەدا. منیش بە گالتە گوتم: ئەرێ ئەوە چیە، ئەوانە بۆ بە كوردی گورانی نالێن هەمووی هەر سۆرانییە!. تێكڕا جەماعەتەكە گوتیان وەلا برا ڕاست دەبێژی، ئێمە هیچ فامناكەین.!

رۆژی ٨/١٩ بەیانی مەحمود و سەلاح هاتن، لە جیاتی بەرقەیەی پەرینەوە، بەرقیەی كاك مەسعودیان پێبوو كە بۆ مەكتەبی دیمشقی نارد بوو. مەحمود برێكیش تورە بوو كە بۆ چی نامەم بۆ كاك مەسعود نووسیوە. گوتم كۆپیێكی بەرقیەی كاك مەسعودم بدەیە. كۆپیەكیان بۆ هێنام و ئەوەش دەقی بەرقیەكەیە:

«...الی م. دمشق/م. القامیشلی. من / م.ب ١٣٣٥- ١٨/٨/ ١٩٩٦

لقد كان السید كریم حسامي مدعوا من قبلي شخصیا و جأ الي القامشلي، لكنة لم یستطیع العبور بسبب عدم اهتمامكم به حسب ما اخبرتی فی رسالته. اطلب توضیحا عن هذه الموضوع و انا متاثر جدا.»

پاش ئەوە مەحمود گوتی؛ تازە عومەر بۆتانی گوتوویە كە چونكە عیراقی نین، ناتوانن بپەڕنەوە. هەر وەها گوتوویە تا بلیتی فرۆكەتان بۆ بكرین بۆ دیمشق و لە وێرا بگەڕێنەوە. گوتم نامەوێ بچمەوە دیمشق و بلیتی تەیارەشمان ناوێ.

هەر ئێستا پاس هەیە بۆ حەڵەب، سوار دەبین و دەڕۆین. دوکتور خەلیل و دوکتور عبدولکەریم و محەممەد عەلی و حەمەدەمین و یەک دوو برادەری دیکە ی کوردی سوریام لە گەڵبوون . دوکتور خەلیل دەیویست چەند ڕۆژێک لای ئەو بمێنمەوە. سەبارەت بە درۆ و فریوی نوێنەرانی پارتی، سوریاشم لە پێش چاوان کەوت. هەر لە ڕۆژی هەوەڵەوە عومەر بۆتانی درۆی لە گەڵ کرد بووین. هەر ئەو ڕۆژە سواری پاس بووین و بەرەو حەڵەب کەوتینە ڕێ. حەمەدەمین تەلیفونی کرد بۆ کاک مستەفا جومعە لە هەڵەب لە تەرمینال چاوە ڕوانمان بن. دیارە مەحمود پارەی ئوتوبوسی دا، هەر چەند دوکتور خەلیل دەیویست بلیتمان بۆ بکڕێ. بەلام مەحمود نەیهێشت، بلیتی ئوتوبوسی کڕی و سوار بووین بۆ حەڵەب. لە حەڵەب کاک مستەفا جومعە لە تەرمینال چاوە ڕوانمان بوو، چووینە مالی کاک مستەفا. شەو برادەرانی کاک مستەفا لێمان وەکۆ بوون و بە باسی سیاسی وقسەی خۆش شەوێکی خۆشمان بردە سەر. بەیانی سواری فڕۆکە بووین و هاتینەوە ستۆکهۆلم.

که هاتمەوە مالێ نامەیەکی برادەرێکی نە ناسراوم بۆ هاتبوو بە ناوی دوکتور نوری هێرش. هەر وەک بۆ خۆم کردۆتە باو، لێرەدا نامەی ئەو برادەرەش بلاو دەکەمەوە. بۆ چوونی برادەرێکە و زیانی بۆ کەس تێدا نیە، ئەمەش نامەی دوکتور هێرش نووری :

«... مامۆستای بەرێز و هەڤالی تێکۆشەر کاک کەریم. ڕۆژ باش!

لە کانگای دلمەوە هیوا دارم لە خۆشیدا و لەش ساغ و بێ وەی بیت. ماوەیەکی زۆرە نیازمە چەند دێرێکت بۆ بنووسم، بەلام لە بەر نەخۆشی و گیر و گرفتی نامەموار و کار و پاشان نەخۆشی جەنابتان دوا کەوتم، بێ ئەوەی لە یادیتان بکەم.

بە ڕێز! ئەوە سالێک ئەبێت لە گەڵ دوو برادەری تری کوردا لە بەرلین پیاسەمان ئەکرد و بە کوردی ئەدواین لە بەر دەم دوکانێکا کابرایەک سەوزە و میوەی ئەهێنا بەر دەم دوکانەکەی کە ئێمەی دی بە کوردی وتی: ڕۆژتان باش. چووینە دوکانەکەی وتی خەلکی کوردستانی ئێرانە. دوای ئەمە چەند جارێک شەمۆیان ئەچووینە لای ئەم برادەرە شتمان لێ ئەکڕی، ڕۆژێک دیم خەریکی خوێندنەوەی نامیلکەیەکی کوردی یە. لێم پرسی ئەوە هی کێیە؟ وتی

بیرەوەرییەکانی کەریمی حسامی یە. وتم ئەتوانی بمدەیەی بیخوێنمەوە؟ وتی نە. بەڵام ئەگەر ئەتەوێت داوا ئەکەم بۆت بێت. منیش پەسندم کرد. دوای چەند هەفتەیەک کە چوومە لای بە زمردە خەنەوە وتی: بیرەوەرییەکان هاتن و دەستی برد پتر لە دە کتێبی دەر هێنا و وتی: نرخیان سەد مارکە. منیش هەر چەندە ناوی جەنابتانم بیستبوو وەکوو یەکێک لە سەرکردەکانی دێموکرات و هەندێ گلەییشم هەبوو کە ماوەیەک لە بەغدا بوون لای دەوڵەتی عەرەبی عیراق. بەڵام لەمە زیاتر هیچی ترم بەرامبەر بە جەنابتان نە ئەزانی: ( جا ئێستا ئەو هەموو کتێبە چۆن ئەخوێنرێنەوە، خوا ئەزانێ چی تیایە و سەد مارکیش بدە. من ئەو کاتەم کوا بۆ ئەو هەموو بیرەوەرییانە) لە گەڵ خۆم بە خۆم وت. بەڵام سەد مارکم دا و کتێبەکانم هەڵگرت و هاتمەوە ماڵ لە وێ لە سەر مێز دامنان، چەند هەفتەیەک هەر سەیرم نەکردن.

رۆژێک دەستم دایە یەکێکیان و دەستم کرد بە خوێندنەوەی، کاتێ سەرم هەڵبڕی نیوەم تەواو کردوە. جا ئیتر دەستم کرد بە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکان لە ژمارە یەکەوە. ئەوەندە جوان و خۆش و بە زوبانێکی کوردی سروشتی نووسراون کە پیاو حەز ناکات خوێندنەوەکە بە جێ بهێڵێت، ناوەرۆکەکەی ئەوەندە دەوڵەمەند و بە پیتە کە خوێنەر هەست بە ماندوو بوون و ئۆقرە گرتن ناکات.

مامۆستای بەرێز: بیرەوەرییەکانت نەک( ١٠٠) مارک بەڵکوو نرخیان بە پارە تەواو نابێت و خۆی لە خۆیانا قوتابخانەیەکی فرە گەورەن لە خەبات و بەر خۆدانی گەلی کوردستان لە پێناو ئازادی و یەکیەتی و سەر بەخۆبوون.

بە لای منەوە ئەم نامیلکانە ئەبوایە بکرانایە بە بڵاوکراوەیک و سەرچاوەیەک بن کە کورد لە گشت هەندەران بیخوێننەوە بۆ ئەوەی تێبگەن جوڵانەوەی کوردایەتی چۆن و بەرە و کوێ ئەروات. هەر چەندە من هەندێ روون کردنەوە و نیمچە رەخنەم لە سەر هەندێ شت هەیە بەڵام ئەمە شتێکی سروشتییە. هەزار ئافەرین کاک کەریم. پیاوی وەکوو تۆ لە ناو گەلانی خوێندەوار و خاوەن( فەلسەفەی نەتەوایەتی) هەر بە زیندوویی پەیکەریان بۆ ئەکرد وەک قارەمانێکی نەتەوایەتی، بەڵام هەزار داخ بۆ گەلی کوردی هەژارمان. لە گەل جوانترین سڵاوم هەر بژی. دوکتور نوری هێرش بەرلین ٢٢/ ١٠/١٩٩٦»

دوکتور نووری لوتفی کردوە. من خزمەتکارێکی ئەو تۆی نەتەوەکەم نیم کە شایانی ئەم لوتف و پەسنە بم، بەڵام ئەوە بۆچوونی خۆیەتی و منیش پڕ بە دڵ سوپاسی دەکەم.

**کارەساتێکی دڵتەزێن**

٩٦/١٢/١ خەبەری کۆچی دوایی کاک نەبی قادری- م پێگەیشت. خەبەرێکی تاڵ و دڵتەزێن بوو. کاک نەبی قادری ئینسانێک بوو هێدی ، بێ فیز ، نیشتمانپەروەرێکی دلسۆز و تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەر. لە نێو دۆست و هاو سەنگەرانیدا خۆشەویست و بە رێز بوو. کاک نەبێ لە سەر دەمی دیکتاتۆری پاشایەتیدا هەر چەندە لە باری شەخسی و بنە ماڵەیی لە کەش و هەوایەکی تا سازگار و چەوساوەییدا نە دەژیا، بەڵام بە قووڵی هەستی بە ژێر دەستی و ستەمدیدەیی نەتەوەکەی دەکرد و سەری لە جم و جۆڵ و تێکۆشانی سیاسی دەخورا و هەوڵی دەدا کە رێگای خەبات بدۆزێتەوە و بە گوێرەی توانا بۆ ئازادی و رزگای گەلەکەی تێبکۆشێ. لە سەفەری ئوروپا لە پاریس لە گەڵ دوکتور قاسملو پێوەندی دەگرێ و دێتە ریزی تێکۆشەرانی رێگای ئازادی و لە گەڕانەوە دا بە گوێرەی هەل و مەرجی ئەوێ رۆژێ بۆ روونکردنەوەی کەسانی بڕوا پێکراوی دەورو بەری خۆی دەست بە کار دەبێ. دوای روخانی رژیمی شا و ئاشکرا بوونی تێکۆشانی حیزبی دێموکرات کاک نەبێ وەک کادری خاوەن پێشنیەی ناوچەی شنۆ دێتە نێو کۆڕی کار و باری سیاسی و تەشکیلاتی حیزب و لە دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکرات دا بۆ چاو پێکەوتنی خومەینی و بە رێوە بەرانی ئەو سای حکوومەتی جەمهوری ئیسلامی دا بەشدار دەبێ. کاک نەبی لە خەبات و تەنگ و چەڵەمەکانی کوردستاندا لە ناوچەی شنۆ و دەور و بەر بەشداری دەکا. لە کۆنگرەی پێنجەمی حیزبی دێموکرات دا بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی هەڵدەبژێردرێ و تا رۆژی ماڵاوایی لە گەل و نیشتمان و خۆشە ویستەکانی لەم پلەیە دا درێژە بە تێکۆشانی دەدا. کاک نەبی هەر چەند ئەندامی کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکرات بوو، بەڵام کەسایەتی خۆی دەپاراست و دروێشێکی مێشک بەستەڵەک نەبوو. ڕەنگە بۆ نیشاندانی سەر بەخۆیی فیکری و شەخسیەتی کاک نەبی قادری ئەوە کەم نە بێ کە لە

چاو هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات لە ئوروپا تا هاتبێتە سوید سەردانی منی دەکرد و پێوەندی دۆستانەی لە گەڵ من پاراست و چەند نووسراوەیەکی پێویست و بە کەلکی دامێ کە بە کاری نووسینەکانم دە هاتن. بە داخی گرانەوە ١٥ رۆژ پێش ئەوەی دڵە گەورەکەی لە لێدان بکەوێ، بە تەلەفون قسەمان کرد و گوتی ئەوە نایەی سەرم بدەی؟ پێم خۆشە بتبینم و هێندێ قسان بکەین. جارێکی دیکەش بە داخەوە ئەم ئاواتەی خۆم و کاک نەبی نەهاتە دی و خەبەری داخدارم پێگەیشت.

لەگەل سەرهەنگ قادری و خوشکە مریەم و کورەکانی چووینە دانمارک هاو دەردی و بەشداری خۆمان لە داخ و کەسەرە رابگەیێنین. لە هەموو ئوروپا دۆستان و هاو سەنگەر و هاو ولاتانی کاک نەبی بۆ بەرێکردنی لە دانمارک کۆ بوونەوە و مالاواییان لێکرد. لە سەر قەبران بە چەند وشەیەکی کورت و بە دلێکی داخدارەوە خوا حافیزیم لێکرد.

رۆژی دوایی لە گەڵ صالح خان و صادقخانی زەرزا بۆ سەر دانی محەممەدی خوارزام چوومە هولەند. لە ماڵی صالح خانە وە تەلەفونم کرد بۆ محەممەد و لە گەڵ بە رێز مەلا فەرمان برادەرێکی یەکێتی نیشتمانی هاتن و چووینە شاری دریختند. شەو رێز دار مەلا فەرمان داوەتی کردین و لە میوانداریەکی کوردانە دا، دانیشتنێکی خۆشمان بردە سەر هەر

چەندە لە بواری بۆ چۆنی سیاسی و لێکدانەوەی روو داوەکان رێک نەبووین. لە هەمووی خۆشتر میوانگری و دلاوالەیی خێزانی مەلا فەرمان بوو. گوتی: کاک کەریم درنگ زانیم کە میوانی ئەگینا یاپراخم بۆ ئەکردی.! سوپاسم کرد و شەو درنگ گوتی: «ئەبێ نەستەلەت بۆ بکەم» هەر چەندی گوتم سوپاس و پێی ناوێ، بە خوای نەستەلەی بۆ کردین و دەر خواردی داین. جا نوکتەیەکی کاک محەممەدی موهتەدیم وەبیر هاتەوە لە سەر ئەم ( لێنان و کردنە) دەیگوت:« برادەرانی سولەیمانی ئەیکەن جا ئەیخۆن. بەلام ئێمە دەیخۆین جا دەیکەین )!

رۆژی ١٠/١٢/چوومە سەر دانی کاک تاهیری کەمالیزادە و براکانی. چەند رۆژێک ئیجازەی ئەدا برۆم و لە خزمەت ئەو برایانە دا رۆژەکانی خۆشمان بە باسی سیاسی و قسەی خۆش و یادی رابردوو بردە سەر.

رۆژی ١٤/١٢/ هەموومان چووینە سەر دانی شاعیری بە ناو بانگ و

شەخسیەتی ناسراوی موکریان ماموستا حەقیقی کە بۆ سەر دانی کورەکانی هاتبوە ئوروپا. وەک خۆی فەرمووی تەمەنی ماموستا حەقیقی لە تەمەنی ۹٤ سالی دا بوو.

دیداریکی زۆر خوش و بە تام و چێژ بوو. لە رادە بەدەر شادی خۆی لە دیتنی ئیمە راگەیاند. رۆژێکیش لە گەل کاک تاهیر و خێزانی چووینە سەر دانی حەمیدە خانی خێزانی ماموستا گۆران کە خۆی لە ئوتریش و خێزانی لە گەل کیژێکی لە هولەند دەژیا. رۆژی ۱۲/۱٦/ بۆ سوید گەرامەوە.

**سالی ۱۹۹۷**

شەوی سەر سالی ۱۹۹۷ بێ میوان و قەلە بالغ لە مال دانیشتین و هیچ هەستیشمان بە رۆیشتنی سالی کۆن و هاتنی سالی تازە نە کرد. تەنیا داخی ئەوە مان لە دلدا بوو کە وا سالێکی دیکەش دوور لە نیشتمان و لە کۆری خەبات و دوور لە دۆست و برادەر و کەس و کاری نێو ولات لا پەرەیەکی دیکەی تەمەن هەلدرایەوە و هیچ گۆرانێکیش بە سەر چارە نووسی نەتەوەکەماندا نە هات. ئاوارەیی و دەربەدەری تاک و بە کۆمەلی رۆلەکانی کورد بەر دەوام درێژەی هەبوو. دەنگ و باسی شەری کورد کوژی و شەرە چەقەی دەزگای تەبلیغاتی هێزە سەرەکی و شەر کەرەکانی کورد مێشکی نیشتمانپەر و ئازادیخوازانی کوردی هەندەرانی شلەژاند و نەفرەت و بێزاری خەلک لەو شەرە چەقەی نا شارستانیانە، لە نەفرەت و بێزاری لە شەر زیاتر دەبوو. باش بوو شەو درنگ کاک حەمەدەمینی سراجی وەک هەمیشە بە سەری کردینەوە ، هات و دانیشتنەکەمانی تا رادەیەک لە تەم و مژی فیکر و بێدەبگی دەرباز کرد.

۹۹۷/۱/٤ دام و دەزگای تەلەفیزیونی (مەد تێڤێ) هاتنە مال و لە سەر کەسایەتی پێشەوا قازی محەممەد و ژیان و خەبات و هۆیەکانی تێکچوونی کۆماری کوردستان و بریاری پێشەوا بۆ تەسلیم بوون و شەر نەکردن و ئەزموونی دەرسەکانی ئەم روو داوەیە وتو وێژیان لە گەل کردم و گەلێک رەسمیان گرتن و رۆیشتن.

۹۷/۱/۱۲ کاک سەعید کوێستانی تەلەفونی کرد و خەبەری یەکگرتنەوەی دوو بالی حیزبی دێموکراتی کوردستانی پێراگەیاندم. گوتم: کاک سەعید! وەک

له نامیلکەی( له پێناو چی دا) وەختی خۆی نووسیومە، نە جیابوونەوەکەم پێ کارێکی باشبوو، نە یەکگرتنەوەکەم بەو شێوەیە پێ گرنگە. تۆ بڵێی لەو هەموو ئەندامانەی حیزب دوو کەس نە بن لە رووی ئەم رێبەرانە بوەستن و بڵێن :« گەلۆ ئەو جیا بوونەوەتان لە سەر چی بوو؟ ئەو لاوانەتان لە سەرچی بە کوشت دا؟ ئەو هەموو شەڕە جنێو و بوختانەتان بە یەکتر لە گەڵ کام رێ و شوێنی هاو کاری و نەریتی دێموکراسی دەهاتەوە؟ دوو حیزب، بە دوو بەرنامەی جیاواز، لە کام کۆنگرە و کۆنفرانسی جیا جیادا مەسەلەی یەکگرتنەوەیان هێنا بەر باس و لە رۆژنامەکانیاندا نووسیان و بیر و رای ئەندامانیان وەر گرت و بوونەوە بە یەک.؟ رێبەرایەتی شۆرشگێڕ لە کام کۆنفرانس و کۆبوونەوەی گشتی ئەندامانیدا بریاری هەڵوەشاندنەوەی خۆی دا و چۆوە نێو حیزبی دێموکرات.؟ ئەم فۆرمالیتە و ئەم جۆرە کار و سیاسەتە هیچ دەردێکی کورد دەرمان ناکات و جگە لە دابەشکردنی کورسی بە کاری هیچی کورد نایە و منیش هیچ گرنگی پێنادەم.

کاک سەعیدی بەگزادەش هەر ئەو رۆژە بەیاننامەی هاو بەشی دوو باڵی حیزبی دێموکراتی بۆ ناردم، بە خوێندنەوەی بەیاننامەکە لە بۆ چوونی خۆم زیاتر دڵنیا بووم. لام وایە بە تەلەفون بیر و ڕای خۆم لە گەڵ ئەویش باسکرد. ئەوەشم لێ زیاد کرد کە من نەک هەر دژی یەکگرتنەوە نیم، بەڵکوو یەکبوونم پێ لە دوو بەرەکی و لەتبوونی بزووتنەوە گەلێک پێ باشترە. بەڵام من لە روانگەی پرنسیپی حیزبی و سیاسییە وە دەڕوانمە مەسەلە کان و ئەم شێوە یەکگرتنەوەم پێ چاو نووساندنی ئەندامان و بێ پرنسیبیە و بناخەیەکی پتەوی یەکگرتنی نیە و نازانم چۆن لە ڕوویان هەڵدێ پاش ئەو هەموو بوختان بە یەککردنە و شەڕە جنێوە بەرەو ڕووی یەک دانیشن و مەسەلەی کورد لە کوردستانی ئێران چارە سەر بکەن.

**یادی کۆچی دوایی بارزانی نەمر**

رۆژی ١٩٩٧/٣/١ لە لایەن( کومیتەی هاوکاری هێزە سیاسیەکانی کورد و کوردستانی) ئەم نامەیەی خوارەوەم پێگەیشت:« بە رێز ماموستا کریم حسامی!

بە خێر بێن بۆ یادی هەژدەهەمین ساڵرۆژی کۆچی دوایی سەر کردە و ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەکەمان بارزانی نەمرکە لە ڕۆژی یەک شەممەی ڕێکەوتی ١٩٩٧/٣/٢ لە کاتژمێری(٣)ی دوای نیوە ڕۆ لە هۆڵی ( مێد بۆرگار هوسێت) پیرۆز دەکرێت، جا هاتن و بەشداری بوونتان لەم یادە بەرز و پیرۆزە دڵسۆزی و ڕێز لێنانە لە مێژووی خەباتی پڕ شکۆی گەلەکەمان. هەر سەر فراز و سەر کەوتوو بن. کومیتەی هاوکاری هێزە سیاسیەکانی کورد و کوردستانی.»

هەروەها پێیان ڕاگەیاندم کە بەم بۆنەوە وتارێکم هەبێ، بە ڕاستی لەو کاتە کەمە دا دەرەتانی ئەوەم نەبوو کە وتارێکی ئەو تۆ ئامادە بکەم شایانی ئەم یادە پیرۆزە بێت، بیرم لێکردەوە باشترین و جوانترین وتار کە بۆ ئەم یادە بگونجێ، وتاری مام جەلالە کە بە بۆنەی ساڵرۆژی کۆچی دوایی بارزانی نەمر لە کۆبوونەوەی جەماوەری خەڵکی هەولێردا پێشکەشی کردبو لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوی -یش بڵاوی کرا بۆوە. ڕۆژنامەکەم لە لا بوو، تەماشام کرد لەم ماوە کورتەیە دا هیچی لەم وتارە جوانتر و بە پێز تر ناتوانم ئامادە بکەم. وتارەکەم هێندێ کورت کردەوە و لە نورەی خۆم دا بەم چەشنە پێشکێشم کرد

**دەقی کورتکراوەی وتاری ڕێز دار جەلال تاڵەبانی**

«......هەڤاڵان ! خوشک و برایانی خۆشە ویست. ئیمڕۆ هەمووما‌ن پێکەوە لە گەڵ زۆریەی زۆری گەلەکەماندا یادی سەرداری ناوداری کوردەواری بارزانی نەمر دەکەینەوە. یادی ئەو کەڵە پیاوەی مێژووی کوردایەتی دەکەینەوە کە هەموومان بۆ دەیان ساڵ لە ژێر سەرۆکایەتی خۆیدا خەباتمان کرد و بە سەر کردایەتی خۆی شۆڕشمان کردوە لە پێناو ڕزگاری کوردستان و بە دیهێنانی دیموکراسی بۆ عیراق.

بەڵێ ئیمڕۆ کوردستانی خواروو بۆ یەکەمین جار لە جەوێکی ئازاد و دیموکرات دا ماوەی پێدراوە کە ڕێز و تەقدیری زۆر و زەوەندی خۆی دەر بڕێت بۆ بیرەوەری بارزانی نەمر، واتە بۆ خەباتە دوور و درێژەکەی لە پێناو کورد و کوردستاندا.

چونکە جاری جاران لە ژێر دەسەڵاتی حوکمی دیکتاتۆری کورد کوژی بەعسی عەفلەقی دا قەدەغە بوو لە گەلەکەمان ناوی ئەو سەر کردە گەورە و

ئهمرهی خۆی به چاکی بهێنێت. نه دهکراو نه دهبوایه ئهههمییهت و دهوری خهباتی بارزانی ئهمر وهکو خۆی باس بکهین. چونکه کورد کوژه رهفتار فاشیستهکانی بهغدا،بارزانی نه مریان به دوژمنی هەره گەورەی خۆیان و کۆسپی هەره مەزنی ڕێگەی به دیهێنانی سیاسەتی خۆیان دادهنا. سیاسەتی وێران کردنی لادێی کوردستان و تەفرو تونا کردنی کوردەواری و تەعریب کردنی کوردستان.

هەموومان باشمان له بیره که دیکتاتۆری تەکرەوی بەغدا چۆن دوای برانەوەی شۆڕشیش به دەستی خۆی فەرمانێکی نوسیبوو که گوایه ئیتر ببڕا ببڕای ماوه نادات بارزانی ئەمرو کاکه ئیدریسی جوانه مەرگ و کاک مەسعودی تێکۆشەر تەنانەت له ئاوی دجلە و فراتیش بخۆنەوه. جا ئەو هەموو قین و تورەیی و کینەی دوژمن له بارزانی ئەمر بۆ چی بوو.؟ له سەر چی بوو؟ له سەر ئەوه بوو که بارزانی ئەمر باش له جەوهەری سیاسەته شۆڤێنیه کورد کوژەکەیان گەیشتبوو. باش له نیازی گڵاوی دیکتاتوریەتی بەغدا به ئاگا بوو لای ڕوون و ئاشکرا بوو که له سەر دەستی ئەو دیکتاتۆیەته کورد و کوردستان دوچاری چ خەتەرێکی گەوره و مەزن بۆنەوه.

دوایه مام جەلال دەڵێ: جا له بیرەوەری بارزانی ئەمر دا، دڵسۆزی ڕاسته قینەو ئەمەگداریی بۆ ئەو سەرداره گەورەیەی کوردەواری له مه دا خۆ دەنوێنن که ڕێبازەکەی، ڕێبازی شۆڕشی کوردایەتی و دێموکراسی ون نەکراوی و دەرس و پەندەکانی پێویست له خەباته دوور و درێژەکەی هەڵێنجێنرێن و له خەباتی ئیمرۆماندا بۆ خەباتی ئیمرۆمان کەلکی پێویستیان لێ وەر گرین تا دوژمن نه توانێ فریومان دات و به هەڵەمان بەرێت. واته گیانی بارزانی ئەمر ئیمرۆ له بەهەشتی ئەمریدا شان به شانی شێخ مەحمودی ئەمر و قازی محەممەدی ئەمر و شێخ سەعید و سەدان و هەزاران شەهیدی تری کوردستان ئیمرۆ دەبێ ئیلهام بەخشی خەباتی شۆڕشگێڕانه و نه پساوه و دلێرانەمان بن به ئەسرەوتن تا سەر کەوتن، تا ڕزگاری و دێموکراسی ڕاسته قینه.

دەرس و پەنده گرنگەکانیش فێرمان دەکەن که دەبێ یەکێتی ڕیزەکانی کوردایەتی، یەکێتی ڕیزەکانی شۆڕش، یەکێتی ڕیزەکانی بەرەی کوردستانی وەک بیلبیلەی چاوەکانمان بپارێزین. به تایبەتی که زۆربەی حیزب ولایەنەکانی

بەرەی کوردستانیش لە هەمان پارتی یەوە هاتوون کە بارزانی نەمر سەرۆک و ڕێبەری بوە......»

**سێمینارێکی نیوە چڵ لە سەر بار و دۆخی کوردستانی ئێران**

٩٩٧/١/٢٥ لە سەر داوەتی تەلەڤیزیونی( مەد تیڤیێ)بۆ بەشداری لە پانێلێک لە سەر مەسەلە سیاسیەکانی کوردستانی ئێران و یادی کۆماری کوردستان١٩٤٦ چوومە فرۆکە خانەی ئەرلەندە کە بچمە بروکسیل. لە وێ چاوم بە بەرێز کاک سەید حەسەنی شەمس کەوت کە ئەویش بۆ بەشداری لەو پانێلە دا بانگ کرا بوو پێکەوە کەوتینە ڕێ. دیارە( مەد تیڤیێ) حیزبی دێموکرات و دوکتور گول مراد مرادی و کاک خالیدی عەزیزیشی بانگ کرد بوو.

کاتێ گەیشتین کاک باهۆز بە ڕێوە بەری بەرنامە ، بەرنامەی پانێلەکەی داینێ کە بەم جۆرە دارژابوو:

«.. ١٩٩٧/١/٢٦. بەرنامەی پانێلی تایبەت بە ڕۆژهەلاتی کوردستان.

ئامادە و پێشکەش کردنی/ باهۆز

١ ـــ تکایە بە کورتی باسی بار و دۆخی ئەمڕۆی کوردستانمان بۆ بکە

٢ ـــ دوای یەکگرتنەوەی هەر دوو باڵەکەی حیزب، چاوە ڕێ دەکرێت حزب چی ڕۆڵێک بگێرێت لە قۆناغی داهاتو دا.

٣ ـــ چەند ساڵێکە کۆمەلە و حیزبی دێموکرات دیالۆگیان دەست پێکردوە، تا ئێستاش نە گەیشتوون بە ئەنجامێکی کۆنکرێت، ئاستەنگەکان چین ؟

٤ ـــ بۆ چی ڕوناکبیرانی ڕۆژ هەلاتی کوردستان بێدەنگن و بە ژیانی تایبەتی خۆیانەوە خەریکن ؟

٥ ـــ ئەمڕۆ کە مەدیا ناوەندێکی بە هێزێ دەسەلاتە، ئایا بۆ چی کوردی ڕۆژ هەلات ئەوەندە بێدەنگن، بۆ نموونە حیزبێکی وەک حیزبی دێموکرات دوای پەنجا ساڵ تەمەن، مانگ نامەیەک دەر دەخات کە لە چوار چێوەیەکی تەنگ دا بلاو دەکرێتەوە.

٦ ـــ بە رای ئێوە هۆی ئامادە نە بوون و خۆ دزینەوەی حیزبی دێموکرات و ئامادە نە بوونیان بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی جەماوەری کورد چیە ؟

٧ ـــ جیهان لە گۆڕانێکی بە پەلە دایە، بەلام لە گەڵ ئەوەش دا هێزە

سیاسیەکانی ڕۆژ هەڵات بەوە تاوانبار دەکرێن کە خۆیان نوێ ناکەنەوە و لە هەل و مەرجی نوێ کەلک وەر ناگرن، هەن دەڵێن لایەنە سیاسیەکانی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان بێ ئەوەی خۆیان ماندوو بکەن چاوەڕێن ئەو هەلەیان بۆ ڕێک بکەوێت کە بۆ لایەنەکانی باشور ڕێک کەوت، ئەزمری ئێوە لەو بارەیەوە چیە.؟

٨ ـــ کارێگەریی ڕەوشی باشووری کوردستان لە سەر ڕۆژ هەڵاتی کوردستان چیە، هاو کاری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە گەڵ ئێران دا چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

٩ ـــ پەیوەندیتان لە گەڵ هێزەکانی باشووری کوردستان بە گشتی و لە گەڵ( پ. د. ک و ی. ن. ک.) دا بە تایبەتی لە چی ئاستێک دایە؟

١٠ ـــ پەیوەندی لایەنە کوردیە کانی ڕۆژ هەڵات بە ئۆپوزیسیۆنی ئێرانەوە چۆنە، ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی تا چ ڕادەیەک باوەڕی بە ڕەوایی کێشەی کورد و دیاری کردنی چارەنووسی هەیە.؟

١١ ـــ دەکرێت حیزب و کۆمەڵە چی دەرس و ئەزموونێک لە باشوور و باکوور وەر بگرن.؟

٢١ ـــ ئایا ئامادەن لە گەڵ ئێران دا بکەونە گفتگۆوە؟ دامەزراندنی سیستەمێکی فیدراڵی لە ئێران دا چۆن دەبینن؟

١٣ ـــ دەکرێت چاوە دێری سیاسی ڕووداوەکانی کرماشان و دەور و بەری چۆن لێک بداتەوە؟ ئایا دەتوانین بڵێین کە هەستی نەتەوایەتی بە سەر هەستی ئایینی دا زاڵ بوە لەو ناوچانە ؟»

دوای نیوە ڕۆی ئەو ڕۆژە کاک باهۆز هات و گوتی حیزبی دێموکرات فاکسێکی ناردوە و بەشداری پانێلەکە ناکات، هەر چەندە پێشتر بەڵێنیان دا بوو کە بەشداری بکەن. کاک سەید حسەنی شەمس کە وای زانی گوتی پێویستە پرس بە برادەرانی خۆم بکەم. پاش بەینێک کاک سەید حەسەن گوتی: کە وابوو منیش بەشداری ناکەم.

نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ئەم فاکسەی خوارەوەی بۆ تەلەڤیزیونی مەد ناردبوو:

« زۆر بە ڕێز کاک باهۆز !

سوپاستان دەکەم کە تەلەفونتان کرد و پرسەکانتان بۆ ناردووم. بە داخەوە

وتو وێژەکەمان بەو جۆرەی پێشنیارتان کرد، سەر ناگرێ. ڕەنگە بەرنامەکە بەو شێوەیە بۆ ئێوەش و بینەرانی تلویزیونی مێدیش ئەو بەرهەمەی نەبێ کە چاوەڕوانی دەکەن. هیوادارم وا هەست نەکەن کە حیزبی دێموکرات پێی خۆش نیە و نایەوێ لە بەرنامەکانی تلویزیونی ئێوەدا بەشدار بێ. تەنیا لە سەر شێوەکەی ئێمە بۆ چوونێکی دیکەمان هەیە. لە داهاتو دا هەر کاتێک هەڵکەوت ئەمن یا هاورێ یەکی دیکەی ح.د.ک.ئ. بە خوشحالیەوە ئامادەی وتو وێژ لە تلویزیونەکەتان دەبێ و سوپاسیشتان دەکەین.

لە گەڵ سڵاو و ڕێزی دوو بارە، سەر کەوتنتان ئاواتە خوازم میرۆ عەلیار ١٩٩٧/١/٢٥»

دیارە بە ڕێوە بەرانی(مێد تێڤێ) پانێلەکەیان لە سەر بەشدار نەبوونی کۆمەڵە و حیزبی دێموکرات پەک نەخست. ڕۆژی ١/٢٦ باسێکی چڕو هەمە لایەنە لە سەر بار و دۆخی کوردستانی ئێران و یەکگرتنەوەی دوو باڵی حیزبی دێموکرات و کۆماری کوردستان و ئەزمونی ئەم ڕووداوە گرنگە بەڕێوە چوو کە دوکتور گولڕاد مرادی و کاک خالیدی عەزیزی و کەریمی حسامی وەڵام پرسیارەکانی باهۆز یان دایەوە. ڕۆژی دوایی بۆ ستۆکهۆلم گەڕامەوە.

**سێمینارێک لە سەر ماف و هوویەتی کورد**

کۆمەڵەی(سویدی بۆ دیفاع لە مافی کورد): کۆمەڵەیەکە بۆ ئەم مەبەستە لە لایەن چەند زانا و کەسایەتی سویدی و هاو نیشتمانانی کورد لە ماڵمۆ دامەزراوە و لەم بارەوە هەنگاوی جۆر بە جۆری هاویشتوە. لام وایە لە چەند شارێکی دیکەی سویدیش کۆمەڵەی ئەوتۆ تێکۆشانیان هەیە. کۆمەڵەی ناو براو داوای لێکرد بووم کە بۆ باسێک لە سەر مافی کورد و ڕێگای پاراستنی لە ٩٩٧/٢/١٦ بچمە ئەو شارە.

ڕۆژی ٢/١٥ سواری قەتار بووم و لە لایەن کاک شاهۆ ئەردەلانەوە لە ماڵمۆ پێشوازیم لێکرا. کاک شاهۆ جگە لەوەی کە ئەندامی کۆمەڵەکە بوو. بەڕێوە بەری ڕادیوییێکی مەحەللی کوردیش بوو کە ڕۆژی شەمۆیان بە کوردی دەنگ و باس و بابەتی جۆر بە جۆری جوان بڵاو دەکاتەوە. کاک شاهۆ بێ ئەوەی لێ بگەڕێ تێر بحەسێمەوە ڕاکێشی کردم بۆ رادیو کە وتو وێژم لە گەڵ بکا و

بیانوشی ئەوە بوو کە خەڵک دەیبیستێ و زیاتر لە کۆڕی بەیانیدا بەشدار دەبن.
کاک شاهۆ دە پرسیارانی گرتم ولە خوام دەویست دەرباز بم. بۆم دەر کەوت دەرباز بوون لە دەست برایانی کوردسانی (سنە) هەر وا هاسان نیە. ئێوارە کاک شاهۆ بە میوانداری ( کوردسانی) و بە قسەی خۆش و سەر گوزەشتەی خۆی و یادی بزووتنەوە و رۆژانی رابردوو، هیلاکیی ڕێگای لە بیر بردمەوە. من کتێبەکانی خۆم بۆ برد بوو، ئەویش درنگتر ئەم نامەی خوارەوەی بۆ نووسیبووم:
« ماموستای بە ڕێز و خۆشە ویست کاک کەریمی حسامی! ئەم کاتەتان باش و سڵاوی منتان پێشکەش. هیوادارم ساغ و سڵامەت و تەندروستی بەر دەوام میوانتان بێت. دەمێکی کورتی هاو دەمی ئێوە، دەرگای دنیایەکی قووڵی بە ڕوومدا کردەوە، چوونە ناو نووسراوەکانتان بەرینی ئەو دنیایەشی سەلماند و زۆر کاری تێم کرد، لە دیدارەکەتان بەملاوە بەشی زۆری خوێندنەکانم کتێب و نووسراوەکانی جەنابتانە، کە بە خۆشی یەوە کەمیش نین. هیوا دارم تەمەنتان درێژتر و قەڵەمتان بە کار تر و بەرهەمتان زۆرتر و بە پیت تر بێت.
بەرگی هەشتی بیرەوەریەکانتانم کە تەواو کرد، هەستم بەوە کرد کە هەر کوردێک ئەم بەرهەمە بە نرخانە دەخوێنێتەوە وەک فارس گوتەنی ئەگەر ئەمەک شناس بێت، ئەبێ لە دڵەوە سوپاستان بکات، سوپاسی ئەو هەموو بیر تیژی و دوا ڕۆژ بینی و ئەو دەس پێکەری و ڕچە شکاندنەتان، ڕچە شکاندنیکی پڕ بەهرە بوو، پەیتا پەیتا بیرەوەری بە دوای خۆیدا هێنا گۆڕێ، وەلامی نامەیەکتان بۆ کاک غەنی (٨٦/٩/١٠) لە بەرگی ٩ دا هەژاندمی و وەقرەم نەگرت تا دو بەرگەکەی تر کۆتایی پێ دێت. وەکوو کوردێک کە هەست بە پێویستی هەبوونی ئەو گەنجینە بە نرخە لە مێژووی گەلەکەیدا دەکات و شانازی بە لێهاتوویی و دلسۆزیتان، ئەرکی خۆم دەزانم پڕ بە دڵ سوپاستان بکەم، ئاواتە خوازیم کە تەمەنی هەر چی قسە زلی بێ عەمەلە کەم بێتەوە و بخرێتە سەر درێژەی ژیانی پڕ بەهرە و بە نرخی ئێوە.
لە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکان دوو پرسیارم لا ساز بوو، یەکیان ئەگەر چی لە بەرگی هەشت دا زۆر بە ڕوونی وەلام دراوەتەوە ، بەلام هەر مێشکم ئاسوودە نیە و هەر دەپرسم، کاک کەریم بەو هەموو نارازیە لە سیاسەتی حیزب چۆن

دەستی نەداوەتە جیا بوونەوە و دامەزرانی ڕێکخراوەیەکی تر، ئەوی تریش هێندێ بە سەر هاتن کە کەسانی تر جۆرێکی تر نووسیویانە.(دوو وشە نەخوێندرانەوە) جواب داوەتەوە. مەلاش ئەگەر کەس بێ، هەر حەرفێکی بەسە، ئاڵە کۆکیش خۆ هەمو خەریکن پێی پێ ئەکەن، ڕاتانم بەرانبەربە نووسراوەی سەعید کوێستانی نەدیوە. پڕ بە دڵ چاوە ڕوانی بەرگی ١١ی بیرەوەرییەکان و بەرگی دووی پێداچوونەوە دەکەم لە گەڵ بادانەوە کە بیرتان کرد بوو. سڵاو و ڕێزم بۆ خەجیج خان کە بێ گۆمان خۆشە ویستی و یارمەتی ئەوان لە ژیانی پڕ بەهرەی ئێوەدا بێ شوێنەوار نیە. ئازەر و منداڵەکان زۆر سڵاو و ڕێزیان هەیە و بیرەوەری دیتنتان قەت لە بیر ناکەن، برات هومایون ئەردەڵان شاهۆ. ٩٧/٧/١٧»

ڕۆژی ٩٧/٢/١٦ سێمینارەکە بە بەشداری کۆمەڵێکی زۆر لە برا کوردەکانی دانیشتووی لوند و مالمۆ بە وتاری سەرۆکی کۆمەڵەی سویدی دیفاع لە مافی کورد کرایەوە. لە بەر ئەوەی سویدییەکان کۆبوونەوەیان پێک هێنا بوو، ئەندامانی سویدی کۆمەڵەش بەشدار بوون، برادەرێکی کوردیان دیاری کرد بوو کە قسەکانی من بکات بە سویدی.

لە سەر پێشێل کردنی مافی کورد لە لایەن حکوومەتانی دەسەڵاتداری کوردستان و کەم و کوڕی پاراستنی مافی ئینسان لە لایەن کورد خۆشییەوە و لە بەر چاو نەگرتنی ماف و هویەتی کورد لە لایەن دەوڵەتانی ئوروپاییشەوە بە درێژی قسەم کرد. تامی ئاخافتنەکەی خۆم ئەو دەمی چێشت کە سەرۆکی کۆمەڵە هەستا پەسنی قسەکانی دام و پشتی پێشنیارەکەمی گرت و پێخۆشبوونی خۆی لە بۆ چوون و لێکدانەوەکانم دەر بڕی. لە قسەکانمدا پێشنیارم کرد کە کۆمەڵەی سویدی دیفاع لە مافی کورد لە مالمۆ دەست پێشخەری بکا لە گەڵ کۆمەڵەکانی تری سویدی. گوشار بخەنە سەر دەوڵەتی سوید کە لانی کەم لە بواری دان پێدانان بە هویەت و ناو ونیشانی کورد، ڕێز لە مافی مرۆڤی کورد بگرێ و کوردەکانی بە کوردستانی بناسێ و پاسپۆرت ویسولەی ئیقامەت و پەنابەریان بە ناوی کورد بداتێ. چونکە دەوڵەتانی ئوروپاییش بە وە کە کوردەکان بە خەڵکی کوردستان ناناسن و بە ناوی کورد بەڵگە و دوکومینتی مانەوەیان نادنێ، مافی کورد پێشێل دەکەن.

له نێو ئاخافتن و باسی مافی مرۆڤ و پێشێل کردنی مافی نەتەوەیی و ئینسانیی کورددا، یەک دوو برادەری کوردی عیراقی خەریک بوون شەڕی کوردستانی عیراق بێننه نێو سێمینار و پرسیان: بۆ چی باسی شەڕی کوردستانی عیراق و تاوانباری شەر ناکەی.؟ گوتم: برا گیان! کۆمەڵەی سویدی منی بۆ باس له سەر مافی کورد داوەت کردوه، ئێوه که دەتانەوێ باسی شەڕی کوردستان بکەن، سێمینارێک بۆ شەڕه دندوکه ساز بکەن و هیچ ئەنجامێکیشی نابێت.»

مەلایەکیش که له دەست حکوومەتی ئیسلامی خومەینی ڕای کرد بوو و پەنای بۆ کافران هێنا بوو، و دەیانگوت ماموستا ٨ــ٧ سەر خاو و خێزانی هەیه و پێنج فەرزەش له مالێدا بانگ دەدا و به جەماعەت نوێژ به منداڵەکانی دەکات، هاته نێو باسەکه و فەرمووی:.. قسەکانت زۆر باش بوون، بەڵام بۆ چی نەتگوت: ڕێگای ئازادی کورد هەر ئیسلامه و کورد دەبێ بۆ ئیسلامەتی پاڵ وێک بدا و لەم ڕێگایەوه رزگار دەبێ.»

گوتم: ماموستا له گەڵ ڕێزم بۆ بیر و باوەڕت، بەڵام من له گەڵت نیم. پێم وانیه کورد له ڕێگای ئیسلامەوه ئازاد دەبێ. کورد ئەوه نیه ١٤٠٠ ساڵه به زۆره ملی هێناویانەته سەر ڕێگای ئیسلام و له نوێژ و ڕۆژوانیش کورتی نەهێناوه و هێشتا هەر بندەست و دەچەوسێتەوه و نەک هەر ئازاد نه بووه، بەڵکوو گێژیش کراوه.

ماموستا به دڵەوه پێی داگرت که میوانی بم و هەستم کرد بێ موجامەله و به دڵ حەز دەکا میوانی بم. بەڵام کاک جەلال دەباغ میواندارییەکی کوردانەی ساز کرد و نەک هەر ماموستا بەڵکوو کۆمەڵێک برادەریشی بۆ خواردن و خواردنەوه داوەت کرد و شەوێکی خۆشمان بردە سەر.

### سەفەر بۆ دانیمارک

ڕێکخراوی پارتی دیموکراتی کوردستانــــ یەکگرتوو له کۆپنهاک و له ئارهوس بۆ سێمینارێک له سەر یادی ساڵرۆژی کۆچی دوایی بارزانی نەمر داوەتیان کرد بووم. ڕۆژی ٦/٣/٩٧ سواری فڕۆکه بووم بۆ دانمارک. له فڕۆکه خانه برادەرێک به ناوی موسا چاوه ڕوان بوو، هەر لەوێ سوار بووین بۆ

ئارهوس و میوانی مەدحەت سولەیمان بووین. من پێشتر لە لهستان مەدحەتم دەناسی، کوڕێکی جوامێر و مەرد و ڕەند بوو. بۆ هاتنی شلێری کچم بۆ سوید یارمەتی دابوو، دۆستایەتیمان بەر دەوام بوو.

ڕۆژی ٩٧/٣/٧خەڵکێکی زۆر لە کۆڕی یادی کۆچی دوایی بارزانیدا بەشداریان کرد بوو. دوای وتاری من لە سەر دەوری مەلا مستەفا لە بزووتنەوەی ڕزگایخوازی کورد دا، بەشداران بە پرسیار و بۆ چوون و دەر بڕینی بیر وڕا و بیرەوەری کۆڕیەکەیان گەرم کرد و لە کەش و هەوایەکی دۆستانەدا دانیشتنەکە کۆتایی هات.

ڕۆژی دوایی لە گەڵ موسا گەڕاینەوە بۆ کۆپنهاک و ڕۆژی ٣/٩ سیمیناری یادی بارزانی تەمر دەست پێکرا. کۆمەڵێکی زۆر لە کوردەکانی دانیشتووی کۆپنهاک بەشداریان کرد بوو. بۆ من زۆر خۆش و جێگای ڕامان بوو کە دوو برادەری ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هاتن و گوتیان: لە لایەن کومیتەی حیزبی دیموکراتەوە لە دانمارک بە خێر هاتنت دەکەین. لە گەڵ سوپاس بۆ ئەو برادەرانە ئەم کارەیان هیوایەکی لە مرۆڤ دا پەیدا دەکرد. کە بەستەڵەکی مێشک و دەروێشایەتی لە نێو ئەو ڕێکخراوەیە و لە نێو ئەندامانی خوارەوەی فیداکاری حیزب وا دێت بەرە و توانەوە دەچێ ، ئەندامی حیزب، خۆی بیر دەکاتەوە و مەیدانی تێگەیشتن و هزری بەرینتر دەبێ. بە هیوای ئەو ڕۆژە هەر چەند ئاسۆیەکی ڕوون لەم بارەوە بەدی ناکەم و ناشزانم کە داخوا لە سەر ئەم هەنگاوە پیرۆزە لە حیزب دەر کراون یانا.

**یادی بۆمبارانی هەڵەبجە**

٩٧/٣/١٦ لە سەر داوەتی کۆمەڵەی کوردی لە ئۆرێبرۆ بۆ باسێک لە سەر بۆمبارانی کیمایی هەڵەبجە چووم ئەو شارە. بەڕێوە بەرانی کۆمەڵەی کوردی کۆڕێکی زۆر جوان و ڕێک و پێکیان ڕێک خستبوو. لە سەرەتاوە دەستەیەک زارۆکی ٧ــــ٨ ساڵە بە سرودی ئەی ڕەقیب کۆڕەکەیان کردەوە. پاش وتاری کاک بهروزی کورد ئەحمەدی سەرۆکی کۆمەڵە. من بە پێچەوانەی هەموو ئەم بۆچوون و وتارانە کە ماوەی دە ساڵ لە سەرکارەساتی هەڵەبجە گوتراون و نووسراون و تەنیا شین گێڕان بوە، هەولم دا بە گوێرەی زانیاری و بۆچوونی

خـۆم هۆیەکـانی بابەتـی ئەم کـارەسـاتە روون بکەمـەوە، وەک دەوری سـوپای پاسـداران و نە بوونی سـتـراتیـژی و تاکـتـیکی زانسـتـی شـەڕ لە لایەن هێـزە چەکدارەکـانی کـوردسـتـانی عـیراق و هێنانی پاسـداران و ئەرتەشـی ئێران بۆ کوردستانی عیراق و کەلک وەرگرتنی حکوومەتی جەمهوری ئیسلامی لە قەلاچۆ کردنی خـەڵکی هەڵەبجە لە بواری پڕوپاگاندە و تەبلیغاتەوە. لەم بارەوە بەڵگە و نووسـراوەی جـۆر بە جـۆر هەن و بەلام تا ئێسـتـا لێکۆڵینەوەیەکی زانسـتـی و بابەتی لە سـەر هۆیەکـانی کـارسـاتی هـەڵەبجـە نەکـراوە. ئەمـەش یەکێ لە تایبـەتمەندییـەکـانی کـۆمـەڵی کـوردەوارییـە کـە لە توێژینەوە و لێکدانەوەی ڕووداوەکـان هەر لایەکی مـەسـەلەکـە دەبینێ و هـەمـوو لایەن و هۆکـار و سەبەبەکانی ڕووداوەکە نا خاتە بەر باس و روونیان ناکاتەوە تا دەرسیان لێ وەر بگـیـرێ و بە تایبـەت جـارێکیش بەلای هەڵە و کـەم و کـوڕی حـیـزبە سیاسییەکانی خۆجێییدا ناچێت ئەگەر ڕوویاندابێ. ڕێکخراو و کۆمەڵە و تاقمی جۆر بە جـۆری کورد هەڵەبجەیان کردۆتە عاشـوڕای شـیـعـە سـاڵە و سـاڵ لەم ڕۆژەدا بە دەسـتـە و کـۆمـەڵە و ڕێکخـراوی جـیـاوازی لێکدابڕاو کـۆ دەبنەوە و سـێمـینـار پێک دێنن و و لە گـەڵ عـاشـوڕا فـەرقـەکـەی هەر ئەوەندەیە کـە لە سنگیان نادەن و دەستەی ناگێڕن. بێ ئەوەی ئەو کۆبوونەوە و سێمینارانە ی لە سـەر هەڵەبجـە دەگیرێن، تۆزکاڵێک سود و فـایدەی بۆ مـەسـەلەی هەڵەبجە و بۆ لێـقـەومـاوانی هەڵەبجـە بـووبێت، لە قـسـە بەدەر هـیـچی بە دواوە نـەبوە. ئەو دە دوازدە سـاڵە نەیانتـوانیـەوە هەڵەبجە ئاوەدان بکەنەوە، نـەیانتـوانیوە بۆ هێنانە گۆڕی مەسـەلەی هەڵەبجە و دادگایی کردنی حکوومەتی بەعسی جنایەتکار کۆڕ و کـۆمـەڵی نێـو نەتەوایەتی هان بدەن. نەیانتـوانیـوە منداڵەکـانی پاشـمـاوەی بۆمبارانی هەڵەبجە لە هەژاری و بێکەسی و نەخۆشی نەجات بدەن. فایدەی ئەو سێمینارو کۆ بوونەوانە هەر ئەوەیە مەیدان بۆ هێندێ کەسانی هەلپەرست والا دەبێ کـە گـۆیا باسی هـەڵەبجـە دەکـات. باسـێکی ناڕاست و دوور لە دەربڕینی ڕاسـتی هۆیەکـانی کـارساتی هـەڵەبجـە. بە بۆچوونی من تـا ئەو کـاتەی ئێمـە ڕابردووی خۆمان بە جوانی و بە ڕاستی نەخەینە بەر توێژینەوە و هەڵە و کەم و کوڕییەکانمان بە ڕاستی و بوێرانە نە خەینە بەر نەشتـەری ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و تەنیا شانازی بە کردەوەکانمان بکەین، هەمیشـە مـەترسی ئەوە هـەرەشەمـان

لیدەکات کە بکەوینەوە زەلکاوی هەڵەکانی رابردوو، و هەر لە سەر هەڵە و ناتەواوییەکان بڕۆین و شین و گریانی عاشوراش هیچ دەردێک دەرمان ناکات.

۹۷ /۳/۱۹ کۆمەڵەی کورد و کۆمەڵەی ئاشتی لە مالمۆ بڕیاریان دابوو بە بۆنەی ۵۰ ساڵەی لە سێدارە دانی پێشەوا قازی محەممەد سەر کۆماری کوردستان و هاوڕێیانی کۆڕێک رێک بخەن و داواشیان لە من کرد بوو کە بەشداری ئەم یادە داخدارە بکەم. کۆمەڵێکی زۆر لە کوردەکانی دانیشتووی لوند و مالمۆ، حیزب و رێکخراوە کوردییەکان بەشداریان کردبوو. نوێنەرانی حیزب و رێکخراوە کوردییەکان بەم بۆنەوە وتاریان هەبوو. من لە وتاری خۆمدا لە سەر کەسایەتی کولتوریی و سیاسی و زانایی و کۆمەڵایەتی پێشەوا قازی محەممەد و کارەساتی دادگای داتاشراو و دیفاعی قازی محەممەد بە درێژی باسم کرد و وەڵامی پرسیاری هاو نیشتمانانی بەشدار بووم دایەوە.

لە میانەی ئەم سەفەر و دیدارانە دا، خەریکی تەواو کردنی بەرگی دووەمی پێدا چوونەوەش بووم و ژیانی رۆژانەم بە نووسین و خوێندنەوە بردۆتە سەر و بە هاتنی چار و بار دۆست و برادەران و سەر دانیان حەساومە تەوە.

### دادگای میکۆنوس و حیزبی دێموکرات

۱۹۹۷/۱/۱ دادگای بێرلین ناسراو بە دادگای میکۆنوس بە بڕیاری مەحکووم کردنی بکوژانی دوکتور شەرەفکەندی و هاوڕێیانی و تاوانبار کردنی رێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران، پاش پێنج ساڵ کۆتایی بە کاری خۆی هێنا. هێزەکانی ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی، بە تایبەت هێزی موجاهیدین بەم بۆنەوە خۆپێشاندانێکی گەورەیان ساز کرد. ئەوەی دەوری نەبوو لەم خۆپێشاندانەدا و نەیتوانی کەلکی تەبلیغاتی لێ وەر بگرێ، هەر حیزبی دێموکرات بوو هەر وەک کەسی لێ نەکوژرابێ و خۆی بە خاوەنی مەسەلەکە نەزانێ.

لە گەڵ کاک حەمەدەمینی سراجی سەبارەت بە بڕیاری دادگای بێرلین دەقێکمان نووسی و بە هەڵکەوت بۆ شایی کیژی کەریم حەداد داوەت کرابووین لەوێ گەلێک لە برادەران و رۆشنبیران ئیمزایان کرد و لە رادیۆکانی کوردی ستۆکهۆلم خوێندرایەوە. ئەمەش دەقی نووسراوەکەیە کە لێرەدا دەنووسرێتەوە:

« دادگای بیرلین ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران ڕیسوا دەکا.

ڕۆژی پێنجشەمۆ ١٩٩٧/٤/١٠ دادگای بیرلین پاش نیزیکەی پێنج ساڵ، بە دەر کردنی بڕیاری مەحکووم کردنی بکوژانی ڕێبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و تاوانبار کردنی ڕێبەرانی دەرەجە یەکی کۆماری ئیسلامی ئێران کۆتایی بە کاری خۆی هێنا. دادگای بیرلین ئەو کەسانەی خستبوە ژێر دادگا کە بە ناوی ڕێبەری مەزهەبی ولایەتی فەقیە و سەر کۆمار و وەزیری حکوومەتی ئیسلامی ئێران ترۆر و ڕەشە کوژی نەیارە سیاسیەکانی خۆیان لە دنیادا ڕێبەرایەتی دەکرد. ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران بە هاو دەستی گۆڕە گۆنەپەرستەکانی حکوومەتی ئەڵمان هەوڵێکی زۆریان دا کە قازیەکانی دادگای بیرلین لە ڕێگای دادپەروەری هەتڵە بکەن و خوێنی دوکتور شەرەفکەندی و هاوڕێکانی هەر وەک خوێنی دوکتور قاسملو لە ئوتریش و بەختیار لە فەرانسە و نە یارەکانی دیکەی ترۆر کراو بکەنە بارمتەی سەودا و پێوەندی بازرگانی و ڕەشە کوژی و جینایەتەکانی خۆیان درێژە پێبدەن. بەڵام داوەرەکانی دادگای بیرلین نە چوونە ژێر بار و بە دەرکردنی ئەم بڕیارە ڕەوایە ڕێز و ئیحترامی کۆمەڵانی خەڵکی جیهانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا.

بڕیاری دادگای بیرلین ئیتر گومانی لە وەدا نەهێشتەوە کە کۆماری ئیسلامی ئێران ماکەی ڕەشە کوژی و لە ناو بردنی ئازادیخوازانی ئێرانە. دەوڵەتانی ئورووپایی کە سەبارەت بە بەرژەوەندی ئابوری و بازرگانی لە ئاست ئەو هەموو جینایەتەی ڕێبەرانی حکوومەتی ئیسلامی ئێران چاویان دەپۆشی، پاش دادگای بیرلین باڵیۆزەکانی خۆیان لە تاران بانگ کردۆتەوە. ئەم کارە لە بەرانبەر کردەوەی ڕەشە کوژی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤی ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامیدا هەنگاوێکی سەرەتاییە. ئێمە هاو دەنگ لە گەڵ هەموو ئازادیخوازانی ئێران داوا دەکەین کە حکوومەتی ئیسلامی ئێران لە بواری سیاسی و بازرگانی و ئابورییەوە بایکوت بکرێ و دەوڵەتانی ئورووپا بە کردەوە بە دنیا نیشان بدەن کە دێموکراسی و مافی مرۆڤ و داد پەروەری فیدای بەرژەوەندی ئابوری ناکەن.

بڕیاری دادگای میکونوس دەرفەتێکی باشی بۆ هەموو نیشتمانپەروەرو ئازادیخوازانی ئێران پێکهێناوە کە بیرو ڕای گشتی جیهان و کۆڕو کۆمەڵە

دێموکراتەکانی نێو نەتەوەیی بۆ مەحکووم کردنی ڕێبەرانی دیکتاتور و ڕەشە کوژی حکوومەتی ئیسلامی ئێران هان بدەن تاماوەی مانەوە و سەرەڕۆیی ئەم تاوانبارانە کۆتایی پێ بدرێ. بڕیاری دادگای بیرلین ئەو دەرفەتەشی پێکهێناوە کە داوا بکرێ ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی بە تاوانی کوشتاری هەزاران کەسی دێموکرات و ئازادیخواز لە دادگایەکی نێو نەتەوەییدا موحاکەمە بکرێن.

با ئەنجامی دادگای میکونوس ببێتە هاندەری بەرز کردنەوەی داوای ڕوخانی حکوومەتی خوێنڕێژی کۆماری ئیسلامی ئێران و هاتنە سەر کاری حکوومەتێکی دێموکرات و داد پەروەر و پێشکەوتو خواز لە ئێراندا.

کۆمەڵێک ڕوناک بیری نیشتمانپەروەرونازادیخوازی کوردلە سوید،١٢/٤/ ١٩٩٧.

**چیرۆکی کتێبی، ئازادی یا مەرگ، نووسینی نیکۆس کازانتزاکیس**

ماوەیەک بوو ئەم کتێبە م کرد بوو بە کوردی. بە داخەوە دەرەتانی ئەوەم نە بوو کە چاپی بکەم. ئەگەر کورد لە دەرەوە کتێب نە خوێنێتەوە و ڕۆژنامە نەکڕێ و لەم ڕێگایەوە یارمەتی بە پەرەگرتنی چاپ و بڵاو بوونەوەی نووسراوە و ڕۆژنامە نووسانی کورد نەکات، ئیتر نووسەر و وەرگێرو ڕۆژنامە نووسی کورد، زەحمەتە بتوانی خزمەتی ئەدەبی و کولتور و زمانی کوردی بکات و ئەرکی خۆی بەجێبگەیێنێت.

بەڵێ. کتێبە کەم کرد بە کوردی و بە داتا نووسیمە وە و لە وێم دانا. خەبەرم بۆ هات کە لە سایەی ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵک لە کوردستانی عیراق و پاشان هەڵبژاردنی پارلمان و حکوومەتی فیفتی- فیفتی یەکێتی نووسەرانی کوردیش کۆنگرەی گرتوە و زیندوو بۆتە وە. کتێبە کەم لە گە ڵ نامە یە ک بە دیاری بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد نارد کە بۆخۆیان چاپی بکەن و بیفرۆشن و نامەکە ی منیشی لە پاشکۆدا بڵاو بکەنە وە. زۆری پێنە چوو نە یەکێتی نووسەران ما و نە کتێب چاپکرا. سوپاسی بەڕێز مامۆستا مومتاز حەیدەری دەکەم کتێبەکەی لە فەوتان ڕزگار کرد بوو لای خۆی گلیدابۆوە و پاراستبووی. منیش لە چاپکردنی ناهومێد بووم. تا لە مانگی پێنجی ١٩٩٧ ئاگادارییەکی وەزارەتی ڕوشنبیری حکوومەتی هەرێمی کوردستان-م پێگەیشت. ئەمەش دەقی

ئاگادارييەكەيە:

« بۆ بە ڕێز كەریمی حسامی.

دوای سڵاو ڕێز: ئاگاداری بە ڕێزتان دەكەینەوە كە وەزارەتی ڕوشنبیری بڕیاری داوە بەم زوانە گۆڤارێكی وەرزیی تەرخانكراو بۆ وەرگێڕان لە ئەدەبیات و هونەر و ڕوشنبیری بێگانە بڵاو بكاتەوە. گۆڤارەكە لە ١٢٠ لاپەڕەدا، بەشێكی ڕەنگاو ڕەنگ، تەرخان دەبێت بە ڕوشنبیری و ئەدەبیات و زانست و هونەرە جۆرا و جۆرەكانی بێگانە. ئاواتە خوازین كە جەنابتان بە زووترین كات بە ناردنی تێكست و لێكۆڵینەوە و بابەتی تەرجەمە كراو لەو زمانەوە كە شارەزاییتان لێی هەیە، هاوكاریمان بكەن.........

فەلەكەدین كاكەیی - وەزیری ڕوشنبیری. هەولێر: ١٩٩٧/٥/١٣

ئەم ئاگادارییە هومێدێك بوو بۆ ئەوەی بەڵكوو بكرێ جار و بار مرۆ بەرهەمێكي بەكەلك بخاتە سەر كتێبخانەی كوردی. هەر بەو هیوایە ئەم فاكسەی ژێرەوەم بۆ مامۆستا فەلەكەدین كاكەیی نارد:

« برای بەرێز و هێژا كاك فەلەكەدین!

لە گەڵ سڵاوی برایانە! نامەكەتان گەیشت، زۆر سوپاس. بێگومان ئەوەی لە توانامدا هەبێ بۆ هاوكاریتان درێخی ناكەم.

بۆ ئاگاداریتان پتر لە سێ ساڵە كتێبی (ئازادی یا مەرگ) نووسینی( كازانتزاكیس)م كردوە بە كوردی و بە داتا نووسراوەتەوە و لە لای بە ڕێز مامۆستا مومتاز حەیدەری خەوی لێكەوتوە. دەتوانم تكای برایانە لە دەزگای ڕوشنبیری حكوومەتی هەرێمی كوردستان بكەم كە چاپی بكات و داهاتەكەشی هەر پێشكێش بە وەزارەتی ڕوشنبیری دەكەم. ڕەنگە لە گەڵ سوپاس بتوانم چاوەڕوانی هیمەتی وەزارەتی ڕوشنبیری و هەنگاوی ئەدەب دۆستانەی جەنابتان بم بۆ چاپكردنی ئەم بەرهەمە بە نرخە. براتان كەریمی حسامی. ٩٧/١١/١٥

بەڕێز وەزیری ڕوشنبیری لە وەڵامی نامەی مندا، ئەم نامەیەی خوارەوەی بو ناردم:

هەولێر ١٩٩٧/١٢/٦

برای خۆشەویست كەریمی حسامی / سوید. سڵاوی برایانە !

سوپاس بۆ نامەکەت (بەرواری ١٩٩٧/١٢/٢) و کتێبی ( پێداچوونەوە – بەشی دووەم) کە ئەمڕۆ بە دەستم گەیشت. هەر وا فاکسەکەی پێشووتان گەیشت. پشتگیریتان لە چالاکی و کۆششی وەزارەت مایەی دڵگەرمی و خۆشحاڵیمانە. بە داخەوە کە بەرهەمەکان بە جەنابتان نە گەیشتوون. تەقەلایەکمان داوە و هەوڵ دەدەین بە پێی ئەم دەرفەتە خزمەتی کەلتوری نەتەوەکەمان بکەین.

– پیرۆز بایبتان بۆ دەنێرم کە لەم چەند ڕۆژەدا ڕۆمانی( ئازادی یا مەرگ)ی بەرێزتان لە ژێر چاپ دەر دەچێت کاک ممتاز حیدری پار ساڵ بە ئێمەی ڕاگەیاند و ئێمەش ( لە وەزارەت) ئەو ڕۆمانەمان خستە سەر لیستی چاپکراوەکانمان، لە وەزارەتی دارایی هەرێم ڕازی بوون تا خەرجی تەواوی بخەنە ئەستۆ. زۆر سوپاس کە مافی چاپکردنی ڕۆمانەکەتان بە وەزارەت بەخشیوە. ببوورە کە پێش وەرگرتنی ڕەزامەندیتان، خستمانە بەر چاپ.

– تا ئێستا خەرجی(٢٧) کتێب لە سەر ئەرکی وەزارەتی ڕوشنبیری پەسند کراوە، (١٨)لەم کتێبانە لە چاپ دەر چوە و پاشماوەی لە ژێر چاپدایە. بە گشتی نزیکەی(٩٠)دەستنووسی دیکە لە بەر دەستی لیژنەی چاپی وەزارەتە بۆ بڕیار دان. هەر وەها وەزارەت(٨)گۆڤاری وەرزی و مانگانە و هەفتە نامەیەک دەر دەکات.

– خۆشحاڵین کە بەرهەمێکی دیکەمان بۆ بنێرێت تا ساڵی تازەی زایینی ١٩٩٨ چاپی بکەین، بە تایبەتی دەستنووسەکەتان دەر بارەی ڕوشنبیری(لوڕ) و مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید. هەر شاد و سەر کەوتووبن.

برات فلک الدین کاکەیی.

مزگێنیەکی خۆش بوو. زۆر بە پەرۆش بووم بۆ چاپکردنی ئەم ڕۆمانە. نەک هەر لە بەر ئەوە زەحمەتم پێوە کێشا بوو، بەڵکوو لە بەر ئەوەش کە نێوەرۆکی ئەم ڕۆمانە زۆر شتی لە گەڵ خەباتی ڕزگاریخوازی کورد وێک دەچێ و لە زۆر شوێن خوێنەر چیاو کەژ و کەش و هەوای کوردستانی دێتە بەر زەین ناتوانێ واز لە خوێندنەوەی بێنێت. حەزم دەکرد هەر وەک دایکی ماکسیم گۆرکی بە تێکۆشانی من هاتە نێو کتێبخانەی کوردی، ئەم ڕۆمانەش کەلێنێک لە کتێبخانەی کوردی پڕ کاتەوە. ئەوە بوو بە دوای وەر گرتنی نامەی مامۆستا

فەلەکەدین دا. ئەم نامەیەی خوارەوەم لە گەڵ وەرگێڕاوەی کتێبی ( مەسەل و مەتەڵۆکی لوڕی) بۆ نارد

« بە ڕێز و هێژا مامۆستا فەلەکەدین ڕۆژ باش!

لە پێشدا لە گەڵ پیرۆز بایی نەورۆز و بەهاری کوردەواری، لە کانگای دڵەوە سڵامەتی و سەر کەوتنتان بە ئاوات دەخوازم. لە حەفتە نامەی( ڕێگای کوردستان)دا چاوم پێکەوت کە بە هیممەتی ئەدەب دۆستیت و دڵسۆزیت بۆ وشەی کوردی، کتێبی(ئازادی یامەرگ)چاپکراوە. بە ڕاستی مزگێنیەکی لە ڕادە بە دەر خۆش و شادی هێنەر بوو. چونکە زەحمەتێکی زۆرم لە گەڵ کێشا بوو، و سەبارەت بە نێوەرۆکی شۆڕشگێڕی کتێبەکە، بە ئاوات بووم چاپ بکرێ و بکەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی کورد. بە ڕاستی یەک دنیا سوپاست دەکەم. سوپاسی ئەو کەسانەش دەکەم کە لە چاپکردنیدا زەحمەتیان کێشاوە. گەلێک سوپاسی مامۆستا موەمتاز حەیدەری دەکەم کە وا چەند ساڵ پاراستوویەتی تا گەیاندوویەتە کتێبخانەی کوردی و سەر پەرشتی لە چاپدانیشی کردوە.

دیارە تکای برایانەشم لە جەنابت هەیە کە هەر وەک بۆ چاپکردنی باسکت هەڵماڵیوە، کارێکی ئاواش بکەی چەند دانەیەک بگاتە دەستم و چاوم پێ ڕوون بێتەوە. خۆت دەزانی زۆر خۆشە مرۆڤ لە شتێک چێژ وەر بگرێ کە بە ڕەنجی خۆی هاتۆتە بەرهەم. لە سەر داوای خۆت ئەوا وەرگێڕاوەی کتێبی(مەسەل و مەتەڵۆکی) لوڕی- ت بۆ دەنێرم. هیوادارم لە سایەی تێکۆشانی ئێوەی بە ڕێزەوە، ئەویش بکەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی کورد و گۆشەیەکی بچوک لە کتێبخانەی کوردی داگیر بکا. با ئەوەیش بڵێم کە ئەم کتێبەم بە بەرنامەیەکی کۆنی داتا نووسیبۆوە و بە پێویستم نە زانی دەستکاری بکەم. ڕەنگە لە کەسێکی وەک منیش هەر ئەوە هەڵبوەرێ.

لە گەڵ ڕێزی دوو بارەم، سەر کەوتنتان ئاواتە خوازم. برات، کەریمی حسامی. ٩٨/٣/٢٥

بەڵی بە تاسەوە چاوە ڕوان بووم کە وەزارەتی ڕوشنبیری لە پاداشی زەحمەتی مندا دوو سێ دانەم لە کتێبە کە بۆ بنێرێ. چاوە ڕوانی و هیواکەم بێهودە بوو. تا برادەرێک بە پیاوەتی خۆی دوو دانەی بۆ هێنام. تەماشام کرد کتێبەکە ئەتک کراوە. وەک ئەو سانسۆر چیانەم هاتە بەر چاو کە لە وڵاتەکانی

دیکتاتور زەدە و بیر خنکێنەردا، ئەگەر ڕۆژنامە یەک شتێک دەنووسێ و بە کەیفی سانسۆرچی نیە، و یا کتێبێک دەر دەچێ چەند دێرێکی واقعیەتی تێدایە و بەڵام لە گەل بیرو بۆچوونی دام و دەزگای دەسەڵاتدار نایەتەوە، گورج فەرمانی ڕاگرتن و کۆ کردنەوەی ئەم نووسراوانە دەر دەچێ و بڵاو ناکرێتەوە، تا ئەو دێرانەی کە بە گوێرەی بۆ چوونی سانسۆر چی بۆ پەز زیانیان هەیە، ڕەش دەکرێتەوە. کتێبەکەی من بەم دەردە چوو بوو. دیارە لە پێشدا بە ڕێک و پێکی چاپکراوە. پاشان مەعلوم نیە بۆ چی و بە چ بیانوێک. نامەی من و نامەی مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی- کە وا لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا چاپکراوە. لە لاپەڕەی یەکەم دڕاندویانە و لێیان کردۆتەوە.

دیارە ئەوەشیان پێ کەم بوە و هاتوون پێشەکی نووسینەکەی منیان بە قەڵەم ڕەش کردۆتەوە. ئێستا خوێنەر کە ئەم کتێبە دەبینێ، بیر لە وە دەکاتەوە و دەڵێ: دەبێ کەریمی حسامی چ کوفرێکی کردبێ و چی نووسیبێ کە حکوومەتی کوردستان و دەسەڵاتی کار بەدەستانی وەزارەتی ڕوشنبیری خستبێتە مەترسی و ئەگەر ڕەش نە کرێنەوە و خەڵک بیان بینێ هەرای لێ ساز دەبێ. جا بۆ ئەوەی خوێنەری کورد خۆی بە ڕەش کراوە کەی پێشەکیەکەی منەوە هیلاک نەکات، خۆم ئەم وشە رەشکراوانە لە ژێر نووکی قەڵەمی سانسۆرچی بیر خنکێنەر دێنمەوە دەر و دەقەکەیان دەنووسمەوە.

کازانتزاکیس لە ڕۆمانەکەدا دواکەوتووی موسڵمانان باس دەکا و دەڵێ: .. قەبری( ڕێبەری پیرۆز)لە تابوتێکی داردا بە مەڕ مەڕ ڕوو کێش کرابوو، مێزەری بەردەکە کون کرا بوو موسڵمان پارەیان تێداویشت و داوایان لە پیری پیرۆز دەکرد کە لە دنیا و قیامەت کاریان ڕاست بێنێ.»

منیش نووسیومە ئێستاش لە کوردستان سەدان چاک و پیری ناپیرۆز بەردیان لە دەوری کۆ کراوەتەوە و داریان لە سەر چەقاوە و پەڕۆ و پاڵیان پێوە هەڵاوەسراوە و ناوی ئەسحابەیەکی کورد کوژیان لێناوە، دەچنە سەریان و داوای مراد و مەقسودیان لێ دەکەن»

سانسۆرچی وشەی(ناپیرۆز) و(ناوی ئەسحابەیەکی کورد کوژی) ڕەش کردۆتەوە. سانسۆر چی بەم کارە ناشیانەیە ویستوویەتی مێشکی کورد لە ئاخری سەدەی بیستەم دا بە مادەی دواکەوتوویی و کۆنە پەرستی بپەستێوێ و

وارشـــە بەردێک کــە لە ســـەر ڕێگای کــۆچ و کــۆچبــاران، خــەڵک لە بەر تێنەگەیشتووی دوو چیلکە داریان لێ چەقاندوە و لە وانەیە کردبیانەتە نیشانەی کار و مەبەستێکی خۆشیان و هێندێ پەڕۆشیان پێوە هەڵاوەسیبن، بە پیرۆز و موقـەدەسی بزانن، کــە ئەوە لە گــەڵ دینی ئیسـلام و شـەرعی مـحـەممەدیش نایەتەوە. ئەگەر بە یەکێک لەو چاک و پیرە ناپیرۆزانە بگوترێ ( ئەسحابەی کورد کوژ) بۆ کوفرە.؟ ئەسحابەی کە پێکەوە خۆ بە خۆ هەزار کەسیان لێک کوشتوە، ئەوەی پێغەمبەریان سەر بڕیوە، ئە گەر من بلێم هاتوون بۆ تاڵان و ڕاو وروت کــوردیان کــوشـتــوە، چ زیانێک بە دام و دەزگــای گـۆیا دەســەڵاتی کــورد دەگەیەنێ.؟ تازە بە چی دەزانن کە ئەوە ئەسحابەیە ( مراد و مەقسودی) خەڵک حاسڵ دەکات.؟

بێجگە لەوە من نووسیـومـە:«زۆر لە مـەلاکـانی کورد بـە پێچـەوانەی خـەلیـفـەی خاچ پەرستان بێ ئەوەی بیر لە کوردستان و نیشتمانیان بکەنەوە، جارێ خەڵک بۆ بەهـەشت و ڕزگـاری لە جـهـەندەم ئامـادە دەکـەن» سـانسـۆر چی هـاتوە ئەم وشانەی نێـو کەوانەی ڕەش کـردۆتەوە(جـارێ خـەڵک بۆ بەهەشـت و ڕزگـاری لە ئاگری جهەندەم ئامادە دەکەن).ئێستا دەکرێ لەو سـانسـۆڕ چیە بپرسین، ئەم دێڕە بۆ ( ئەزمـونی دێمـوکـراسـی کـوردســتـان) و بۆ ( کـابینـەی سـێـیـەمی حکوومـەتی کـوردسـتـان) زیاني چي هەیە؟ بۆ سـانسـۆڕ چي پێي وایە هەمـوو مـەلاکـانی کوردسـتـان هەموو کات ذیکر و فیکریان هەر ئازادي کـوردسـتـان و نیشتمـانی داگیر کراوە.؟ بۆ کەم هەبوون و کەم هەن ئەو مـەلایانەی کە شە و ڕۆژ باسی عـیـبـادەت و بـەهەشت و جـهـەندەم بۆ خـەڵک دەکـەن و ژیانیـان لە خزمەتی دیکتاتۆر و زاڵم و داگیرکەرانی کوردستـاندا دەبەنە سـەر. بۆ کەم بوون ئەو مەلایانەی خەڵکیان لە ئاگری جهندەم دەترسـاند و فەرمـانی ئیعدامی قازی مـحـمەد پێشەوا و سـەر کۆمـاری کوردستـانیـان ئیمزا دەکرد.؟ ئەوانە هەمـوو لە جێگای خۆی. بە گـوێرەی کـام ئوسـوڵی ئەخـلاقی و کـولتـوری و ( ئەزمـونی دێموکراسی کە لە کوردسـتان زۆری باس دەکەن) سانسـۆڕ چیەک ڕێگا بە خۆی دەدا، نووسینی کـەسێکی تر ڕەش کـاتەوە و بیـر و ڕا و بۆ چوونی کـەسێکی تر قـەڵەم بە سـەر بکێشێ.؟ من لام وایە سـانسـۆڕ چی زانیـویە تی کـە ئەم وشـە ڕەشکراوانە هیچ زیانیان بۆ پەز نیە. بەڵام ویستوویە شـوێنەواری سیستـەمی

رژیمی دیکتاتوری بەعس لە نێو دام و دەزگای دەسەڵاتی کوردی دا کوێر نە بێتەوە و لانی کەم ئەوەندە دەسەڵاتی خۆی نیشان بدات کە خەڵک بزانێ کوێخایەتی لە سەر بیر و هزر و قەڵەمی نووسەران هەر ماوە و دنیا بێ دەر و دەروازە نیە. ئێستا من هەر بیر لە وە دەکەمەوە و دەڵێم: تاکەی سانسۆڕ و تا کەی کوێخایەتی لە سەر بیر و هزر و قەڵەمی نووسەران ، ئەویش لە لایەن وەزارەتی روشنبیریەوە. سەعدی شیرازی بە خۆڕایی نەیگوتوە:« هرچە بگندد نمکش میزنند _ وای بە روزێ کە بگندد نمک»»

بە دوای دیتنی کتێبە ئەتک کراوەکەدا، ئەم نامەی خوارەوەم بۆ مامۆستا فەلەکەدین نارد:

« بە رێز مامۆستا فەلەکەدین وەزیری روشنبیری. رۆژ باش !

دوای سڵاو و رێزی برایانە. بە نابەدڵی، بەڵام بە ناچاری ئەو چەند دێڕەت بۆ دەنووسم و سەر سوڕ مانی خۆم لە کردەوەی نا پەسندی وەزارەتەکەتان رادەگەیێنم.

پاش وەر گرتنی نامەی ٩٩٧(٥/١٢ ی جەنابت، هومێدم پەیدا بوو کە وەزارەتی روشنبیری کورد، لە بواری چاپ وبڵاو کردنەوە دا ئەرکی روشنبیری سەر دەم بە جێ دەگەیێنێ، بە تایبەت بە بوونی تۆ لە سەرووی وەزارەتەکە ئەم هیوایە بە هیز تر دەبوو.

هەر لە سەر ئەم هیوایە بوو کە کتێبی«ئازادی یا مەرگ » م پێشکێش بە وەزارەتە کە تان کرد و خۆم پێم وابوو خزمەتێکی پچووکم بە وشەی کوردی و بە وەزارەتی روشنبیری کردوە. پاش ماوەیەک لە رۆژنامەی رێگای کوردستاندا چاوم پێکەوت کە کتێبەکە چاپکراوە. لە گەڵ شاد بوون بەم خەبەرە هیواداریش بووم کە وەزارەتی روشنبیری لە پاداشی ئەو زەحمەتەی مندا، هەر نە بێ دوو سێ دانەم لە کتێبەکە بە دیاری بۆ دەنێرێ کە کارمەندی وەزارەتەکەش کەمیان نە هاتوونە سوید. دیارە بە زانیاریەکی لە سەر دام و دەزگای ئیداری و بە رێوە بەرایەتی کوردم هەیە، وازم لەو هیوایە هێنا و دەم زانی کاری ئاوا لە دەست وەزارەتی روشنبیری و کارمەندانی نایە.

برادەرێک بە پیاوەتی خۆی دوو دانەی لە کتێبەکە بۆ هێنام، بە راستی نەک هەر لە کارەکەی خۆم پەشیمان بوومەوە، بەڵکوو هیواکەشم بۆ گەشە کردن و

بەرەو پێش بردنی کولتوری کوردی بە هەوا دا چوو. لە وانە دزێوتر و قەباحەتر سانسۆری وەزارەتی روشنبیرییە لە سەر نووسینی پێشەکی کتێبەکە و لا بردنی ئەو نامەیە ی کە بۆ جەنابتم نووسیوە وکتێبەکەم پێشکێش بە وەزارەت کردوە و وەلامی جەنابیشت کە بۆ منت ناردوە.

مامۆستای بە رێز! هەر چەندی بیر دەکەمەوە نازانم وەزارەتی روشنبیری و یا کەسێکی تر و دەستەیەک بە چ مافێک رێگا بە خۆی دەدا کە قەڵەمی رەش بە سەر نووسینی کەسێکی دیکە دا بێنێ و دوو سێ خەتی لێ رەش بکاتەوە و ئابرووی بەرێ. من ئەو نامەیە وەک گلەیی بۆ جەنابت دەنووسم مانای ئەوە نیە کە رێگای ئەوە بگرێ وتارێکی زۆر توند لە سەر کردەوەی سانسۆرچیەتی وەزارەتی روشنبیری کورد نە نووسم و لە رۆژنامە بێ سانسۆرەکانی دەرەوەدا بلاوی نەکەمەوە. تا کەی سانسۆر و تا کەی کوێخایەتی لە سەر بیر و هزر و قەڵەمی خەڵک. خۆشیتان ئاواتمە برات کەریمی حسامی ١٩٩٨/١١/١٥

**مامۆستا مەلا خدری سارتکێ**

رۆژی ٩٧/٥/٢١ خوا لێخۆشبوو بە رێز مامۆستا مەلا خدری سارتکێ( عەبباسی) لە گەڵ کاک خەلیلی کوڕی بە سەردانم شادیان کردم. مامۆستا مەلا خدر لە بەر نەساغی نارەحەت بوو، دەبوایە دوکتور ببینێ. چاولێکردنی دوکتور لە سوید بۆ نەخۆشی میوان و موسافیر باسی سەرە. لام وایە هەولێکیان دابوو، دوکتوریان وەگیر نەکەوتبوو پێوە نارەحەت بوون. تەلەفونم کرد بۆ دوکتورێکی کوردی برادەرم، وەک پیاوان گوتی هەر ئێستا وەرن، چووینە خەستە خانە، تەماشای کرد و دەرمانی بە ناوی من بۆ نووسی و دەرمانەکەمان وەر گرت و مامۆستا هەستی بە حەسانەوەیەکی روحی کرد.

هاتینەوە ماڵێ، هێندێ باسی بار و دۆخی کوردستان و سەردەمی پێشووی تێکۆشان و بەندیخانەی سالانی ٦٠ ــ ٦٤ی کرد کە مامۆستاش سێ ساڵان زیندانی کێشا بوو. پاشان گوتی:« تۆ ئاڵە کۆکت خوێندۆتەوە؟ هەر چەند خوێند بوومەوە عەرزم کرد هێشتا نەمدیوە. گوتی: « ئەوە غەنی بلوریان بۆ وای کردوە، گورە خۆ هەر چی نووسیویەتی هەو نیە. ئاخر ئێمەش لە زیندان بووین و دەزانین لە سەر ناسیونالیسم و تودەیی چ هەرایەکیان لە زیندان ساز کرد

بوو. دکتور عەلی مەولەویان بە ناسیونالیزم دەزانی و تێیان هەڵپێچا بوو. غەنی بلوریان و عەزیزی یوسفی خۆیان بە تودەیی دادەنا. لە کاتێکا بە قەدرایی هەموان دوکتور عەلی مەولەوی خزمەتی بە زیندانیان دەکرد. زۆر کەسی فێری برینپێچی و دەرزی لێدان و خزمەتی سەرەتایی نەخۆشان کرد. خۆ لە وانەی ئاگایان لە کارەساتی زیندان هەیە ، هێشتا زۆر ماون خۆ درۆی پاش مردوو نیە.» گوتم زۆر کەسی دیکەش نووسینەکەی غەنی بلوریان بە هۆندنەوەی خەیاڵ دەزانن تەنانەت ئەوانەی تووشی کەتنەکەشیان کردبوو گاڵتە بە ئاڵە کۆک دەکەن. پاشان هەموو نووسراوەکانی خۆم پێشکێش کرد و گوتی:« دیارییەکی بەنرخە دەیانبەمەوە بۆ کوردستان، زۆر کەس ئارەزووی خوێندنەوەیان هەیە. »
ماموستا مەلا خدر سەرەڕای ئەوەی نەخۆش بوو دەیتوانی بمێنێتەوە و معالەجە بکات، بەڵام لە ئوروپا گیر نە بوو بۆ نێو کوڕی خەبات و نێو منداڵەکانی دەگەڕێتەوە، بەڵام بە داخێکی گرانەوە هەرلە بەغدا خەبەری کوشتنی کورەکەی بە دەستی تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی کوردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا پێدەگات. کوڕی ماموستا مەلا خدریش دەچێتە ریزی ئەو تێکۆشەر و ئازادیخوازانەی کوردستانی ئێران کە لە کوردستانی عیراق و لە ژێر دەسەڵاتی هێزە سیاسییەکانی کوردی کوردستانی خواروو دا بە ناهەق تیرۆر کراون .

ماموستا مەلا خدری سارتکێ سەبارەت بە نەخۆشیەکەی ، دوای ئەم کارەساتە جەرگ برە، بۆ عیلاج و داو و دەرمان دێتەوە نێرویژ .

رۆژی ١٧/١٠/١٩٩٧ لە گەڵ کاک حامیدی گەوهەری و کاک حەمەدەمینی سراجی بۆ سەردانی مامۆستا مەلا خدری سارتکێ چووینە نێرویژ. مامۆستا لە خەستە خانەی ئۆسلۆ زۆر نارەحەت بوو. بە چوونی ئێمە تۆزێ هاتەوە سەر خۆ. هەستاوە پاڵدانەوە و نانیشی خوارد و گوتی ئەوە هاتنی ئێوە وای کرد نان بخۆم دەنا چەند رۆژە هیچم نەخواردوە، پاشان بەم نەخۆشییە هاتە سەر باسی بار و دۆخی داخداری کوردەکانی کوردستانی ئێران لە سولەیمانی و ئەو کوردانەی لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی یەکێتی نیشتمانی دا ترۆر کراون. نیزیکەی سێ سەعات لە لای دانیشتین و نەیدەویست بە جێی بێڵین. شەو چووینە سەردانی کاک جەلیلی گادانی و رۆژی دوایی گەڕاینەوە.

زۆری پێنەچوو خەبەری کۆچی دوایی مامۆستا مەلا خدرمان پێگەیشت. ئەمجارە رۆژی ٧/١١/ ٩٧ لە گەڵ چەند برادەر ماشێنێکی گەورەمان گرت و بۆ بەشداری لە ماڵاوایی کردن لە مامۆستا مەلا خدر چووینە ئۆسلۆ. لە هەموو شارەکانی سوید هاونیشتمانانی کوردستانی ئێران هاتبوون مالاوایی لەم تێکۆشەرە ولەم کەسە خۆش نێو و ناسراوە بکەن. ناشتنی مامۆستا مەلا خدر لە نێو داخ و کەسەری هاونیشتمانانی ئاوارەی دا بە رێ و رەسمێکی جوان بەڕێوە چوو. رێکخراوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران مەراسمێکی جوانی پێک هێنابوو. زۆر کەس لە دۆست و ناسیار و تێکۆشەران بە وتاری جوان و دڵسۆزانە ماڵاواییان لێکرد. شانازی وتارێکی کورتیش لە سەر خەبات و کەسایەتی مەلا خدر بەسیبی من بوو. مامۆستا مەلا خدری سارتکێ لە کوردستانی ئێران بە کەسایەتیەکی تێکۆشەر و نیشتمانپەروەر و خۆش ناوی مەڵبەند ناسرا بوو. پێشینەکی درێژی لە خەبات و تێکۆشاندا هەبوو، چەند ساڵان کەوتبوە زیندان و تووشی ئەشکنجە و ئازاردان هاتبوو. هەر چەندە ڕابردووی خەباتی لە ڕیزی حیزبی دێموکرات دا بوو هەر بە تاوانی ئەندامەتی ئەو حیزبەش گیرا بوو، بەڵام لەم دواییانەدا چووبووە ڕیزی ڕێکخراوی خەباتی مەلا شێخ جەلال و پاشان ناکۆکی لەو ێشدا سەر هەڵدەدا و مامۆستا مەلا خدر سەرۆکایەتی دەستەیەکی تری خەباتگێڕ دەگرێتە ئەستۆ و درێژە بە تێکۆشان دەدات و هەر بۆیەش دەکەوێتە بەر قین و غەرەزی شەیتانی پاسداران و تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی لە سلێمانی و کورەکەی شەهید دەکرێ. ڕەوانی شاد و یادی زیندوو بێت.

**باسێک لە سەر کۆنگرەی نەتەوەیی**

کومیتەی پەیوەندی پارلمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات ١٩٩٧/١١/٥ ئەم فاکسەی ژێرەوەی بۆ ناردم:

بروکسل. کومیتەی پەیوەندی.... بەروار: ١٩٩٧/١١/٥

بە رێز کەریمی حسامی

هەر وەکو دەزانن دەمێکی درێژە خەبات بۆ یەکێتی گەلی کوردستان و

دامەزراندنی دەزگایەکی نەتەوەیی بەر دەوامە.

کومیتەی پەیوەندی بە خۆشیەوە ئێوەی بە ڕێز ئاگادار دەکات کە لە ڕۆژانی ١٣ـــ١٤ی مانگی ١١ی ١٩٩٧ کۆبوونەوەیەکی فراوان بۆ نوێنەرانی پارت و دەزگا و ڕێکخراو و ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار و هونەرمەندانی کورد و کوردستان ساز دەکا.

ئامانجی ئەم کۆبوونەوەیە پێشخستنی پرۆسەی کۆنگرەی نەتەوەیی و هەڵبژاردنی کومیتەیەکی ئامادە کارە. بەشدار بوونی ئێوەی بەرێز لەم کۆبوونەوەیەدا خزمەتێکی گرنگە لەم ڕێگە پیرۆزەدا و جێ بە جێ کردنیشی ئەرکێکی نەتەوەیی پێویستە. بە هیوای بەشداریتان وێڕای ڕێز و سڵاومان..
کومیتەی پێوەندی، ناو و نیشانی پەیوەندی گرتن: فاکس تەلەفوون........ »

لە سەر ساز کردنی کۆنگرەی نەتەوەیی من بیر و بۆچوونی خۆم هەیە و باسیشم کردوە. پێم خۆش بوو لەم کۆبوونەوەیەش دا بەشدار بم و بیر و ڕای خۆم ڕابگەیێنم. بە داخەوە نەخۆشی دەرمتانی سەفەری پێنەدام و نەمتوانی بەشداری بکەم. پاش چەند ڕۆژ دوای ئەم کۆبوونەوەیە لە ستۆکهۆلمـــ یش بۆ باس لە سەر کۆنگرەی نەتەوەیی و کۆبوونەوەی بروکسل کۆبوونەوەیەک ساز کرا و هاو نیشتمانانی بەشدار بوو بیرو ڕای جیاوازیان لە سەر ئەم مەسەلەیە دەر بڕی. من ( بەیاننامەی کۆتایی کۆبوونەوەی بروکسل)م پێگەیشتبوو. بە پێویستم زانی لە سەر ڕووناکی نێوە ڕۆکی بەیاننامەی کۆبوونەوە، بیرو ڕای خۆم بەم چەشنی خوارەوە دەر ببڕم:«... ماوەیەکە، لانی کەم لە ساڵی ١٩٩٥ەوە تێکۆشان بۆ پێکهێنانی کۆنگرەیەکی نەتەوەیی لە ئارا دایە و چەند کۆبوونەوەشی لە سەر کراوە. دیارە هەنگاو نان بۆ مەبەستێکی ئاوا پیرۆزە. بەڵام دە بینین ئەم تێکۆشانە نەک هەر بە ئاکام نەگەیشتوە، بەڵکوو شەڕ و کورد کوشتنی زیاتری بە دواوە بوە. ناکرێ شەڕی کورد کوژی لە کوردستان بەر دەوام بێ و لە ئورووپاش هێندێ کەس کۆ ببنەوە و بڵێن کۆنگرەی نەتەوەیی پێک دێنین. بیر کردنەوە لەم مەسەلەیە و تێکۆشان بۆ نەهێشتنی شەڕی کورد کوژی و هەوڵدان بۆ تەبایی و یەکیتی نێوانی هێزە سیاسیە سەرەکیەکانی کورد لە هەموویەشەکانی کوردستان لە قۆناخی ئێستادا ،ڕەنگە هەنگاوێکی لە بارتر بێ.

بە بۆچوونی من کۆنگرەی نەتەوەیی کورد دەبێ لە ژێر تەئسیری حیزبێکی

سياسي بە دوور بێ. دەبێ لە كەسانی زانا و سياسي و حقوقي و فەرهەنگی كورد پێك بێ و حيزبە سياسيەكان بە گشتي لە هەموو بارێكەوە پشتيوانی لێ بكەن، نەك بيكەنە گۆپاڵی دەستی خۆيان. تاقيكردنەوەی خەباتی گەلی كورد و رووداوەكانی كوردستان نيشانيان داوە كە تەقەلا و كۆششی حيزبە سياسيەكان سەرەڕای ئەوە كە هەموويان باسي كوردايەتی و كوردستانيەت و مافی نەتەوەيی دەكەن، بە كردەوە تەنيا لە چوار چێوەی سياسەت و بەرژەوەندی تەسكی حيزبيی خۆياندا دەجوڵێنەوە.

بە بڕوای من ئەركی روشنبيرانی ئازاديخواز و نيشتمانپەروەر ئەوەيە كە بە وردی لەم مەسەلەيە بكۆڵنەوە. سياسەت و كردەوەی نەتەوەيی هەموو حيزبەكان هەڵسەنگێنن و نە بن بە دەسكەلای فلان رێبەر و فلان سەر كردەی سياسي.

بمانەوێ و نەمانەوێ سياسەتی دوو بەرەكی و كورد كوژی هێزەكانی ناوەوەی كوردستان كاری كردۆتە سەر رووناكبيران و سەر جەم كوردەكانی ئاوارەی ئوروپاش. با خۆمان فريو نەدەين. تەماشايەكی بەرهەمی كۆبوونەوەی فراوانی ئەم دواييەی بروكسل بكەين و بزانين هەڵوێست و بۆچوونی بەشدار بوانی ئەم كۆبوونەوەيە تا چ رادەيەك دەگەڵ كوردستانی بوون يەك دەگرێتەوە. هەموو بەرهەمی دانيشتن و ئەنجامەكەی بۆتە مادەی چواری بەياننامەكە كە( بە تێكڕايي دەنگ رژيمی توركيا مەحكوم دەكا. داخيش دەر دەبڕێ كە پارتی ديموكراتی كوردستانی عيراق هەموو پرنسيپێكی مرۆڤايەتی لە ژێر پێ ناوە.) هەر دووكيان بڕياری باشن. بەڵام ئەوە جێی پرسيارە كە كۆبوونەوەی ئامادە كردنی كۆنگرەی بروكسل:

ــــ بۆچی داخ لەوە دەر نابڕێ كە پارتی كرێكارانی كوردستان لە جياتی شەڕ لە توركيا، شەڕی خستۆتە كوردستانی عيراق و دەيەوێ ئەم نيمچە دەسەلاتەی كورديش لە وێ تێك بدات.

ــــ بۆ چی رژيمی كۆنە پەرستی ئێران مەحكوم ناكات كە ترۆر و رەشە كوژی كوردی بۆ دەرەوەی ئێرانيش پەرە پێداوە.

ــــ بۆ داخ لە وە دەر نابڕێ كە لە ژێر دەسەلاتی يەكێتی نيشتمانی دا پتر لە سەد ئازاديخوازی كوردستانی ئێران ترۆر كراون.

ــــ بۆ چی رژيمی بەعسی عيراق مەحكوم ناكات كە جگە لە كيميا باران و

ئەنفالی کوردستان، ئێستا وا خەریکە کەرکوک و خانەقین لە کورد پاک دەکاتەوە.

ــــ بۆ چی رژێمی بەعسی سوریا مەحکوم ناکات کە پتر لە یک میلیون کورد، ناوێرێ وشەی کوردی بە سەر زمانی دابێت و بڵێ کوردم و هەم.

لام وایە کومیتەی ئاوا و کۆنگرەی ئاوا و سیاسەتی ئاوا، بۆیە دەبن کە روناکبیرانی ئازادیخواز و ئازاد، پتر بیری لێ بکەنەوە.»

لەم ناوەیە دا پاش دواکەوتنێکی زۆر بەرگی دووی پێداچوونەوە چاپ کرا و هێندێکم وەر گرتەوە. یەک لەو نووسراوانەی من بوو کە پێشوازیەکی جوانی لێکرا و داواکاری زۆر بوو. لە لایەن برادەرانی پارتی کارگەرانی کوردستانی تورکیاوە دوو کارتی داوەتیان بۆ هێنا بووین کە لە شەوی واندا بەشداری بکەین.

٢٩/ ١١/٩٧ لە شەوی پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا کە بە بۆنەی دامەزرانی حیزبەکەیانەوە ساز کرا بوو لە گەڵ دایکی کەمال چووین بەشداری بکەین.

منیش پێنج دانە کتێبی بەرگی دووی پێداچوونەوەم لە گەڵ خۆ برد کە لە وێ دایان بنێم بەڵکوو بفرۆشرێن. ئەوەش باو بوو هەموو جارێ کە شەوێکی وەها و یا سێمینارێک دەبێ، نووسەران کتێبی خۆیان دەبەن دادەنێن. برادەرانی ( پە. کا.) کتێبیان دانا بوون و دەیان فرۆشت. منیش گوتم با ئەو کتێبانەی منیش لێرە بن و ئەگەر کەسێک ویستی بیاندەیە.

کابرا گوتی: نابێ. « ئەم تەنێ کتێبی خۆ دادەنێین.»

زۆرم پێ سەیر بوو. پێم وابوو ئەو کەسەی لە وێیان داناوە، ئاگای زۆر لە داب و رەسمی کۆمەڵایەتی نیە. چووم برادەری مەسئولم دیتەوە کە دەیناسیم و پێم گوت: بۆچی ئەو برادەرە رێگای نەدا ئەو کتێبانە لای ئەو دابنێیم.؟

گوتی: هەڤال ئەم تەنێ کتێبی خۆ دادەنێین.

گوتم زۆر سەیرە. ئەوە کتێبی کوردییە، چۆن ئێوە رێگا نادەن کتێبی کوردی بێتە فرۆشتن.؟

گوتی ئەو بریاری مەیە.

راستی دەکرد. ئەوە بریاری ئەو هێزە بوو کە داوای دەکرد و دەیگوت : کورد

هەموو یەکە و گۆیا بۆ ئازادی هەموو کوردستانیش خەبات دەکات. کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستانیش نەزانانە بە هەوای ئەم سیاسەتە هەڵدەپەڕن. جا وەرە ئەو حیزبە دەسەڵاتی بکەوێتە دەست و کوردستان ئازاد بکا!!!

**سەفەر بۆ ئیتالیا**

کاک شۆڕش عەزیز سورمێ بە ناوی کۆمونتای کورد لە ئیتالیا بە نامەیەک لێی گێڕامەوە کە بۆ بەشداری لە سێمینارێک بە ناوی ( کوردستانی بێ ماف) کە لە لایەن شارەوانی شاری ڤێنیزیاوە پێک دێت. دوازدەی مانگی دیسامبری ٩٩٧ بچمە ئیتالیا. لە گەڵ داوەتنامەکە، بلیتی فرۆکەشی بۆ نارد بووم. هەر لەو کاتەش دا کاک سەعیدی بەگزادە داوای لێکردم کە بۆ یادی ساڵرۆژی کۆچی دوایی کاک نەبی قادری ڕۆژی ١٤ مانگی دوازدە بچمە دانمارک و بەم بۆنەوە وتاریشم هەبێ. بە کاک سەعیدم گوت کە وا بۆ ئیتالیا بانگ کراوم و لە وانەیە بێ ڕانەگەم کە بێمە دانمارک، هەر چەندی بەشداری لە یادی ساڵرۆژی کاک نەبی قادری بە ئەرکێک دەزانم.

کاک سەعید گوتی دەبێ وا بکەی بلیتەکەت بۆ بگۆڕن و دە بێ بێیە دانمارک. چار نەبوو. هەر چەند دەمێک بوو لە چنگ ( سانترالیزمی دێموکراتیک) حیزبی و دەروێشایەتی دەر باز ببوم و بە فیکری خۆم بیرم دەکردەوە، بەڵام ڕێز گرتن لە کاک سەعید ی بەگزادە و بەشداری لە ساڵرۆژی کۆچی دوایی کاک نەبی قادری وای لێکردم کە تەلەفون بۆ کاک شۆڕش بکەم. بلیتی فرۆکەم بۆ گەرانەوە بۆ بگۆڕێ کە ڕۆژی ١٤/١٢/ سەعاتی یەک لە دانمارک بم. کاک شۆڕش خەبەری دامێ کە بلیتەکەمان گۆڕیوە و ڕۆژی ١٤ سەعاتی ١٢ لە کۆپنهاگ دەبی.

ڕۆژی ١٢/١٢/ ٩٩٧ گەیشتمە شاری میسترا لە ئیتالیا. کاک شۆڕش لە فرۆکەخانە چاوە ڕوانم بوو، چووینە هوتێل ( پۆلۆکینا) کە ڕێزێرڤ کرابوو. دوکتور کەمال میراودەلی و یای خەجۆش بۆ بەشداری لە سێمینارەکە، داوەت کرابوون. شەو بە بەر نان خواردنەوە تا سەعاتی یەک هێزەکانی سەرەکی کوردستانی عیراق کەوتنە بەر پەرەی هەلاجی بە شێوەیەکی بێ ئینسافانە و هێندێ جاریش بازاڕیانە و دوور لە مەنتیق و دوور لە بۆچوونی زانستیانە.

رۆژی ١٣/١٢ چووینە ڤێنیزیا و تۆزێ بە ناو ئەم شارە جوان و مێژووییە دا گەڕاین و کوردێکی کرماشانی پیتزە فرۆشمان دیتەوە بە قسەی خۆشی کرماشانی ڕایگرتین و پیتزە یەکی خۆشی دەر خوارد داین. دوای نیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ میسترا کە شوێنی سێمینارەکە بوو. کۆبوونەوەکە بە بەشداری کۆمەڵێکی زۆری ئیتالیەکان دەست پێکرا. کورد زۆر کەم بوون و دەیانگوت لەم شارە بە گشتی کورد کەمن.

کۆبوونەوە بە وتاری خانم.... سەرۆکی شارەوانیەکانی ڤێنیزیا سەبارەت بە مەسەلەی کورد و سیاسەتی دەوڵەتی ئیتالیا کرایەوە. من وتارەکەی خۆم بە دوو بەش جیا کرد بۆوە، بە کەلک وەر گرتن لە وتارێکی گۆڤاری سروە ، لە سەر پێوەندی مێژوویی بازرگان و گەڕیدەکانی ئیتالیی لە گەڵ کوردستان و گەلی کورد باسێکی کورتم پێشکێش کرد کە کاک شۆرش دەیکرد بە ئیتالی. لە باسی سەرەکی سێمینارەکەدا، لە گەڵ سوپاس بۆ شارەوانی ڤێنیزیاو کۆمۆنتای کورد لە ئیتالیا گوتم: سێمینارەکە بە ناوی« کوردستانی بێ ماف» ناو دێر کراوە. من لام وایە باشترە ناوی سێمینارەکە بە( کوردستانی خاوەن ماف) بگۆڕین. چونکە کوردستان و نەتەوەی کورد وەک هەموو نەتەوەکانی ئەم جیهانە مافیان هەیە. کورد مافی ئەوەی هەیە کە خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات. زمان و ئەدەبیات و کلتورو داب و نەریتی نەتەوایەتی خۆی ببووژێنێتەوە و بەرەو پێشی بەرێ. شێوەی ژیان و بەرێچوونی خۆی دیاری بکا. دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی دابمەزرێنێ. لە کانگای سروشتی وڵاتی خۆی بۆ پێشخستنی زانست و تەکنیک و ژیانی ئینسانی خۆی کەلک وەر بگرێ. لە هەموو ئەم مافانە کەلک وەر بگرێ، کە لە بەیاننامەی مافی مرۆڤ دا هاتوە و لە لایەن کۆمەڵی نەتەوە یەککرتوەکانیشەوە پەسند کراوە. کوردستان خاوەنی ئەو مافانەیە، بەڵام مافی لێ داگیر کراوە. سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە مافی کورد وە نەبێ هەر لە لایەن دەوڵەتانی تورکیا و ئێران و عیراق و سوریا وە داگیر کرابێ، بەڵکوو دەوڵەتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریش لە پێشێل کردنی مافی نەتەوایەتی و ئینسانی کورد دا، بەشدارن و دەستیان لەو زوڵم و ناهەقیە دا هەیە کە لە کورد کراوە و تا ئێستاش لە کۆتایی سەدەی بیستەم دا درێژەی هەیە.

بە بۆچوونی من تاوانی دەوڵەتە پێشکەوتوەکانی سەرمایەداری، لە

دابەشکردن و ژێر دەست کردنی کورد و کوردستاندا، له تاوانی تورکیاو ئێران و عیراق و سوریا کەمتر نیە. چونکه دوای شەڕی یەکەمی دنیاگر، ئەوان بوون بە هۆی پارچە کردنی کوردستان و دابەشبوونی بە سەر چوار وڵات دا. ئەگەر دەوڵەتانی زاڵ بە سەر کوردستاندا، مافی کوردیان لە ژێر پێ ناوە و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بە ئاگر و ئاسن سەر کوت دەکەن، دەوڵەتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری کە دایم باسی دێموکراسی و پاراستنی مافی ئینسانی دەکەن، لە ئاست تاوان و جنایەتی ئەو حکوومەتانە دەنگیان لە بەر نایەتە دەر. کۆمەڵی حکوومەتە یەکگرتوەکانیش( نەک نەتەوە یەکگرتوەکان) له ئاست بێبەشی کورد لە مافی ئینسانی و نەتەوایەتی بێ تاوان نیە، ئەم رێکخراوە جیهانیە تا ئێستا نەتەوەی ٣٠ میلیۆنی کورد بە کەمایەتی دەزانێ. هوییەتی نەتەومیی کورد لە لایەن ئەم رێکخراوەیە و لە لاین دەوڵەتانی سەرمایەدارییەوە بە ژێر لیچەوە کراوە.

بیر ورای پێشکەوتووی ئوروپا و رێکخراو و کۆمەڵە دێموکراتیەکانی ئوروپا، دەبێ گوشار بخەنە سەر حکوومەتەکانیان کە بۆ ناسینی هوییەتی نەتەوەیی کورد و دابینکردنی مافی نەتەوایەتی کورد هەنگاوی لێبڕاو هەڵبێنن. ئەم جۆرە سێمینارانە دەتوانن لە ناساندنی مەسەلەی کورد و روونکردنەوەی بیرو ڕای گشتی خەڵکی ئوروپا دا دەورێکی باشیان هەبێ. » من لە وتاری خۆم دا باسی ناتەواوی سیاسەتی رێکخراوە کوردییەکانیشم کرد و بە گوێرەی توانا مەسەلەی پڕ لە تەنگ و چەڵەمەی کوردم شیکردەوە کە گێڕانەوەی لێرە دا دەبێتە هۆی هیلاک کردنی خوێنەر. چەند کەس لە ئیتالیەکان دەوڵەتانی ئوروپا و بە تایبەت حکوومەتی ئیتالیایان تاوانبار دەکرد کە لە بەر بەرژەوەندی بازرگانی گرنگی بە مەسەلەی کورد نادەن. خانمێک کە چوو بوە تورکیاو سەری لە کوردستان دا بوو بە درێژی لە سەر جنایەتی حکوومەتی تورک لە کوردستان و دەوری ژنانی کورد لە خەباتی رزگاریخوازیدا قسەی بۆ بەشدار بوانی کۆبوونەوە کرد.

سێمینارەکە لە کەش و هەوایەکی زیندوو دا کۆتایی هات.

ڕۆژی دوایی سواری فرۆکە بووم بۆ فرانکفۆرت و دوای سەعاتێک ڕاوەستان فرۆکە هەبوو بۆ دانمارک. لە کۆپنهاک برادەران لە فرۆکە خانە چاوە روانم

بوون. لە کلیسایەکی خۆش و خاوێنی کۆپنهاک ڕێ و ڕەسمی یادی ساڵ تێپەڕ سورانی کۆچی دوایی کاک نەبی قادری بەڕێوە چوو. کۆمەڵێکی زۆر لە کوردەکانی دانیشتووی دانمارک و شارەکانی سوید بەشداریان کردبوو. هەر وەک دایان نابوو کە وتارێکم هەبێ، لە سەر کەسایەتی و تێکۆشەری کاک نەبی قسەم کرد و هەر چەند کاک نەبی گەلێک زیاتر لە وەی هەڵدەگرت کە لە وتارێکی دا بنرخێندرێ. هەر ئەو ڕۆژە لە گەڵ برادەرانی دانیشتووی سوید کە ئوتوبوسیان گرتبوو، گەڕامەوە.

لەو ماوەیەدابۆ ئەوەی لە بەر بێکاری و تەوەزەلی نە تلێمەوە، و بە سووڕانەوەی بێ جێی نێو بازار و دوکان و سەیری بەردەوامی بەرنامەی قۆڕی تەلەویڤیزیۆنەوە کات بە فیرۆ نەدەم لە ماوەی ساڵی ١٩٩٧ جگە لە بەشداری گەلێک سیمینار و کۆبوونەوە دەستم دا نووسینی دوو کتێبی ( بەرگی دووی پێداچوونەوە و گەشتێک بە ناو بیرەوەرییەکاندا) کە هەر دووکیان لەو ساڵە دا کەوتنە بەر دەستی خوێنەرانی کورد و چەندەش جێگای پەسند و ڕەزامەندیان بو بن، خۆیان و خودایان. ڕەنگە ئەوانەی نووسرابن، لە بواری ئەدەبی و مێژووییەوە زۆر ڕووی مەجلیسانیان نەبێت، بەڵام لە بەر ئەوەی لە دەر بە دەری دا نە کەومە دەستە و ستانی و لارە ملی پێم لە بێکاری هەر باشتر بوە. من لە ژیانی دەر بەدەری ئورووپادا لە بواری پسیکۆلۆژییەوە زۆر لە ئاسایشدا نەبووم. زەرق و بەرقی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوو، سەری لێ نەشێواندووم. لە ژیانی سیاسیم دا کە رزگاری نیشتمان وئازادی زەحمەتکێشان لە چەوسانەوە و ژێر دەستی ، ئاوات و ئامانجم بوە ، هەمیشە خەونم پێوە دیوە. بۆ ئینسانی خاوەن ئاوات و ئامانج، ژیانی ئاوارەیی لە ئورووپا سیس بوون و بێ کەلکی و کات بە فیرۆ دانە. هەر چەند من نەمهێشتوە ناهومێدی بە سەرم دا زاڵ بێ و کاتم بە فیرۆ بڕوا. هەر چۆنێ بێت بە تێکۆشان لە نووسینی کتێب و وتاری جۆر بە جۆر لر ڕۆژنامەکاندا و بەشداری لە ڕووداوەکانی ئورووپایی سەر بە کورد و کوردستاندا، لە گەڵ خەم و پەژارەی هێندێ کارەساتی داخداری کوردستان کە هەوالیان دەگەیشتە ئورووپا، ساڵی ١٩٩٧ حە وتم بردە سەر و لاپەڕەیەکی دیکەش لە تەمەنی بە ساڵاچووی چالاک و بە توانام هەڵدرایەوە.

**سالی ۱۹۹۸**

ئەم سالیش خوارزاکانم وەک پیاوان سەری سالیان لێ کردینە جێژن و بە ژن و منداڵەوە خۆشی و ڕووناکی یان خستە ماڵەکەمان. گۆڕینەوەی پیرۆز بایی سەری سالیش لە گەڵ دۆست و برادەران بە تەلەفون، یەکی دیکە لە خۆشی سەر سالی ۱۹۹۸ بوو.

٤)۱/۹۹۸/۱ بەیانی برادەرێک بە تەلەفون لە خەوی راپەڕاندم. گوتی گوێ بگرە با نامەی مام جەلالت بۆ بخوێنمەوە کە ۹۷/۱۲/۳۱ بۆ کاک مەسعودی نووسیوە. من هەر خەواڵو بووم و ئەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکە. هەر چەند دەقی نامەکەم وەگیر نەکەوت تازیاتر لێی ورد بمەوە، بەڵام هەر بە بیستنی گەلێک شاد بووم و پێم هەنگاوێکی بوێرانە و نیشتمان پەروەرانە بوو. هەر ئەو ڕۆژە سەفەرم دەکرد لە ئیزگەی قەتار، ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) م کری. کورتەی نامەی مام جەلالی بلاو کرد بۆوە. هیوایەکم بۆ پەیدا بوو کە ئاگری شەڕی کورد کوژی لە کوردستان بکوژێتەوە و چیتر زەحمەتکێشانی کورد خوێنیان بە فیڕۆ نەڕوات.

۱۹۹۸/۱/۵ لە لایەن کومیتەی داکۆکی کردن لە (MED TV) ئەم نامەیەی خوارەوەم بۆ هات...

بۆ بە ڕێز مامۆستا کەریمی حسامی. دوای سلاو.

تەلەڤیزیۆنی کوردی (MED TV) دەنگی ڕەسەنی گەلی کورد و سەکۆی ئازادی بیر و ڕا دەربڕینە. تەلەڤیزیۆنی مەد لە ماوەی سێ سالی ڕابردوو دا، توانیویەتی لە زۆر ڕۆووە خزمەت بە گەلی کورد بگەیێنێ، بۆیە هەمیشە بوە بە نیشانەی تیری دەوڵەتی تورک و بە هەموو توانایەکەوە هەوڵ دەدا ئەم دەنگە زولاڵە کپ بکا. بۆ ڕێگرتن لەو جۆرە نەخشە و پلانانە، وامان بە پێویست زانی، کومیتەیەک لە پەرلەمانتارانی ڕۆژ ئاوا، پسپۆران، شارەزایانی کورد و بیانی، هونەرمەندان، ڕۆشنبیران و ڕێکخراو و پارتە کوردستانیەکان بۆ پاراستن و داکۆکیکردن لە تەلەڤیزیۆنە تاقانەکەمان دابمەزرێنین. ئامانجی سەرەکی ئەم کومیتەیە بریتیە لە داکۆکیکردن لە مافی ئازادی بیر و ڕا دەر برین. بۆیە داوا لە هەموو مرۆڤێکی خاوەن هەلوێست دەکەین کە پشتگیری لە تەلەڤیزیۆنی کوردی(MED TV) بکاو بە پێی توانا، ئەم کەناڵە بە ڕۆشنبیران و

سیاسەتمەداران و ڕۆژنامەوانان و کەسایەتییە کوردی و بیانییەکان بناسێنێ.
ئێمەش ئەندامانی کومیتەی داکۆکیکردن لە(MED TV) لە هەموو جۆرە ڕوو داو و پێشکەوتنێک ئاگادارت دەکەینەوە و لە هەمان کاتیشدا، بۆ پێشوازیکردن لە هەموو پێشنیار و ڕەخنەیەکی سود بەخش دەرگا لە سەر پشتە.

هیوا دارین، بە ڕێزتان بە دەنگ داواکارییەکەمانەوە بێن و بەشداری لە کومیتەی داکۆکیکردن لە (MED TV) دا بکەن. بۆ ئاگاداریتان، هیچ جۆرە ئەرکێکی ئەو تۆ ناکەوێتە سەر شانی ئەندامانی کومیتەی داکۆکیکردن، تەنیا ئەوە نە بێ ئەگەر ( MED TV) ڕوو بە ڕووی هەر جۆرە هەڕەشەیەکی دەوڵەتی تورک بۆوە، داواتان لێدەکەین دەنگی ناڕەزایی خۆتان بەرز بکەنەوە و بە هانای تەلەڤیزیۆنی مەدەوە بێن. بۆ ئەوەي دەنگی نەتەوەکەمان(MED TV) کپ نەکرێ.

حیکمەت تاباک بە ڕێوە بەری مەدتیڤێ، دلێر ئاکرەیی بەڕێوە بەری مەدتیڤێ، کریس دەن هۆند ڕۆژنامەوان.»

لە گەل ئەم نامەیە فۆڕمێکیان نارد بوو دەبوایە پڕ بکرێتەوە و بۆیان ڕەوانە بکرێتەوە،

لە تاریخی ٩٨٧/١/٢٦ فۆرمەکەم بە ناو و شوڕەت و ئەدرەس و تەلەفون و فاکس پڕ کردەوە و بۆم ناردەوە و لە تێبینی - شدا نووسیم: « داکۆکیکردن لە تەلەڤیزیۆنی(MED TV) ئەرکی هەموو نیشتمانپەروەر و ئازادیخوازێکی کوردە. نابێ ڕێگا بدرێ کە ئەم دەنگ و ڕەنگەی کورد کپ بکرێ. دەبێ بە یەکێتی و پشتگیری نەخشە و پلانی دوژمنانی کورد پوچ بکرێتەوە. هەر لەو کاتەشدا (MED TV») یش دەبێ چاوێک بە سیاسەت و بەرنامەکای خۆیدا بگێڕێتەوە و نە بێتە مەیدانی پەلاماردانی هێزەکانی تری کوردستان و جنێو دان بە هێز و کەسانی ئازادیخواز و نیشتمانپەرور.

**نامەیەک لە ئۆردووگای ڕمادیەوە:**

نامەی خوارەوەم لە ئۆردووگای ڕمادی لە لایەن هاونیشتمانێکی نە ناسراوی جوانڕۆییەوە، بە ناوی( توفیق ڕۆستەم وەکیلی) پێگەیشت کە ١٩٩٨/١/٢٣

نووسرا بوو، بۆ ڕێز گرتن له هەڵوێست و دڵسۆزی ئەم هاو نیشتمانه، دەقی نامەکەی لێرە دا بڵاو دەکەمەوە:

« نووسەر و ڕۆشنبیری گەل کاک کەریمی حسامی. سڵاوێکی گەرم و کوردانه.

کاک کەریم لات سەیر نەبێ کە کەسێک نەی ناسیت و نەت دیبێ نامەت بۆ بنووسێ. بەڕاستی بەرهەمەکانت له باتی خۆت میوانی گشت ماڵه کوردێکه و مێژوومان بۆ دەگێڕێتەوە.

ئەی نووسەر و مێژوو نووسی واقعی گەلەکەمان. هەر بژیت و سەر کەوتووبێ،. له ڕێگەی کاک عارف باوجانی له نەروێژەوە ئاگادار کراین کە جەنابتان له بەرهەمە به نرخەکانتان، باسی خەباتی جوانڕۆییەکانتان کردوە له کتێبی « کاروانێک له شەهیدانی کوردستانی ئێران» وله « پێدا چوونەوە بەرگی دووەم بزووتنەوەی نیشتمانی کورد له کوردستانی ئێران»

به ڕاستی نیشانتان داوە کە نووسەرێکی واقیعی مێژوو زیندوو کەرەوەن. کاک کەریم زۆر کەس هەیە به ناوی مێژوو نووس خۆی خەریک دەکات بەڵام له زۆر ڕووداوی ڕاستی خۆ دەبوێرن یا فەرق و جیاوازی له نووسیندا دەکەن.

خەباتێک کە ١٤ساڵ بەربەرەکانی بەرانبەر به ڕێژیمی نۆکەری ئیمپریالیزمی ئەو سای شاه بۆ دەبێت نه چێتە نێو ریزی مێژووەوە. بۆ دەبێ نووسەران و به ناو مێژوو نووسان به شانازییەوە ئەو خەباتە نه نووسن و بۆ خوێنەرانی ڕوون نەکەنەوە.

من خۆم توفیق کوڕی ڕۆستەم بەگی وەکیل- م کە باوکم یەکێک بوە لەو خەبات گێڕانە کە چەندین ساڵیش له زیندانی شای گۆڕ به گۆڕ له گەڵ چەندین هاوڕێی دیکە به تاوانی ئەو خەباتە زیندانی کراوە.

هەر وەک بۆ خۆتان له کتێبەکانتان باستان کردوە، خەباتێ کە ڕێژیمە حەریفەکەی له ڕۆژنامەی اطلاعاتی خۆیدا ئیعتراف بکات و بڵێ: دوای ١٤ ساڵ ناوچەی سەر به خۆی جوانڕۆ کەوتەوە دەستی وڵات. به ڕاستی دەبوایە ئەو خەباتە له ڕیزی خەباتە به ناو بانگەکان بوایە.

کاک کەریم ! یەکێک له کوڕەکانم نامەیەکی سەبارەت بەو خەباتە نارد بوو بۆ ڕادیۆ........کە خۆیان به نوێنەری گەل دەزانن. له وەڵامدا وتی: گوێگری بەڕێز

ئەو شتە سێ مانگ درێژەی هەبوە، سەربازیان بە ڕێژیم نەداوە، پاشان تەسلیم بوون. جا بڕوانە ١٤ ساڵ بە دەستی خۆمان کرا بە ٣ مانگ. تکایە هەمیشە با لە ڕێگای عارف باوە جانی یەوە بە نووسراوە پێوەندیمان هەبێ. هیوا دارم بتوانین ئێمەش بێینە دەرەوە و لە نیزیکەوە جەنابتان ببینین. لە لایەن خۆم و بنە ماڵە و تەواوی عەشیرەتی جوانڕۆوە سوپاستان دەکەم. براتان توفیق ڕۆستەم وەکیل. ١٩٩٨/١/٢٣

**زەحمەتێکی بێ ئەنجام**

برای خۆشەویست بەڕێز ئاکرەیی کتێبێکی بۆ هێنام کە مورتەزای زەر بەخت یەکێ لە ئەفسەرانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان لە سەر ڕێ پێوانی مێژوویی بارزانی ئەمر بۆ سۆڤێت ساڵی ١٩٤٧ بە گوێرەی بەڵگە و دۆکۆمێنت ئامادەی کردبوو. گوتی: نرخی ئەوەی هەیە بکرێ بە کوردی و بڵاو بکرێتەوە. بە تەلەفون لە گەڵ سەرۆ قادر بەر پرسی دەزگای گوڵان پێوەندیم گرت و گوتم: کتێبێکی وەهەیە، ئەگەر چاپی بکەن، خەریکم بیکەم بە کوردی و بۆتان بنێرم. گوتی بینێرە چاپی دەکەین. دەستم کرد بە وەرگێڕانی و ٩٩٨/٥/٦ کتێبەکەم دا بە کەماڵ یەکێ لە برادەرانی پارتی دێموکراتی کوردستان- یەکگرتوو کە بۆ سەرۆقادری بنێرێ و ئەم نامەیەی خوارەوەشم بۆ نووسی: « برای بەڕێز کاک سەرۆ ڕۆژ باش !

سڵاوێکی برایانە، هیوادارم ساخ و سلامەت و سەر کەوتوو بیت. هەر وەک بە تەلەفون باسمان کرد، ئەوا کتێبەکەت بۆ دەنێرم، هیوادارم بە جوانی بڵاو بکرێتەوە و بە دەردی نووسینەکەی مامۆستا پشکۆ نەچێ.

دەمەوێ برایانە سەبارەت بە دەست تێوەردان، یا هەڵپاچینی نووسراوەکەی مامۆستا پشکۆ ڕەخنە یا گلەییت لێ بکەم. زۆرم پێناخۆش بوو کە کارێکی ئاوا لە ئێوە ڕوو بدات لە ئورووپا هەرا و ڕەخنەی ڕەوای لێ ساز بێت.

تۆ بە تەلەفون بە منت گوت: وتارەکە دەستی لێ نە دراوە. لە کاتێکا بە ئەژمار لە ٥٠ جێگا دەستکاری کراوە. من ئەو شێوە کارە و یا ئەم جۆرە

سانسۆرە لە گەڵ تیرۆری ئەفکار و بەر بەستکردنی بڵاو بوونەوەی بیرو ڕای جیاواز وەک یەک دادەنێم. ئەگەر نووسینەکەتان بە دڵ نەدەبوو، دەبوایە بە نووسەر ڕابگەیێنن و یا چاپی نەکەن. نەک بە کەیفی خۆتان سەر و گوێی بقرتێنن. بە ڕاستی سەیرە لە دنیای ئیمڕۆ دا ئێوە نە توانن تەحەمولی وشەیەک بکەن کە لە گەڵ بۆچوونی ئێوە نەیەتەوە و هیچ شتێکی دوژمنکاریشی تێدا نەبێت. تۆ بڵێی کۆمەڵگای کوردی بگاتە ئەم قۆناخەی پێگەیشتن کە مرۆڤ بتوانێ لە وێدا بیر و ڕای خۆی بە ئازادی و تەنانەت دژی دام و دەزگای دەسەڵاتداریش دەر ببڕێت.؟ لام وایە مەسەلەکە تۆزێ بەوە ئەهوەن بوو بێتەوە کە نوێنەری پارتی ڕایگەیاند کە ئەم کارە ناشیرینە پێوەندی بە پارتیەوە نیە و ئێمەش مەحکوومی دەکەین. بە ڕاستی من چاوەڕوانی سانسۆرێکی ئاوا بێ جێم لە تۆ نە دەکرد. چوونکە ئەوە بە ڕووتکردن و خنکاندنی بیرو وتەی جیاوازی دادەنێم.

ڕەنگە ئەم قسانەت پێ تاڵ بن، بەڵام تاڵتر ئەوەیە کە خەڵکێکی رووناک بیرو دڵسۆز و تینووی ئازادی و دێموکراسی وەبەر نەشتەری ڕەخنەی ڕەوات بدەن. من کتێبەکەم ئامادە کرد بوو ئەگینا بە ڕاستی بۆ چاپکردن نەمدەنارده لای ئێوە. چوونکە ناکرێ لێرەوە شتێکتان بۆ بنێرن و ئێوە لە وێ بۆ هەڵپاچینی وشە و بیر و بۆچوونی نووسەر، مقەست بگرنە دەست و ئەم لاو لایانی تێک بکەنەوە. لە کتێبەکە دا ئەم ڕەسمانەش چاپکراون لە گەڵ ئەم نەخشەیەی کە ڕێپێوانەکە نیشان دەدا، کۆپیتان بۆ دەنێرم. ئەم یادداشتەش کە لاپەڕەیەکی جیاوازە. لە پێشەکی کتێبەکەیدا بە قەڵەمی( کاوە بەیات، دەبیر مجموعە تاریخ معاصر ایران-٥ ) نووسراوە. ڕێکخستن و تەرتیبدانی چاپکردنی بۆ خۆتان دەزانن و بۆ قسەی زیادی نابێ. لە کۆتاییدا پێم خۆشە لە گەڵ سڵاو بۆ مامۆستا فەلەکەدین پێی ڕابگەیێنی مەمنون دەبم ئەگەر یەک دوو دانە لە کتێبەکەی خۆم بۆ بنێرێت. سوپاسی هەر دوکتان دەکەم. کەریمی حسامی ١٩٩٨/٥/٦

دیارە فارسی کتێبەکە لە ئێرانەوە گەیشتبوە هەولێریش و کاک شەوکەت شێخ یەزدین دەستی کرد بوو بە وەرگێڕانی و گۆڤاری ( گولان)-یش بڕ بڕ بڵاوی کردبۆوە و وەرگێڕاوەکەی من سەری تێدا چوو، هەر وەڵامێکیشیان

نەدامەوە.

ڕۆژی چاردەی ئەپریلی١٩٩٨بەیانی برادەرێک بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان- یەکگرتوی بۆ هێنام کە لەوێدا گوترابوو: کاتێ شەمدین ساکیک لە دهۆکەوە خەریک بوە بێتە هەولێر لە نیزیک قەسرۆک کۆماندۆی تورک بە هێلیکۆپتەر دابەزیون و بردوویانە» لە پێشدا بڵاو کرابۆوە کە شەمدین ساکیک یەکێ لە فەرماندەکانی پ.کە.کا، هاتوتە لای پارتی دێمۆکرات بۆتە پەنابەر. لە گەڵ ڕفاندی شەمدینی پرو پاگاندە دەست پێکرا کە پارتی شەمدینی داوەتەوە بە تورکان. لە ڕادە بەدەر پێتێکچووم و نارەحەتبووم. بە تایبەت لەو دەمیدا کتێبی( مورتەزا زەر بەخت) م دەکرد بە کوردی لە سەر پەرینەوەی بارزانیەکان لە ئاراز ساڵی ١٩٤٧. ڕاست لەو شوێنەدا بووم کە دەڵێ:« کاتێکی بارزانی ئەمر دەچێتە کن شا، محەممەد ڕەزا شا داوا لە مەلا مستەفا دەکات ئەفسەرانی ئازەربایجانی کە چوونە نێو بارزانییەکان تەسلیمی دەوڵەتی ئێرانیان بکاتەوە. بارزانی لە وەڵامدا دەڵێ:« قوربان ڕازی مەبە کەرامەتی بنە ماڵەی بارزانی وە بەر تف ولەعنەتی بەرەی داهاتوو بکەوێ. رەسمی عەشیرەتی بارزان ئەوە نیە کەسێکی پەنای بۆ بێنێ ، بیداتەوە دەست دوژمن. من ئامادەم لە جیاتی ئەو شەش ئەفسەرە ئازەربایجانیە ١٨ کەس لە کوڕ و برازایانم تەسلیمی ئەعلاحەزرەت بکەم بەڵام لە تەسلیم کردنەوەی ئەو ئەفسەرانە چاو بپۆشە»

لە بەر خۆمەوە گوتم: باشە ئەوانەی ئێستا سەرۆک و دەسەڵاتداری پارتین کوڕ و نەوەی سەرۆک بارزانین، چۆن دەبێ غیرەتیان قبوڵی کردبێ کە کابرایێکی پەنای بۆ وان هێنا بێ، تەسلیمی دوژمنی بکەنەوە.

لە بەیاننامەیەکی پێشووی مەکتەبی سیاسی پارتیدا گوترا بوو: « نە تورکیا داوای شەمدینی کردوە و نە ئێمەش تەسلیمی دەکەینەوە. پاشان لە نووسراوەکانی دوایی پارتیدا ڕوون کرایەوە کە شەمدین خۆی نەیویستوە لە هەولێر دابنیشێ و ئەوان بیپارێزن، خۆی چۆتە دهۆک و لە گەڕانەوە دا گیراوە و ڕفێندراوە.

**سەفەر بۆ مۆسکۆ**

٩٩٨/٥/٢٤ لە لایەن بەڕێزمامۆستا فەخری کەریمەوە ئاگا دار کرام کە بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەی دامەزرانی فۆندی خوا لێخۆشبوو(فوئاد قەدری) کە ٩٩٨/٦/٣ لە موسکۆ پێک دێت داوەت کراوی. ڤیزا و بلیتی فڕۆکەت بۆ دەنێرن، هەر وەها کۆبوونەوەیەکیش لە سەر مەسەلەی کورد لە لایەن کومیتەی هاوکاری و پشتیوانی لە گەڵ گەلانی ئاسیا و ئەفریقا پێک دێت و بەشدار بوانی فۆندی فوئاد قەدری-یش لەو کونفرانسە دا بەشداری دەکەن.

٥/٢٦/ برادەرێک بە ناوی سەرکیس کە بە عەرەبی دەدوا، تەلەفونی کرد کە کۆپییەی پاسپۆرتی بۆ بنێرم بۆ ئەوەی ڤیزام بۆ بنێرێ. ڕۆژی ٦/٢/سواری فڕۆکە بووم و لە فڕۆکە خانەی مۆسکۆ برادەرێک چاوە ڕوانم بوو، سوار بووین بۆ هوتێل بوداپێست کە بۆ میوانان ڕێزێرف کرا بوو. ڕۆژی ٦/٣/ لە سالۆنی ئەنستیتوی ڕۆژ هەلات ناسی مۆسکۆ کۆ بوونەوەی فۆندی( فوئاد قەدری جەمیل) پێک هات. فۆندی قەدری جەمیل تەرخان کراوە بۆ یارمەتی ئەو نووسەر و لێکۆلەر و خوێندکارانە کە لێهاتووی درێژە پێدانی خوێندنی بەرزیان هەیە و بەلام دەرەتانی ئەوەیان نیە بێنە ئوروپا و خوێندنی بەرز درێژە پێبدەن. یا بۆ چاپی ئەو کتێبانە کە لە لایەن هەیئەتی پسپۆری هەڵبژێردراو دیاری دەکرێن. نووسەری ئەم دێرانەش بە ئەندامی کومیتەی گشتی فۆند هەڵبژێردرا.

ڕۆژی ٩٩٨/٦/٤ بە دەستپێشخەری کومیتەی هاوکاری و پشتیوانیی گەلانی ئاسیا و ئەفریقا لە ژێر ناو ونیشانی (مەسەلەی کورد لە سەر دەمی ئێستا دا) کۆنفرانسێک پێک هات. پێویستە بگوترێ کۆنفرانسەکە لە رووسی دا بە( مێز گرد) ناو نرا بوو. کۆنفرانس بە هاو کاری وەزارەتی دەرەوەی رووسیا وپارلمانی روسیا( دوما) و ئەنستیتوی ڕۆژهەلاتناسی رووسیا و ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی لە مۆسکۆ هاتبوە ساز دان.

پێنج خاڵ بۆ لێدوان لە کۆنفرانس دیاری کرا بوون:

١ ـــ دوا ڕۆژی پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد.

٢ ـــ فاکتەری کوردی لە ژیئۆپۆلیتیکی بەرژەوەندی رووسیادا.

٣ ـــ هەڵوێستی حیزب و ڕێکخراوە کوردییەکان بۆ دیاری کردنی چارە نووسی کورد بە دەستی خۆی.

٤ ــــ کێشەی نێوان کوردەکان و ڕێگای چارە سەر کردنی.
٥ ــــ دەرەتانی هەمە لایەنەی چارە سەر کردنی مەسەلەی کورد.
نوێنەرانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیا و نوێنەرانی پارلمانی رووسیا( دوما) نوێنەرانی ئەنستیتوی ڕۆژ هەڵاتناسی مۆسکۆ،نوێنەرانی ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردیی لە مۆسکۆ، و چەند زانا و رۆشنبیری کوردی رووسیا. چەند زانای رووس، شارەزای مەسەلەی کوردلە کوردستان نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان ــــ یەکگرتوو، نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان، هاوڕێ عەزیز محەممەد سکرتێری پێشووی حیزبی کۆمونیستی عراق و کەسایەتی ناسراوی کورد بەشدار بوون. لە بەشەکانی تری کوردستان بە داخەوە نوێنەری حیزب و رێکخراو بەشدار نەبوون. نووسەری ئەم دێڕانە وەک کەسێکی سیاسی سەر بەخۆ لە کوردستانی ئێران بەشداركرا بوو. نوێنەری پارتی کرێکارانی کوردستان داوەت نەکرابوو، بەڵام ئەندامیان بەشداریان کردبوو. برادەرێک بە ناوی « عەزیز جکۆ»سکرتێری بەرەی ئازادی کوردستان سەربە پە.کە.کا. وتارێکی پێشکێش کرد.
کۆنفرانس بە وتاری پرۆفیسور لازارێف کرایەوە و بە درێژی لایەنە جیاوازەکانی مەسەلەی کوردی باسکرد. بەشدار بوانی کۆنفرانس هەر یەک بە جۆرێک مەسەلەی کوردیان شیکردەوە. بەڵام باسی سەرەکی زیاتر لە دەوری کوردستانی عراق دەسوڕاوە. من لە وتاری خۆم دا جۆرێکی تر بۆ مەسەلەکە چووم و مەسەلەی میللەتی کورد بە گشتی و سیاسەتی دەوڵەتە زلهێزەکانم بە کورتی هێنا بەر باس و پێشنیارم کرد کە کومیتەی هاوکاری و پشتیوانی گەلانی ئاسیا و ئەفریقا لە گەڵ کۆڕ و کۆمەڵی ماف پەروەر و دیموکراتی غەیرە دەوڵەتی ئوروپا پێوەندی بگرێ و بە هاوکاری ئەوان فشار بخەنە سەر دەوڵەتانی زلهێز و رێکخراوی نەتەوەی یەکگرتوەکان کە مەسەلەی کورد وەک مەسەلەی نەتەوەییەکی ٣٠ میلیۆنی خاوەن ماف و ماف زەوتکراو مامڵەی دەگەڵ بکرێت.
پاش کۆنفرانس دیدارێکی ڕۆژنامە گەریی بە بەشداری هاوڕێ عەزیز محەممەد و دوکتور ناصح غەفور و دوکتور عیزەدین و شۆرش خالید و کەریمی حسامی پێکهات و وەڵامی پرسیاری ڕۆژنامە نووسان درایەوە.

ڕۆژی ٩٩٨/٦/٧ بۆ سوید گەڕامەوە.

**تەلەفوونێکی نەناسراو**

ڕۆژی ٩٨/٦/٩ بەیانی زەنگی تەلەفونێک لە خەوی ڕاپەڕاندم گوتی: « من سمکۆ یەزدان پەنام لە کوردستانەوە تەلەفون دەکەم. من قەت بە خزمەت ئەو برادەرە نە گەیشتبووم و تەنیا بیستبووم کە بە داخەوە برا گەورەی ئەو سەعیدی یەزدان پەناله سولەیمانی بە دەستی تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران تیرۆر کراوە کە سکرتێری ڕێکخراوی« یەکیتی شۆرشگێڕانی گەلی کوردستان» بوە. هەر وەک لە دوورەوە بیستبووم چەند لاوی نیشتمانپەروەر ی کوردی کوردستانی ئێران ڕێکخراوێکیان پێکەوە ناوە و بە گوێرەی بۆچوون و سیاسەت و لێکدانەوەی خۆیان بۆ نەهێشتنی زوڵم و زۆرداری لە کورد و مافی ئینسانی نەتەوەکەیان لە خەبات و تێکۆشان دان. ئەو دەنگویەش بڵاو ببۆوە کە لە سولەیمانی چەند کەس لە تێکۆشەرانی ئەو ڕێکخراوەیە بە دەستی تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامی کوژراون.

پاش سڵاو و چاک و خۆشی، کاک سمکۆ گوتی:» من لە لایەن یەکیتی شۆرشگێڕانی گەلی کوردستانەوە تەلەفون دەکەم. پێش چەند ڕۆژ واتە ٩٨/٦/١ ژمارەیەک لە هاوڕێیانمان کە لە ناوچەی پیرانشار لە گەڕان دا بوون، لە گوندی زێوکە و ماشکان دەکەونە بەرپەلاماری چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان( پە.کە.کا ) و شەش کەسیان لێ شەهید دەکەن و دوو کە سیشیان بە برینداری دەگرن و گولله بارانیان دەکەن. دوایەش لە پیرانشار تەرمەکانیان دەدەنەوە بە پاسدارانی کۆماری ئیسلامی. داستانی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە بە تەلەفون ناکرێ و تکام ئەوەیە ئە گەر فاکس هەیە با بە فاکس بەیاننامەی ڕێکخراوت بۆ بنێرم.»

بە دوای ئەو دا بە فاکس بەیاننامەکەی نارد. بە خوێندنەوەی بەیاننامەکە بە ڕاستی لە گەڵ کارەساتێکی خەفەتبار بەرە و ڕوو بووم. کارەساتێکی ئەوەندە قورس و دڵتەزێن و هەر لەو کاتەش دا نابرِوو بەرانە بوو، کە سەری لێ دەر نە دەکرا. هێزێکی گەورەی کوردی کە گۆیا بۆ ئازادی کورد و رزگاری کوردستانی گەورە خەبات دەکاو گۆیا شەڕی شۆرشگێڕانەی وی دژی حکوومەتی شوڤێنی

تورکیایە، دەبێتە پارێزەری سنوورەکانی ئێران و لە کوردستانی ئێراندا تێکۆشەرانی کوردی ئێرانی پەلامار دەدا و دەیانکوژێ و تەرمەکەشیان دەداتەوە بە رژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران و لە کوردستانی عیراق نەهێشتنی ئەم دەسەڵاتە نەتەوەییەی کورد کە ئێستا لە ئارا دایە، دەکاتە ئامانج بەرنامەی کاری زۆی و و شەڕی پێدەفرۆشێ.

بە داخ و نارەحەتیەکی زۆرەوە هەر گەیشتمە ئەو ئەنجامە کە بگەڕێمەوە بۆ پێداچوونەوەی مێژووی کورد و خەسڵەت و ئاکار و تایبەتمەندییەکانی کورد کە هەمیشە و هەرچی کردبی بەشێکی هەر گەڕاوەتەوە بۆ دوژمنایەتی لە گەل نەتەوەکەی خۆی و خزمەت بە دوژمنی نەتەوەکەی و فریو خواردن و فریودانی خەڵکی کورد و بەرهەمی فیداکاری زەحمەتکێشانی کوردیش هەر ئەوەیە کە ئێستا دەیبینین. لە هەمووشی سەیرتر ئەوە بوو کە نوێنەری ( پە.کە. کا) لە سەر ڕادیۆی هەنگاو لە سوید هێندێ درۆی بۆ پاکانەی ئەم کردەوە دزێو و نائینسانانەی خۆیان ڕیز دەکرد کە کۆمەلانی خەڵک گاڵتەیان پێدەهات. زۆریش لە نیشتمانپەروەرانی کورد کە لە وتو وێژێکی ڕادیۆیی دا لە سوید بەشداریان کرد و بە جوانی بەر پەرچی قسەکانی نوێنەری پە.کە. کە یان دەدایەوە و کردەوە و سیاسەتی چەوتی ئەو ڕێکخراوەیان مەحکوم دەکرد. دیارە بە ناو روناکبیری واش هەبوون مشکیان لە قسەکانیاندا دەکوشت و جۆرە پاساوێکی فرە دزێویان بۆ ئەم جنایەتە دەهێنایەوە پاکانەیان بۆ کورد کوژی پە.کە.کە دەکرد.

**نامەیەک بۆ شلێری کچم**

ڕەوەندی ژیان، بە تایبەت لە ئاوارەی و دوور لە نیشتمان و نەتەوە، گەلێک ناله بار و پڕلە تەنگ و چەڵەمەیە. وەک لە سەرەتای ئەم بەرگە باسم کردوە، هۆی هەرە گرنگی ئارادەیەک ئاسوودەیی و بێ تەنگ وچەڵەمەی من لە بواری ژیاندا خۆشی نێو ماڵ و خێزان و ئینسانیەت ودڵسۆزی دایکی کەماڵ و باوک خۆشەویستی منداڵەکانم بوە، بەڵام دەبینی دیسان شتی وادێتە پێش کە مرۆڤ مەجبوور دەبێ دەست بۆ قەڵەم بەرێ و شتێک بنووسێ کە کارلە جەرگ و هەناوی بکات. برادەرێکی خۆشە ویستم داوای لێکردم کە خەسووی لە ئێران

زۆر نەخۆشە و ئەو دەرمانەی کە پێویستە لە وێ بۆی پەیدا نابێ و وەگیری ناکەوێ. لە سویدیش دەرمان یەکجار گرانە و دوکتوریش بە بێ چاو لێکردنی نەخۆش نوسخە نانووسێ. تکای کرد بەڵکوو شلیری کچم نوسخەی بۆ بنووسێ و خۆشم بۆی وەر گرم چونکە زۆر گرانە. تەلەفوونم بۆ شلێر کرد و چەرمیانەکەم پێگوت. بە شلێرم گوت: تکایە نوسخەی بە ناوی من بنووسە تا ئەو دەرمانە بۆ خەسووی ئەم برادەرەمان وەر گرم. شلێر گوتی: « بابە یەکەم ئەم نەخۆشیە سێ جۆر دەرمانی هەیە. دەبێ دوکتور بیبینێ و ئەو دەم بزانێ کام حەبی بۆ دەنووسێ. دووەم تۆ نەخۆشی دڵت هەیە و دەرمانەکانی تۆ هەموو ناسراون و دۆسیەیان هەیە. سێیەم ئێستا تۆ بە لاش دەرمان وەر دەگری. ئەو دەرمانەش زۆر گرانە و قوتوی بە ٨٠٠ کرۆنە. هەر چەند مانگ جارێکیش لە سەر نوسخەکانی دوکتور کۆنترۆڵ هەیە. جا بۆیە ناتوانم ئەو نوسخەیە بە ناوی تۆ بنووسم بە تایبەت کە چاوم بە نەخۆشەکەش نە کەوتوە.

زۆر نارەحەت بووم. من کە قەت دڵی شلێرم نەیەشاندوە،و لە ژیانیشدا دڵم لێی نە رەنجاوە. خۆم پێ رانە گیرا و ئەم نامەی خوارەوەم بۆ نووسی:

«.. شلێری خۆشەویستم رۆژ باش! چاوت ماچ دەکەم. لە وەتا چوویەوە خەریکم ئەم نامەیەت بۆ بنووسم. دەستم بۆ قەڵەم نە دەچوو. دەمگوت پێت ناخۆش دەبێ. پاشان بڕیارم دا هەر بینووسم. ئاخر دەزانی من بابم. باب هەقی هەیە دەردی دڵی خۆی بە منداڵەکانی بڵێ. من لە تەمەنی بیست ساڵیەوە بۆ ئازادی زەحمەتکێشانی کورد و رەزگاری هەموو ئینسانێک لە چەوسانەوە چوومە نێو مەیدانی خەبات و تێکۆشانی سیاسی. لەو رێگایە دا تووشی زیندان و برسیەتی و دەر بەدەری بووم. دایک و باب و ژن و منداڵ و خوشکم مردون و لە سەرە مەرگیشدا نەمتوانیوە لە سەریان بم و نەمتوانیوە بچمە سەر قەبرانیشیان. ئەگەر تا ئێستاش لە دەردی دووری نیشتمان بە دەر هیچم پێ نەبڕاوە و لە ئاخری تەمەنیش نیزیک بوومەوە، بەڵام سەر بەرزم لە نێو خەڵکی زەحمەتکێش و بە شەرەفی کوردستاندا بە خزمەتکارێکی بچوکی رێگای ئازادی ناسراوم و لە کن خەڵکی بە شەرەف و نیشتمانپەروەر جێگای رێز و خۆشە ویستیم. هەر ئەوەش جێگای شانازیمە.

لە هەموو ژیانمدا ئاواتم ئەوە بوو منداڵێکم هەبێ کە بتوانێ بە گوێرەی توانا

خزمەت بە فەقیر و هەژاری کورد بکات چەندم پێخۆشبوو ئەگەر منداڵ بووی دەتگوت: دەبم بە دوکتور کۆمەگ بە منداڵی فەقیری کورد دەکەم. شوکر بووی بە دوکتور. کارت پەیدا کرد و شوکر ژیانیشت خۆشە. بەڵام داخوا جارێک بیرت لە خەبات و لە ژیانی ڕابردووی بابت کردەوە؟ جارێک منداڵ و هەژاری کوردت وە بیر هاتەوە؟ جارێک بیرت لە وە کردەوە کە بڵێی کوردم و نەتەوەکەم زۆر فەقیرو بندەست و ستەم لێکراوە.؟

نازانم چۆن دڵت ئاسودە دەکەی کە ژنێکی کورد لە کوردستانەوە داوا لە بابت بکا کە دەرمانێکی بۆ بنێرێ. بەڵام تۆ نوسخەی بۆ نە نووسی؟ خۆ شوکر داوای پارەشی لێنەکردووی. من پارەکە سەت دۆلارم بۆ پوورزایەکی فەقیری خۆم نارد. بۆم نوسیبوو کە ئەم پارەیە شلێر بۆتانی ناردوە. چونکە پێمخۆشبوو بڵێن منداڵەکانی کەریمی حسامی وەک بابیان دڵسۆزی میللەتی خۆیانن. ئێستا ترسی ئەوەم هەیە کە ئەم ئاواتەشم وەک زەحمەت و تێکۆشانی سیاسیم هیچی لێ پەیدا نەبێ. نەمتوانی ئەم نامەیەت بۆ نە نووسم. دایکت نارەحەت بوو پێی خۆش نەبوو نامەت بۆ بنووسم. بەڵام وا بۆت دەنێرم. هیچ نەبێ ڕایگرە پاش مردنم جارێکی دیکەش بیخوێنەوە و بڵێ: ئەو بابەی مە چەندە بێبەخت بوو کە منداڵەکانیشی بە دڵی ئەو نە بزووتنەوە. دەمەوێ هەمیشە بە خۆشی بژی. بابی دڵسۆزت. ١٢/١١/١٩٩٨»

شلێر پاش وەر گرتنی نامەکە زۆر نارەحەت بوو. زۆر گریا و دەیگوت بۆیە دەگریم تۆ داب و ڕەسمی دەرمان و پزشکی ئێرە نازانی. با کچەکەی ئەو نەخۆشە ناو و ژمارەی خۆیم بۆ بنێرێ تا نوسخەی بۆ بنووسم هەر چەندە هەقیشم نیە. بەڵام ناتوانم بە ناوی تۆ بینووسم.

دیارە کچی ژنەکە ناو و ژمارەی بۆ نارد و شلێر نوسخەی بۆ نووسی. منیش داوام لە برادەرێکی خۆشەویستم کرد دەرمانەکەی بە ناوی من نووسی و بایی ٧٨٠ کرۆن بوو وەرم گرت. داوام لە دوستی بە ڕێزم دوکتور محەممەدی ڕەحیمی کرد کە هەمیشە لە جوامێری و لوتفی لە ئاست من دا، نموونەی ئینسانیەت و دۆستایەتی بوە، نوسخەیەکی بە ناوی من نووسی و ئەویشم بۆ وەر گرت و دام بە کیژەکەی، هیوادارم نەخۆشەکەش چاک بوو بێتەوە.

خەراپەی کار و تێکۆشانی من لە وە دایە کە ناتوانم یا نازانم پڕۆژەی کاری

خۆم دابڕێژم. من دامنا بوو کە بەرگی یازدەی بیرەوەرییەکانم تەواو بکەم و واز لەم حکایەتانە بێنم. تازە دەستم بە نووسین کرد بوو، کە کتێبی ئاغای ( کاوە بیات) م کە وتە دەست. ئەوەندە سەرنجی ڕاکێشام کە وازم لە نووسینی بیرەوەری هێناو دەستم کرد بە نووسین و ئامادە کردنی کتێبێ « کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و حکوومەتانی ناوچە دا »

پاشان کتێبی « ئەفسانە کوردییەکان» م لە ئێرانەوە بۆ هات. وەک لە پێشەکی ئەو کتێبە دا نووسیومە، ئەم کتێبە داستانێکی هەیە. دەستم کرد بە وەر گێڕانی کە بیکەم بە کوردی و بۆ چاپ ئامادەی بکەم.

دەمێک بوو کەڵکەڵەی ئەوەم هاتبوە مێشکی کە لە دە بەرگی بیرەوەرییەکانم بەرگێکی تیرو پڕی فارسی ئامادە بکەم. یەک دوو برادەری خۆشە ویست و بە تایبەت کاک هوشیاری ئیمامی زیاتر هانی دەدام کە ئەمکارە بکەم. با کوشراوەی دە بەرگی بیرەوەرییەکانم بکرێنە فارسی و فارسەکانیش تا ڕادەیەک لە ڕابردووی ڕوو داوەکانی کوردستان ئاگادار بن، هەر چەندە مەلا عەولای حەیاکی پاش جێگرتنەوەی قاسملو و شەرەفکەندی لە فەرمایشتەکانی سەر کاغەزیدا فەرموویەتی: « نووسینەکانی کەریمی حسامی جێگای بڕوا نین» بەلام قەی ناکا با ئەو فەرمایشتی خۆی هەر بفەرمووێ و کاروانی نووسینەکانی منیش هەر وا ڕێگای خۆی درێژە پێدەدات.

برادەرانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق پێیان ڕاگەیاندم کە بۆ بەشداری لە کۆنگرەی دوازدەی پارتی وەک میوان داوەت کراوی. پێم خۆش بوو جگە لەوە کە داوەتەکە خۆی بۆ من شوێنی تایبەتی هەبوو، دیداری نیشتمان و دۆست و برادەری زۆر و خۆشەویستیش نیعمەتێکی زیادی بوو بە نسیبم دەبوو. برادەرانی پارتی کۆپیەی پاسپۆرت و بەڵگەی سەفەریان لێ وەر گرتم و دەبوایە چاوەڕوان بم. هەر چەندە سەفەری کانادام لە بەر بوو کە سەرەتای مانگی حەوت بە تەمای چوونی کانادا بووم سەفەرەکەم وەدوا خست و چاوەڕوانی ئەوە بووم کە بەرەو کوردستان بکەومە ڕێ. سەرەتای مانگی هەشت لە پڕ برادەرانی پارتی گوتیان سەفەرەکەت پەکی کەوتوە چونکە ئەمسال بڕیارە هیچ کەس وەک میوانی بێگانە بۆ کۆنگرە داوەت ناکرێ. لە هەڵکەوتی وادا هیچ ناکرێ. کاتێ میواندار لە داوەت کردنت پەشیمان بێتەوە، تۆ چدەکەی. جگە لەوە کە دوو

هەزار کرۆن زیادی پارەی بلیت بدەم و سەفەری کانادا تێک نەدەم چیدیم بۆ نەکرا. نامەیەکی کورتم بۆ پیرۆز بایی لە دوازدەهەمین کۆنگرەی پارتی بۆ کاک مەسعود نارد. بە داخەوە سەفەری کوردستانم بۆ نەکرا و درنگتر لە وەلامی پیرۆز باییەکەم دا ئەم نامەیەی کاک مەسعودم پێگەیش کە جێگای سوپاسە.

دەقی نامەی ڕێزدار کاک مەسعود بارزانی : ١٩٩٩/١١/٧

« بەڕێز کاک کەریمی حسامی  سلاو:

بە سوپاسەوە، نامەی پیرۆزباییتان بۆ پارتیمان بە بۆنەی گرتنی کۆنگرەی (١٢)مین وەر گرت. وێڕای ڕێز و خۆشەویستیمان بۆ ئێوەی بە ڕێز، لە یەزدانی مەزن دەپاڕێینەوە هەر دەم بەختەوەر و سەر فراز بن. مسعود بارزانی.»

**سەفەر بۆ کانادا**

ڕۆژی ٩٩/٨/٤بەرە و کانادا سواری فڕۆکە یەکی فنلاندی بووم و پاش هەشت سەعات فڕین بە سەر دەریا و ئوقیانوسدا گەیشتمە تۆرێنتۆ. سەید حوسێنی خوارزام لە گەڵ کاک عومەر.. چاوە ڕوانم بوون. لە وێوە سواری ماشین بووین بۆ لەندەن و ئێوارە گەیشتینەوە. ماوەی مانگێک لە کانادا میوانی حوسێنی خوارزام بووم. نە پێویستە باسی خزمەت و میوانداری ئەم خوارزا خۆشەویست و جوامێرە بکەم و نە قەڵەمیش دەتوانێ جوامێری و ئینسانیەتی بێنێتە سەر کاغەز و تەواو هەقی خۆی بداتێ. بەڵام دەبێ یەک دنیا سوپاسی تەواوی ئەو دۆست و هاونیشتمانیە کوردانە ش بکەم کە لەو ماویەدا بە سەر دان و میوانداری و هاتووچۆ لێم خافڵ نەبوون و هەمیشە شاد و سەر فیرازیان کردووم . دوکتور ئیبراهیم عەزیز بە پێکەنینە خۆشەکەی و باسە شیرینەکانی بە ڕاستی زۆر جار دانیشتنەکانی خۆش دەکرد و لە ئاخردا وتو وێژێکی چاپەمەنی بۆ گۆڤاری تیشک لە گەڵ کردم کە بە کوردی لە کانادا دەر دەچێ. دەکرێ بە تایبەت سوپاسی هەستی دۆستایەتی و ئینسانیی کاکە ڕەش و کاک فریاد ڕەواندزی بکەم کە جگە لە میوانداری کوردانە، نەیانهێشت لە دەنگ و باس و ڕووداوەکانی کوردستان بێ خەبەر بم. چونکە لە کانادا ڕادیۆ کوردی و فارسی و عەرەبیەکان ناگیرێن  کە سێکی ئینگلیزی نەزانێ بە یەکجاری لە دنیا بێخەبەر دەبێ. کوردەکانی دانیشتووی کاناداش بە پێچەوانەی کوردەکانی

ئوروپا کەمتر خۆیان بە دەنگ و باس و سیمینار و ڕووداوەکانی کوردستانەوە ماندوو دەکەن. باسی پیتزا و تاکسی و چوونی مەزرابۆ کار لە وێ برەوی زیاترە. بەڵام ئەم دوو برادەرەی سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان جگە لە میوانداری کوردانە یەک ڕۆژ منیان بێ خەبەر ڕانە گرت بە تایبەت کاکە رەش هەموو ڕۆژێ کوردستانی نوێی لە ئینترنێت والاتحاد عەرەبی بۆ دەناردم. ناکرێ پیاوەتی و دڵ فراوانی ئەم دۆستە بەڕێزانەم لە بیر بچێتەوە. بۆم دەر کەوت لە یەکێتی نیشتمانیشدا کە سانی وا هەن کە وێڕای ناکۆکی هێندێ بیر و بۆچوون دەتوانن ئوسوڵی شارستانیەت و هاو نیشتمانی و تەنانەت دۆستایەتیش ڕەچاو بکەن و بیپارێزن.

لەو ماوەیەدا هێندێ لە ئەندامانی حیزبی دێموکرات هاتنە سەردانم و تازە کردنەوەی دیدار و کورتە باسی ڕابردوو، بە تایبەت میوانداری و هاتووچۆو میوانداری کاک ڕەحیمی بهروز دۆستێکی قەدیم و کادرێکی تێکۆشەری ناوچەی سندوس کە لە گەڵ خێزانێکی ١٣ نەفەری پاش خەبات و بریندار بوون دەکەوێتە بەر هەڵوێستی( دێموکراسیانە و ئینسانانەی ) ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکرات و لە حیزب دەردەکرێ و ماوەیەکی زۆر لە تورکیا لەو پەڕی تەنگانەی ژیان و مەترسی دانەوەی بە ئێران نەمر نەژی ڕۆژ دەباتە سەر ، تا لە کانادا وەر دەگیرێ و جارێکی تر دەبێتەوە بەر پرسی ڕێکخراوی حیزبی دێموکرات لە کانادا.!

ڕۆژێکیش چووینە نیاگارا تەماشای ئەم شوێنە جوان و دیمەنە سروشتیەی نیاگارامان کرد کە نرخی ئەوەی هەیە لە شوێنی دووریشەوە بچیە تەماشای و سەیری بکەی.

دوکتور ئەمیری حەسەنپور و خێزانی تەشریفیان هێنا و بەو سەر دانە شادیان کردم. کورش شهابی و هوشیاری ماوەرانی هاتنە لام و تازە کردنەوەی دیدار و یادی ڕابردوو چێژی تایبەتی هەیە و بۆ من جێگای خۆشی بوو.

بڕیارم دا سەرێکی ئەمریکا بدەم. لە گەڵ حوسێنی خوارزام ڕۆژی ٨/١٥ بە سواری ماشین بەرەو ئەمریکا کەوتینە ڕێ. ڕێگایەکی دوور تا گەیشتینە واشنگتۆن دە سەعاتی خایاند. بەڵام ڕێگاکە ئەوەندە جوان و سەر سەوز و دلگیرە کە مرۆڤ هەست بە هیلاکی ناکات. لە ئەمریکا میوانی موعتەبەر

شیروانی و دەسکۆی دۆستی دوور بە دوور بووین. هەر چەندە دە سەعات ڕێگا تا ڕادەیەک هیلاکی کرد بووین، بەڵام پێشوازی دۆستانەی خانە خوێی بە ڕێز و خۆشەویست، هیلاکی ڕێگای دووری لە بیر بردینەوە. کاک ئاوات عەلیاریش ئەو ئێوارە لە وێبوو. دیداری کاک ئاواتیش وەک ڕوناکبیرێکی شارەزا و تێگەیشتو و لە بەر دڵان دانیشتنی ئەو شەوەی خۆشتریش کرد.

کاک عومەر دزەیی بە تەلیفون بە خێر هاتنی کردم و گوتی: ئەوا هاتیە قەڵای ئیستعماریش. گوتم هاتووم بزانم بیڕوخێنین یا جارێ لێیگەڕێین. دوو ڕۆژ لە گەڵ دەسکۆ چووینە دیداری کۆشکی سپی ناوەندی تەون وجاڵجاڵوکەی سەرمایەداری و پارێزەری مافی مرۆڤی سوور پێستەکانی ئەمریکا.! و سەر دانی کتێبخانەی کۆنگرە و هێندێ شوێنی تری واشنکتۆن بەشێکی تری گەشتەکەمان بوو. . سەردانی بەشی کوردی دەنگی ئەمریکامان کرد و لە گەڵ کارمەندانی بەشی کوردی ناسیارێکی کورتمان پەیدا کرد و لە گەڵ دوکتور ئیسماعیل سەر پەرشتی بەشی ڕۆژهەلاتی ڕادیۆ ئەمریکا دانیشتن و گفتگۆیەکی نیو سەعاتەی شیرینمان هەبوو. دوکتور ئیسماعیل گلەیی ئەوەی هەبوو کە کوردەکان نووسراوە و بۆچوونەکانی خۆیان بە ئینگلیزی بڵاو ناکەنەوە و بێگانە کەمتر ئاگاداریان لە مەسەلەی کورد هەیە. لە ئاخری قسەکانمان دوکتور ئیسماعیل گوتی باشە کورد هەتا کەنگێ واز لە دوو بەرەکی و دوژمنایەتی نێو خۆیان ناهێنن و لە ڕێگای یەکێتییەوە چاری مەسەلەکانی خۆیان ناکەن. گوتم دوکتور لە گەڵ عەرەبان گەورە بووین و تەربیەتی وانە بۆمان ماوەتەوە. پێکەنی گوتی قسەم نەما.

لە ڕادیۆ دەنگی ئەمریکا موعتەبەر شیروانی لە سەر کتێبە تازەکەم ( کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و حکوومەتانی ناوچەدا ) و هێندێ مەسەلەی تر وتو وێژێکی لە گەڵ سازکردم . کاک عومەر دزەیی بۆ خواردنی نیوە ڕۆ داوەتی کردین. شەوێکیش لە واشنکتۆن کاک ئاوات عەلیار لە کەبابخانێکی بۆکانی داوەتی کردین کە تام و چێژی تایبەتی کوردستانی هەبوو. دوکتۆر کەماڵ کەرکوکی بۆ سەردانی دەفتەری پارتی لە واشنکتۆن داوەتی کردین . بارەگایەکی ڕێک و پێک و پەرداخ و پڕ لە کتێب و ئامرازی پێویستی باڵیۆز خانەیەک. دوای سەردانی دەفتەر بۆ خواردنی نیوەڕۆش هەر میوانی دوکتۆر

کەماڵ بووین، شەوێکیش کاک جەماڵ نوێنەری حیزبی دیموکرات داوەتی کردین و دانیشتنێکی کوردانەی خۆشمان هەبوو. پاش چەند ڕۆژ زەحمەت دانی خانە خوێی بەڕێز و وەر گرتنی دیارییەکی بە نرخ کتێبی ( کوردستان لە سێبەری مێژوو دا) لە لایەن خوشکە موعتەبەری بە ڕێزەوە بە دنیایەک یاد و بیرەوەری خۆش و فەرامۆش نەکراو مالاوابیمان خواست و بەرەو کانادا گەڕاینەوە. چەند ڕۆژی دیکە لە لەندەن لە گەڵ دۆست و ناسیاران ڕۆژمان بردە سەر و ٩٩/٨/٢٦ گەڕامەوە بۆ ستۆکهۆلم.

**خەبەرێکی دڵتەزێن**

٩٩/١١/١٣ بەیانی زوو زەنگی تەلەفون لە خەوی ڕاپەڕاندم. خوارزایەکم لە وڵاتەوە دوای سڵاو و چاک و چۆنی گوتی: « خاڵە بە داخەوە دەبێ خەبەری مردنی پورمت بدەمێ کە دوێنێ ئەتو خۆش، کۆچی دوایی کرد و ئێستا لە گەڵ دایکم لە ماڵی وانین.» خەبەرێکی داخدار و دڵتەزێن بوو. ئەوە شەشەمین نەفەری کەس و کاری من بوون کە بە حەسرەتی دیداری من سەریان ناوەتەوە و تەنانەت لە سەرە مەرگیشدا لە دیداریان بێ بەش بووم.

ساڵی ١٩٥٤ لە زیندان بووم، باوکم خێزانم و کیژێکی دوو ساڵەم مردن و ڕێگایان نە دام کە لە ژێر سەر نێزەی سەرباز و ژاندارمیش دا بۆ ناشتنیان بچمە سەر قەبران.

ساڵی ١٩٥٨ تازە لە بەر دەستی حکوومەتی شا دەر باز ببووم و لە عیراق بووم، برادەرانی حیزبی خەبەری مردنی دایکمیان بۆ ناردم. ساڵی ١٩٦٨ لە بولغارستان خەبەری مردنی خوشکێکم بۆ هات کە لە هەموومان کەم تەمەنتر بوو.

لە سویدیش ئەوا کۆچی دوایی خوشێکمیان پێ ڕاگەیاندم کە بیست ساڵ بوو نەمدیبوو. بیست ساڵ بوو بە هیوا و ئاواتی دیتنەوەی من دەژیا. ئاواتی منیش دیتنەوەی نیشتمان و دیداری ئەم دوو خوشکەم بوو کە وا یەکیان لە دوورەوە مالاوایی لێکردم و داخداری کردم.

ئێستاش ئەوا دونیا پێ دەنێتە هەزارەی سێیەم و مرۆڤایەتیش سەرەڕای ئەوە

کــە گــەیوەتە ئەو پەڕی پێــشکەوتنی زانست و تەکنیک و خــەریکە دەست دەگەیێنێتە ئاسمـانان و زیتریش، بەڵام هێشتا ناتەبایی و ئاڵۆزی و یاسـای جەنگەڵ بە سـەر جیـهـاندا زاڵە. لە کۆتایی هەزارەی دووەم دا نیـزیکەی دوو میلیـارد کەس لە ژێر خەتی فەقر دا دەژین و ڕۆژانە بە یەک دۆلار ژیانی نەمر نە ژی دەبەنە سەر. ئێمەش هەر وا بە ئاواتی ڕزگاری لە ئاوارەیی و هەڵکێشانی داخی دوور بە دوور بۆ ئازادی و دێموکراسی و شاد بوونەوە بە نیشتمـان و دۆست و برادەر و کەس و کار لاپەڕەی هەشتا ساڵەی تەمەن هەڵدەدەینەوە.

لەم بەرگە و لە نووسینەکانی دیکەش دا، زۆر لەو نامانەم بڵاو کردوونەوە کە دۆست و برادەران بۆیان ناردووم و یا نووسەر و ڕوناکبیران بیرەوەرییەکانیان بە ڕەخنە و هەڵسەنگاندن بەسەر کردۆتەوە. دەمەوێ لێرەدا نامەیەکی خۆشم بڵاو بکەمـەوە کە بە بۆنەی دەرچوونی کتێبێک لە سەر ژیان و بە سـەر هاتی مامۆستا عبدالرحمن زەبیحی لە ڕێگای مانگنامەی(پەیام)ەوە بۆ عەلی کەریمی خوارزای زەبیحیم ناردووە.

**نامەیەکی کراوە بۆ کاک عەلی کەریمی.**

وێڕای سـڵاو، کـتێبی« ژیان و بە سـەر هـاتی عـبـدالرحـمـن زەبیـحی» کۆ کردنـەوەی جەنابتم خوێندەوە. سوپاس بۆ کاک حەمەدەمینی سیراجی کە بۆی هێنابووم. بە لە بەر چاو گرتنی ئەوەی کە لە سـەر دەمی کۆمەڵەی ژێکافـەوە تا بێ سەرو شوێنچوونی مامۆستا زەبیحی کەم و زۆر لە بەسەرهات و ڕووداوەکان دوور نەبووم و ماوەیەکی نەکەمیش لە نیزیکەوە لە گەڵ مامۆستا دیدار و ڕۆژ باشم هەبوە، بە پێویستم زانی بیروڕای خۆم لەسەر زەحمەت وتێکۆشانت بۆ کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ئەم کتێبە دەر ببڕم. لە پێشدا ویستم ئەم نامەیە ڕاستـەو خـۆبۆ خـۆت بنێرم، بەڵام لەبەر ئەوەی شـوێن و ئادرێست نازانم و کتێبەکەش دەمێکە بڵاو بۆتەوەو کەوتۆتە بەر باس وبۆچوونی جیاوازیش، بڕیارم دا لە ڕێگای ڕۆژنامەی( پەیام)ەوە نامەکە بڵاو بکەمەوە.

سەبارەت بە هەست و سـۆزی خـاڵ و خـوارزایی و بۆ خزمـەت بە ناسـاندنی مامۆستا زەبیحی زەحمەتێکی زۆرت کێشاوە و کتێبێکی ٦٨٤لاپەڕەییت لە سەر

ژیان و بەسەر هاتی خوا لێخۆشبوو ئامادە کردووە و کتێبخانەی کوردیت پێ دەوڵەمەند کردووە. بەڵام بە داخەوە بە بیرو ڕای من نەک هەر ئامانجت نەپێکاوە، بەڵکوو بەم کارە شەخسیەتی سیاسی وئەدەبی و زانستی عبدالرحمانی زەبیحیت هێناوەتە خوارەوە.

مامۆستا زەبیحی لە کۆمەڵی کوردەواری و لە نێو ڕوناکبیر و نووسەرانی کورد دابە یەکێ لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژێکاف و زمانزانێکی نموونە و نووسەرێکی لێهاتوو و دانەری قاموسی بە نرخی زمانی کوردی و بە وێنەی ئینسانێکی هێدی و مەند و لە گەڵ خەڵک گونجاو ناسرا بوو. لە بواری سیاسیشەوە لە کوردستانی عێراق بە ئەندام و لایەنگری جەماعەتی برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی دەناسرا، ئەوەش نەک هەر جێگای ئیراد نیە، بەڵکوو سەر بەخۆیی بیرو بۆچوون و هەڵوێستی خوالێخۆشبوو دەخاتە بەر چاو. ئەوەندەی من لە نێو خەڵک و لە نیزیکەوە لە سەر زەبیحیم بیستبێت هەر ئەوە بوە. لە کوردەواریدا دەڵێن:« چەم بێ چەقەڵ نابێت» جا ئەگەر کەسانێک لە بەر خۆیانەوە جۆرێکی تریش باسی زەبیحیان کرد بێت، قسە و قسە لۆکی پاشملە و بێ نرخ و بۆرەکی بوون ونەهاتوونەتە سەر کاغەز و بڵاو نەکراونەتەوە. بەڵام تۆ بە هەوڵ وتێکۆشان و، بە قەولی خۆت بۆئەوەی « مێژوو بۆ منالان بە ڕاستی بنووسرێ و ببێتە دەرس بۆ نەسلی داهاتوو» ناوت زڕاندوە، شاهیدت بۆ ڕاست کردوونەوە کە داخوا:« مامۆستا زەبیحی پیاوی بەعس و جاسوس و بەعسی و چی وچی بووە یان نا » درۆ و بوختانی سەر زارەکی و بێپێزت کردوونەتە کتێب و زیندووت کردوونەتەوە.

ڕەخنەی دۆستانەی من لە هەوڵ و تێکۆشانی جەنابت و لە دەربڕینی هێندێ لەو شاهیدە ناعادڵانە سەبارەت بە شەخسیەتی مامۆستا زەبیحی بە کورتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆ دەنوێنن:

١- لە سەرەتاوە بە یارمەتی دوکتۆر ئەمیری حەسەنپوور کە بێ بەڵگە و بۆچوونی زانستی دەنووسێت:« بۆ چوونی کاک عەلی کەریمی سەبارەت بە ناکۆکی نێوان قازی محەممەد و زەبیحی و کۆمەڵەی ژکاف و حیزبی دیموکراتەوە ڕاستە»(ل،٢٨) هەوولت داوە وا نیشان بدەی کە قازی محەممەد و زەبیحی ناکۆکیان هەبوە وزەبیحی بەربەرەکانی قازی کردوو. ئەوە جگە لەوە کە

شتی وانەبوە و لەم بارەوە شتێک نایەتە بەر چاو، ئەوەتا دوکتۆر عێزەدین مستەفا لە وتو وێژی نێو کتێبەکەدا دەڵێ:« مامۆستا زەبیحی دیفاعی لە پێشەوا کردووە و لە باسی پێشەواو دیفاع لە پێشەوا داینەنواندوە.» هێنانە گۆڕی ئەم باسە نەک هەر هیچ لە کەسایەتیی زەبیحی زیاد ناکات، بەڵکوو داشیدەبەزێنێت. چونکە لە هەل و مەرجی ئەو زەمان و ئێستاکەش ناکۆکی و دوژمنایەتی لە گەڵ قازی محەممەد لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانەوە بە ناپەسند و بێزراو لێک دراوەتەوە و لێک دەدرێتەوە. جگە لەوە زەبیحی فەقیر و بێکەس ئەوە نە بووە کە لە بارو دۆخی ئەو سەر دەمەدا بتوانێت بەربەرەکانی قازی محەممەد بکات.

۲-زۆربەی شاهیدە تا عادڵەکان و خۆشت هەولی ئەومیان داوە کە وا نیشان بدەن گۆیا حیزبی دێموکرات لە گەڵ زەبیحی ناکۆکی هەبووە. ناچمە نێو ئەم باسە، حیزبی دێموکرات خۆی دەزانێ وەلام دەداتەوە یان نا. بەلام بۆ مێژوو بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە ئەم قسەیەی کاک حەمەدەمینی سیراجی کە دەڵێ:« مامۆستا عولەماش کە باسمان دەکرد بە داخەوە موخالەفەتێکی توند کرا و موخالەفەتەکەش پتر لە لایەن دوکتۆر قاسملوو کاک کەریمی حسامی یەوە بوو» ڕاست نیە و کاک حەمەدەمین لە بیری نەماوە. من دوو بەڵگەی حیزبی دێموکراتم لە لایە:

یەکەم: کومیتەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی ۱۹۷۱/٦/۲۵ بڕیاریدا پێوەندی بە مامۆستا زەبیحییەوە بکرێت بۆ هاوکاری و ڕاوێژ ودۆستایەتی.

دووەم : بوروی سیاسی کومیتەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی ۱۹۷۱/۸/۵ مەسئولیەتی دا بە دوکتۆر قاسملو کە جارێکی دیکەش پێوەندی بە مامۆستا زەبیحییەوە بکرێت بۆ هاوکاری و دۆستایەتی. هیچ کەس لە کومیتەی ناوەندی دژی ئەم بڕیارانە نەبووە.

ئەوەی مەلا عەولا و شێخ لەتیف و فلان و فلان دەیڵێن دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی زەبیحی خۆی کە چەندە ویستوویەتی لە گەڵ کوردەکانی کوردستانی ئێران نیزیک بێتەو و پێوەندییان پێوە بکات. کاک حەمەدەمین لە گەڵ ئەوەی بە جوانی ڕێنوێنیت دەکات کە دەڵێ:« نووسراوەکانی زەبیحی کۆ بکەوە و کارت بەوە نەبێ کە زەبیحی لە گەڵ بەعس بووە و یا زیدی بەعس بووە لە هەر دوو

ڕوودا دەبێ بە بەڵگە قسەی خۆت بکەی» بەڵام هەر لەو کاتەشدا لە قسەکانی ورد نابێتەوەو دەڵێ:» کاک کەریمی حسامی خۆی بە دەبیری دووەم دەزانی کە قەت قەت دەبیری دووەم لە بەرنامەی حیزب دا نەبوە» کاک حەمەدەمین دەزانێ کە کەریمی حسامی لەسەر پێشنیاری دوکتور قاسملو، بە تێکڕایی دەنگی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی، بە جێگری سکرتێر هەڵبژێردراوە. ناوی دەبیری یەکەم و دووەم هەر لە حیزبی دیموکراتدا نەبووە، لە پێڕەوی حیزبدا جێگای جێگری سکرتێریش نەبووە. بەڵام ئەو دەم نە کاک حەمەدەمین و نە کەسیتر هەر باسیشیان نەکردووە. من خۆم لە بەرگی پێنجی بیرەوەرییەکانمدا باسم کردوە، نازانم کاک حەمەدەمین بۆ باسی ئەوەی کردوە کە وا نیە و پێوەندیشی بە پرسیارەکانی تۆوە نیە ؟

٢- بۆ نووسینی « مێژوو بۆ منالانی ئێمە بە ڕاستی» بۆ ناساندنی مامۆستا زەبیحی بە لای منەوە ئەوەندە بەس بوو کە نووسراوەکانی وی بە گشتی کۆ بکرێنەوە( وەک کردووتە) ولە سەر کەسایەتی ئەدەبی و زمانەوانی و کاری قاموسە بە نرخەکەی بەیجوری کرابایە و لە گەڵ کەسانی زانا و نووسەر و زمانزان سەبارەت بە کارە ئەدەبیەکانی زەبیحی وتووێژ کرابایە، وەک ئەوشیروان مستەفا نووسیویەتی، نەک وەک شێخ لەتیف و مەلاعەولای لێ بکەیە شاهید کە بڵێن:

- کە لە حەپسێدا بوو مامۆستا عەبدوڵڵە خەبەری منداڵەکانی تەیموری بەختیاریشی دایە کە ئەوانیش لایەنگری مامۆستا عولەمایان زۆر دەکرد و حەولیان دەدا کە شتێکی بۆ بکەن.(ل، ١٦٥

- یان بڵێ: من هەر لەوە سەرمان سوڕ دەمێنێ ئەو پیاوە لەگەڵ جیهازە تایبەتیەکانی حکوومەت زۆر تێکەڵ بووە، زۆریان خاتر دەگرت حەتا ئاخر جار پڕ جیبێک کەلاشنیکۆف بە خەزانە و بە فیشەکەوە پێیاندا ناردە لە بۆ عێزەدین حوسێنی چوون لە لای مەریوان جەماعەتی قاسملو هاتن سیلاحەکانیان لێ ستاند بردیان . (ل، ١٦٩-١٧٠)

- یان بڵێ : وەرە لێکی دەینەوە ئەو پیاوە کە ئەوەندە جێگای باوەڕیان بێ، سیلاح و پارەی پێدا بنێرن بۆ عێزەدین حوسێنی بۆ دەبێ بیگرن و بیکوژن. ( ل ١٧١ ،)

- یان بڵێ : دەمیان بردە جێگای زۆر سرڕی. کوڕە لە کولیەی ئەمنی قەومی مەحازەرەی دەدا . ( ل ، ١٧٨ )

- یان بڵێ: بە حیساب لێرە سیلاحی وەر دەگرت دەیبرد بۆ عێزەدین و دوایی لە گەڵ مام جەلال خەریکی شتی دیکە دەبوو، هەر لەو شتە تێدا چوو. ( ل ، ١٧٩)

چ پێویست بوو تۆ خۆت شک و گومان بخەیە سەر خاڵت و لە مەلا عەولا بپرسی: « ئەندامی بەعس بووە یان نا.؟»

یان بڵێی: کۆمەڵێک لەو خەڵکانەی لە بەغدا هاتبوونەوە زۆریان دعایەی ئەوە بۆ دەکرد کە بەعسییەو شتی وا »

- یان پرسیار لە مام جەلال بکەی: « یانی ئەوە بە ویوە نانووسێ کە کاتی خۆی پێیان دەگوت بەعسی » ئەویش لە وەلامدا بڵێ :« قەت قەت شتی وای نەکردوە، قەت نە بەعسی بووە نە سەر بە حکوومەت بووە و نە دۆستی حکوومەت بووە.»(ل،٢٢٣)

- یان برایم ئەحمەدی لێ بکەی بە شاهید کە بڵێ:« پێوەندی بە عیسی پژمان و بەختیار و ئەوانەوە هەبووە.»

- یان کاک حەمەدەمین بڵێ:« ئەمن وا فیکر دەکەمەوە بەعس یارمەتیەکی زۆری لە کاناڵی مامۆستای ڕا بە شێخ عێزەدین و شێخ جەلال و وانە کرد. ئەوە هیچ شکم تێدا نیە. لە وەشدا کە بەشێک لەو یارمەتیە گەیوەتە دەستی هێزەکانی مام جەلال دەوەشدا شکم نیە کە دەنێو جەماعەتی مام جەلالیدا ئیوا زۆر بووە کە خەبەری داوە لە ڕابیتەی مامۆستا لە گەڵ مام جەلال دەوەشدا شکم نیە، ئەمن پێم وایە لە بەینچوونی مامۆستا لە ڕابیتە لەگەڵ ویدا بووە.»( ل ، ٢١٤)

- یان شێخ عێزەدین بڵێ :« زەبیحی ڕاستە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق گونجانێکی بووە. ئەمما لە گەڵ مام جەلال و ئەوانە یەک بووە بە جۆرێک ئەو لای ڕاگرتووە جا نازانم چۆن؟ بەلام بەعسی بەو مەعنایە لە خزمەت ئەواندا بێ و کار بۆ وان بکا وەک ناحەزەکانی بلاویان دەکردەوە و تەبلیغاتیان پێوە دەکرد ئەوە نەبوو.» (ل ، ٢٤٧)

- یان شێخ عێزەدین هۆی لەبەینچوونی ئەو بە نامەی مام جەلال و یان

هێنانی چەکی بەعس و دانی بە یەکێتی نیشتمانی بزانێت.
- یان یوسفی ریزوانی بنووسێت: « مامۆستا زەبیحیش بە تۆمەتی جاشی ٦٦ کەوتە بەر تۆمەتی جۆراجۆر»
- یان کۆنە نووسراوەیەکی لە بیر چۆوەی دوکتۆر جەماڵ نەبەز بێنیە نێو ژیان و بە سەر هاتی زەبیحی و زیندووی کەیەوە.
- یان ئەمیری حەسەن پوور بنووسێت:« لاپەڕەیەکی تاریک لە ژیانی سیاسی زەبیحی دا پێوەندی گرتن لە گەڵ تەیموری بەختیار و پەناهیان و پژمان و دەستە و دایرەی دژ بە ئێرانە..ڕابردوویەکی لە ڕوانگەی هێزی چەپ پەڵە دار بیوو. پێوەندی لە گەڵ بەختیار، پەناهیان و بەعس - با خۆشی بە هیچ کامیان نە فرۆشتبێ- زەبیحی لە پێش چاوی چەپ خستبوو.» ( ل ، ٢٤-٢٢)
بە بۆچوونی من ئەو قسەو دەر برینانە نەک هەر بۆ منالانی ئێمە و بۆ نەسلی داهاتوو سەبارەت بە کەسایەتیی مامۆستا زەبیحی نابنە دەرسێکی بە نرخ، بەڵکوو دەبنە هۆی ورووژاندنی شک و گومان لە سەر ژیانی سیاسی مامۆستا زەبیحی و هێنانە خواری کەسایەتیی وی. ئەم بۆ چوونەت ڕاستە و جێگای لێ ورد بوونەوەیە کە دەڵێی :« بە پێویستی دەزانم کە وەبیر هەموو ئەو کەسانە بێنمەوە کە بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە هاو خەباتی زەبیحی نە دەبوو لە حاست ئەو هەموو بوختان و تۆمەتانە بێدەنگ بن و هیچ نەڵێن چونکە خۆشیان دەگرێتەوە.» ( ل ، ٤١٠)
بەڵێ ڕاستە و باش بۆ مەسەلەکە چووی. ئەوان باش دەزانن کە هێندێ مەسەلە بۆیە نابن چیلکەیان تێوەردەی. هەر بۆیە وایان پێ باشە بەردی لە سەر دانێن و وەبیر خەڵکی نەهێننەوە. لە خوایان دەوێ ڕابردوویان فەرامۆش بکرێت.
بە کورتی بۆچوونەکانی من لە سەر بەشێکی نێوەرۆکی کتێبەکە ئەوانە بوون بەڵام بەشەکەی دیکە- واتە کۆ کردنەوەی نووسراوەکان- بە کارێکی باش و بە نرخی دەزانم و خۆزیا کتێبەکە هەر ئەوەندەی تێدابایە. لێرەدا با ئەوەش بڵێم کە ئەم زەحمەت و تێکۆشانەی تۆ ئەو فایدەشی هەیە کە هێندێ کەسی دەروێشێ دواکەوتووی هەلپەرست وریا دەکاتەوە و تێیان دەگەیێنێت کە بزانن دەفتەری مەلا شێخ عێزەدین بۆ ( ئازادی و شۆڕش وخود موختاری وئابووری

سۆسیالیستی کوردستانی ئێران) چۆن دامەزراوەو لە کوێ دامەزراوە و ئامانج و ئارمانی چ بووە و پاڵی وەکێ داوە؟. وەک جەنابی شێخ خۆی دەفەرموێ. جگە لەوە هێندێ ڕووداوی داپۆشراوی کوردستانی ئێرانیش دەخاتە ڕوو کە تەنیا هەر دەوڵەتانی داگیر کەری کوردستان نین دەست دەخەنە نێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، بەڵکوو ئاڵا هەڵگرانی کوردایەتیش لە تێخزان و تێکدانی بزووتنەوەی بەشەکانی جیاوازی کوردستان دەست ناگێڕنەوە.

ئێستا با دوو قسەی خۆمانەش لە گەڵ خۆت بکەم!

یەکەم: کاک عەلی بەڕێز! وەک خۆت باست کردوە من بۆ یارمەتی و ڕێز گرتن لە مامۆستا زەبیحی گوتم وتارێکی بە نرخی زەبیحیم لایە لە بولغارستانە و بۆت دەنێرم. قەرارماندا کە لە گەڵ وتارەکە دە دانە بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانی خۆمت بۆ بنێرم کە بۆم بفرۆشی. قبوڵت کرد و بەڵێنت دا. هەر وەک نووسیوتە:« زۆری پێنەچوو کاک کەریم وەک مەردان وەعدەی خۆی بە جێ هێنا و بە پۆستەدا ئەو نووسراوەی پێگەیاندم.»

بەڵێ، من وەک بەڵێنم دابوو ئەم وتارەم لە گەڵ دە بەرگی دەیەمی بیرەوەرییەکانم بۆ ناردی. بەڵام تۆ وەک (مەردان) وادەو بەڵێنی خۆت نە بردە سەر. نەک هەر کتێبەکانت بۆ نەفرۆشتم، بەڵکو پاش ساڵێک لە ڕێگای مەلا ڕەسوڵی پێشنمازەوە چوار دانەم لە کتێبەکان پێگەیشتەوە و شەش دانەکەش لای تۆ سەریان تێدا چوو. جا تۆ کە ویستووتە مێژوو بۆ منداڵان بە ڕاستی بنووسرێت، دەبوایە ئەم ڕاستیەشت بۆ مێژوو هەر نووسیبایە. خۆ ئەوە ئەگەر مێژووش نەبێت، بەشێکە لە ئەخلاق و وادە و بەڵێنی مرۆڤی کورد. دیارە من فەوتانی شەش دانە کتێبم پێ گرنگ نەبووە و باسیشم نە کردووە. ئەزموونی ئەوەندەم بە دەستەوە بوو کەسێکی لە پێشمەرگایەتییەوە ببێتە کاسبکار و ببێتە نووسەر و ببێتە ڕاوێژ کاری گۆڤارێکی ئەدەبی و فەرهەنگی، نابێ چاوە ڕوانیی ئەوەی لێبکەی کە وەک ( مەردان) وادەو بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر.

دووەم: کاک عەلی بەڕێز! تۆ مەلا ڕسول وکاک حەمەدەمینی سیراجیت لە گەڵ خۆت بۆ ماڵی من هێنا و داوات کرد کە سەبارەت بە مامۆستا زەبیحی وتووێژت لە گەڵ بکەم. دەزگای ڤیدیۆ و فیلم و ئەوانەشت هێنا بوون. ئامادەت کردن و پرسیاری زۆرت کردن و وەڵامی درێژیشت لە من وەرگرتنەوە، بەڵام لە

کتێبەکەت دا قسەکانی من دیار نین و هەر باسیشت نە کردوە. جا ئەگەر تۆ سەبارەت بە فیکرو هەڵوێست و بۆ چوونی خۆت بڵاو کردنەوەی وتووێژمکەی منت بۆ مامۆستا زەبیحی بە قازانج نە زانیبێت، بۆ من جێگای شادی بوو کە ناوی منت نە هێناوەتە نێو ناوی ئەم شاهیدانە کە زۆریان لە کۆمەڵی کوردەواریدا سەبارەت بە ( ڕابردووی خاوێنیان ) بە شاهید ناشێن و قسەکانیشیان هیچ سەنگیان نە خستۆتە سەر کەسایەتی زەبیحی.

سێیەم: بە پێویستی دەزانم ئەم هەڵەیەشت ڕاست کەمەوە کە دەفەرمووی:« چوومە دەفتەری حیزبی دێموکرات گوێم لێ بوودوکتۆر قاسملو بە کاک کەریمی حسامی دەگوت: « مەهاباد دەکەینە ستالین گراد» کاک عەلی بەڕێز! ئەم باسەت لە بەرگی شەشەمی بیرەوەرییەکانی مندا خوێندوتەوەو بە کەیفی خۆت داتڕشتۆتەوە. ئەو دەمی کە ڕۆژی یازدەی خەرمانان، ١٩٧٩/٩/٢داوام لە خەڵکی مەهاباد کرد کە لە فەرمانداری کۆ ببنەوە تا بار و دۆخی شار و چۆنیەتی بەرگری و پاراستن لێک بدەینەوە، پاش دەربڕینی بیرو ڕای خەڵک نۆرەی من هات و گوتم : من لێرەدا بە ئاشکرا ڕادەگەیێنم کە ئێمە مەهاباد دەکەینە ستالین گراد، ئەو دەم نە دوکتۆر قاسملو ونە تۆ و نە هیچ کەس لە( شۆڕشگێڕانی) ئەو کات لە مەهاباد نەمابوون و بە قەولی کاک عومەری قازی(شوجاعانی فراری) دەمێک بوو شاریان بە جێهێشتبوو لە بێوران تێپەڕیبوون. بڕوانە بەرگی شەشەمی لە بیرەوەرییەکانم( لاپەڕەی ١٦٤-١٦٦) ئیتر خۆشیتان کەریمی حسامی ١٩٩٩/١١/٦

**ساڵی دوو هەزاری زایینی**

لەگەڵ ئاوا بوونی ڕۆژەکانی ساڵ ١٩٩٩ و سەرەتای ساڵی دووهەزار تەمەنی پڕ لە کوێرەوەری و خەباتی پڕ هەلس و کەوتی منیش لاپەڕەی هەشتا ساڵەی خۆی هەڵدایەوە. هێندێ لە دۆست و برادەران بە تایبەت کاک حەمەدەمینی سیراجی و هەر وەها خوارزاکانم هەوڵیان دەدا کە بەم بۆنەوە ساڵۆنێک بگرن و ئاهەنگێک ساز بکەن. لە گەڵ سوپاس بۆ هەستی دۆستایەتی و بیر و بۆ چوونی جوامێرانە و پیرۆزیان بە ڕاستی بە پێویستم نەزانی ئەم ئەرک و زەحمەتە بخەمە سەرشانی برادەران. چونکەهەشتا ساڵ ژیان نەیتوانیوە ئەوەندە خزمەت

بە نەتەوەکەی بکات کە شایانی شتێکی وابێت. بەڵام دیسان منداڵەکان دانیشتنێکیان ساز کرد و کاک حەمەدەمین و ڕوناک خانیش دانیشتنەکەیان ڕووناکتر کرد و هەشتا ساڵەمان بەڕێکرد بێ ئەوەی لە ژیاندا بە ئامانجێک گەیشتبین.

تێپەڕینی دوو هەزارە و چوونە ژووری هەزارەی سێهەم لە سەرانسەری دنیادا گەڵێکی پێهەڵا گوترا و لە سەری نووسرا و ئاهەنگیان بۆ گێڕا و ڕەنگبێ بە میلیۆنها دۆلاریش هەر بەم بۆنەوە خەرج کرابێ. مرۆڤایەتی لە کاتێکا پێ دەنێتە هەزارەی سێهەم کە هیچ کاتێ ئەوەندە توانای زانستی و داهێنان و دەرمتانی هەراو و لە ڕادەبەدەری بۆ بەرهەمهێنان و ئاسایش نەبووە. بەڵام هیچ کاتێکیش ئەوەندە نابەرانبەری و فەرق و جیاوازی لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا پەرەی نەگرتوە. جیهانی هەزارەی سێهەم واقعیەتێکی بەرچاوە. حەشیمەتی چەند میلیارد کەسی جیهان لە پاپۆڕێکدا سەفەر دەکەن. بەڵام موسافیرەکانی ئەم پاپۆڕە لە هەل و مەرجێکی زۆر جیاواز لە یەکتر لە ڕێگا دان. زۆربەی هەرە زۆری ئەو موسافیرانە لە بارو دۆخێکدان وەک کۆیلەکانی سەردەمی ڕابردووی کۆلۆنیالیستی کە بۆ ئەمریکایان دەبردن. ٨٥٪ ی ئەو موسافیرانە لە عەمبارەکانی پیس و تاریکی پاپۆڕ دا خراونەتە سەر یەک و لە برسان ولە نەخۆشی و لە هەژاریدا دەمرن.

نە هەزارەی دووەم و نە سەرەتای هەزارەی سێهەم و نە سیستمی نوێی جیهانی جگە لە شەڕ و خوێن ڕێژی و برسیەتی و فەرق و جیاوازی شتێکی تازەیان بۆ زۆربەی حەشیمەتی سەر ڕووی جیهان نەهێنا. بە بۆنەی هاتنی هەزارەی سێهەم وتاری زۆر لە ڕۆژنامەکاندا نووسرا و لێکدانەوەی جۆر بەجۆری لە سەر کران، منیش بۆ چوونێکی ئاسایی‌م هێنا سەر کاغەز کە لە ژمارە ١١٥ی گۆڤاری بەربانگدا بڵاو کرایەوە و لێرەشدا جارێکی تر دەینووسمەوە:

**، مرۆڤایەتی لە هەزارەی سێهەمدا،**

مرۆڤایەتی وا چەند مانگە سەدەی پڕ لە کارەسات و پێشکەوتن و تراژیدی سەدەی بیستەمی بە جێهێشتووە وگۆزەی ڕەشی لە دوا شکاندووە و پێی ناوەتە سەدەی بیست و یەکەم و هەزارەی سێهەم. لەو ماوە کورتەدا گەلێک

هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لە سەر سەدەی ڕابردوو کراون و لە ڕوانگەی جۆر بەجۆرەوە ڕووداوەکانی سەدەی بیستەم لێک دراوونەوە. هێندێ ڕووداوی جۆر بە جۆریش بۆ داهاتوو پێشبینی کراون. هەمووی ئەم نووسراو وبۆچوونانە بە نۆرەی خۆیان بۆ تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی گشتی و وەدەستهێنانی هێندێ دەرس و ئەزموون لە ڕابردوو ڕەنگە سوودی خۆیان هەبێ. دیارە پێشبینی سەبارەت بە ڕووداوی دواڕۆژ و قسە لە سەر چۆنیەتی ڕەوەندی بەرەو پێشچوونی ڕووداوەکان لە ڕوانگەی سیاسییەوە لە وانەیە زۆر جێگای دڵنیایی نەبن. ئەزموونی بە سەرهاتەکانی چەندین ساڵەی ڕابردووی جیهان فێرمان دەکات کە سەبارەت بە هەرەکەتی پێشەوە چوونی مێژوو مرۆڤ ناکرێ هیچ حوکمێکی نەگۆڕ و لێبڕاو بدات. چونکە زۆر جار ئەوەی مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە و هەڵیدەنێ، پێچەوانەی ئەو دەردەکەوێ. بەڵام دەکرێ لە سەر بنەمای نووسراوەو دوکۆمێنتی باوەڕ پێکراو و ئەزموونی شەخسی، ئەگەر سەرپێییش بێ چاوێک بە ڕووداوەکاندا بگێڕێ و پێیاندا بچێتەوە.

سەدەی بیستەم لە مێژووی دوو هەزار ساڵەی زایینیدا بە هێندێ کارەسات و بەسەرهاتی پڕلە کێشەو هەراو خوێن ڕێژی دەخوێنرێتەوە کە لە گەڵ بە سەرهاتی سەدەکانی پێشوو فەرقیان هەیەو بە کورتی بۆ باسکردن دەبن.

– لە سەدەی بیستەمدا لە سۆنگەی سەر هەڵدانی دوو شەڕی دنیاگر بە قەدرایی تەواوی مێژووی دوو هەزار ساڵەی زایینی خەڵک دەکوژرێ و شارو گوند وێران دەکرێن. ئەگەر لە شەڕی یەکەمی دنیاگردا ئیمپراتوری وەحشی و دواکەوتووی وەسمانی لە بەر یەک هەڵدەوەشێ، دەسەڵاتی کۆلۆنیالیستی ئەو کەم دەکرێتەوەو هێندێ وڵات و خەڵکی دیکە، لە وانە کوردستانیش دەکەونە ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیستی دەوڵەتانی سەرمایەداری ڕۆژئاوا و بە واتەیەکی تر، دنیا لە نێوان چەند دەوڵەتی کۆلۆنیالیستی زلهێزی جیهاندا دابەشدەکرێ.

– لە سەدەی بیستەمدا شۆڕشی سۆسیالیستی ئوکتۆبر وەک گرنگترین ڕووداوی مێژوو بەرپا دەبێ و بە قەولی جۆنرێد

« ئەودەڕۆژەی دنیای لەرزاند» نەک هەر لە پانتایی شەش یەکی گۆرەی زەوی سیستمی کۆمەڵایەتی و دەرەبەگی و سەرمایەداری لە بنەوە هەڵدەتەکێنێ، بەڵکوو دڵە ڕاوکە دەخاتە سەر تەواوی سیستمی سەرمایەداری جیهانی

وگەلانی ژێر دەستەش لە خەو ڕادەپەڕێنێ.
- لە سەدەی بیستەمدا لە ئەڵمانی تێشکاوی شەڕی یەکەمی دنیاگر، لە سەر بناخەی ڕەگەز پەرستی، فاشیزم سەر هەڵدەداوبۆ دابەشکردنەوەی سەر لەنوێی جیهان و وەرگرتنی بەشێکی زیاتر لە وڵاتانی کۆلۆنیکراو، شەڕی دووەمی دنیاگر ساز دەکات. لە ئەنجامی شەڕی دووەمی دنیاگردا، جگە لە کوشتاری زۆری خەڵک و وێرانی گەلێک شار وگوندو کارخانەو بنیاتە سەنعەتیەکان، چەند خاڵی دیکە لە مێژوودا تۆمار دەکرێن کە لە ڕەوەندی ڕووداوەکانی جیهاندا دەور دەگێڕن:
- یەکێتی سۆڤیێتی کە لە تێکشکاندنی فاشیزمدا دەوری سەرەکی هەبووە، ئەگەر پێش شەڕ لە لایەن وڵاتانی سەرمایەدارییەوە حیسابێکی بۆ نەدەکرا، دێتە ڕیزو هاوشانی دەوڵەتانی زلهێزی جیهان و بە بێ بەشداری وی مەسەلە نێونەتەوەییەکان بە زەحمەت چارەسەر دەکرێن.
- کۆمەڵی دەوڵەتە یەککگرتوەکان دادەمەزرێت و بە ناهەق ناوی « نەتەوە یەککگرتوەکانی» بە سەردا دەبڕن. چونکە زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی لە وێدا ئەندامن و نوێنەریان هەیە، نوێنەری خەڵک و نەتەوەی وڵاتی خۆیان نین بە کۆدیتاو ملهوڕی و هێزی پۆلیس و لەشکر دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست.
- پرۆسەی ئازادی وڵاتانی داگیرکەراو و کۆلۆنیکراو دەست پێدەکرێ.
- تیئۆری زانستی ئاتۆم وەڕاست دەگەڕێ. دەوڵەتی ئەمریکا لە سەردەمی شەڕدا، بۆمی ئاتۆمی بە سەر خەڵکی هیرۆشیمادادەدا. تەقاندنی بۆمی ئاتۆم و بە کار هێنانی لە لایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە، مرۆڤ توشی ئەم بیرە دەکات کە زانست لە پەنا لایەنی پڕ لە خێر و پێشکەوتنی تەکنیک و داتاو ئەنفۆرماتیک، لایەنی دزێوی قڕکردن و نابوتی مرۆڤایەتیشی هەیەو ناکرێ جێگای نیگەرانی نەبێ.
-دنیای سەرمایەداری لە سیستمی یەک قوتبی دێتە دەرو دوو سیستمی لێک جیاوازی کۆمەڵایەتی- ئابووری نا تەبا و ناکۆک لە گەڵ یەکتر، ڕەوەندی پێشەوە چوون و پێشکەوتنی کۆمەڵ درێژە پێدەدەن.
- چینی کۆمونیست پڕ حەشیمەترین وڵاتی دنیا دێتە نێو مەیدانی سیاسەتی جیهانی و لە شورای ئەمنیەت دا جێگای خۆی دەکاتەوە.

– زاراو و سیستمی ( دنیای سێهەم) کە بەرهەمی ناتەبایی دوو سیستمی سەرەکی کۆمەڵایەتی- ئابووری جیهانە، لە کۆنفرانسی باندۆنگ ڕەنگ دەداتەوە. چوئێنلای، جەواهێرلعل نەهرۆ، جەماڵ عبدالناسر، ئەحمەد سوکارنۆ و مارشال تیتۆ وەک سەمبولی دنیای سێهەم دەردەکەون. وڵاتانی دنیای سێهەم لە نێوان دوو سیستمی لێک جیاوازی جیهاندا، دەرەتانی هێندێ موناوەڕەو جۆرە سەر بەخۆییەکی بڕیاردانی سیاسی و ئابوورییان بۆ پێک دێت. هەر لەو کاتەشدا سەبارەت بە پارسەنگی هێزی ئاتۆمی زلهێزەکان ڕێگای شەڕی ئیمپریالیستی بەر بەست دەکرێ.
هەڵوێست وچەشنە سەر بەخۆییەکی هێندێ وڵاتی پێشووی کۆلۆنی و دنیای سێهەم، بۆ دەوڵەتانی زلهێزی سەرمایەداری قابیلی قبوڵ نیە و بۆیان هەڵناگیرێ. بۆیە دەبینین دوای شەڕی دووەمی دنیاگر ئەگەر بە ڕەسمی و بە ئاشکراش(جگە لە شەڕی عەرەب ونیسرائیل) شەڕی گەورەو بەرفراوان پێکنایەن. بەڵام لە ڕێگای کۆدیتای نیزامییەوە بە دنەدان و دەستیاری ڕاستەوخۆی ڕێکخراوی جاسوسی ئەمریکا( سی.ئای.ئێ) حکوومەتانی میللی و پێشکەوتوخواز سەر نخوون دەکرێن و لەم وڵاتانە جۆگەی خوێن دەکەوێتە ڕێ. نموونەی وا کەم نین:
– کۆدیتای سیا و ئینتلجێت سەرویس دژی حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەدیق لە ئێران، کۆدیتای سیا دژی حکوومەتی میلیی ئەحمەد سۆکارنۆلە ئەندۆنزی کە ٧٠٠ هەزار کەسی تێدا کوژرا. کۆدیتای سیا دژی حکوومەتی میللی سەلوادۆر ئەلیندە لە شیلی، کۆدیتای کۆنگۆ و کووشتنی پاتریس لۆمۆمبا، هاندانی ئیسرائیل بۆ سەر میسر و تێداچوونی عبدالناسر و....پشت تێکردنی شۆڕشی ئەیلولی کوردستانی عیراق و لە ژێر پێ نانی قەول وبەڵێنیان لە گەڵ سەرۆک بارزانی و......
– ڕکەبەری و ملبەملەی وەسەریەکنانی چەکی کۆکوژی و شەڕی ئەستێران، شەڕی سێهەمی جیهانی بەر بەست دەکات، بەڵام بە زاڵبوونی سیستمی سەرمایەداری و دارمانی سیستمی سۆسیالیستی کۆتایی دێت. هەر وەک شۆڕشی ئوکتۆبر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دنیا دەلەرزێنێ، دارمانی سیستمی سۆسیالیستیش لە ئاخرەکانی سەدەی بیستەمدا، دەبێتە هۆی سەر

سوڕمانی جیهان و لە بواری ئابوورییەوە دنیا لە یەک سیستمی دنیا گری سەرمایەداریدا ساخ دەکاتەوە.( هۆیەکانی ڕووخانی سیستمی بە ناو سۆسیالیستی واقعا مەوجود باسێکی دیکەیە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستێ و بیر فراوانی و بەڵگەو دۆکۆمێنتی بابەتی هەیە کە لەم وتارەدا جێی نیە.)

– پاش لە بەر یەک هەڵوەشانی سیستمی سۆسیالیستی، ئیتر جیهانی ئیمڕۆ لە چوارچێوەی سیستمی سەرمایەداریدا بەڕێوە دەچێ. جا ئەمریکا بێت یا بنگلادێش، سودان بێ یا ئەڵمان، ئەتیوپی بێت یا سوید، فەرقی نیە، نیزامەکە نیزامی سەرمایەدارییە و بە قەولی ماکسڤیبەر:« سەرمایەداری بریتییە لە ڕوحی قازانج خوازی و سەر لە نوێ وەگەڕ خستنەوەی قازانجەکان لە ڕێگای مێتۆدی عەقلانییەوە.»

– ناتەبایی سیستمی جیهانی سەرمایەداری کە لە ساڵەکانی ئاخری سەدەی بیستەم لە یەک قوتبی یا(جیهانی بوون)دا ڕەنگ دەداتەوە زیاتر لە هەموو کاتێ ڕوونتر خۆ دەنوێنێ. ئەگەر لە بەشێکی جیهانی ئیمڕۆدا مرۆڤ دەچێتە بان کورەی مانگ و خەریکە دەست بەسەر ئاسمان دادەگرێ و پێشکەوتنی تەکنیک و داتا و ئەنفۆرماتیک دنیای پان و بەرینیان کردۆتە گوندێکی بچوک و لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریدا حەمام و چێشتخانە و خەستەخانەی تایبەتی بۆ کسۆکان ساز دەکەن، لە بەشی دیکەی هەرە زۆر و پڕ حەشیمەتی دواکەوتووی دنیای سەرمایەداریدا، ڕۆژانە هەزاران منداڵ لە برسان و لە بەر بێ دوکتۆر و دەرمانی دەمرن. درزی نێوان هەژاری و سامان و سەروەت لە نەزمی نوێی جیهانیدا،لە دەیەکانی ڕابردوو گەلێک قوڵتربووە. بە قەولی ڕۆژنامەی لومۆند دیپلۆماتیک نیزیکەی ٥٠٠ میلیۆن کەس لە جیهاندا ڕۆژانە بە دۆلارێک ژیان دەبەنە سەر. میلیاردێک و ٢٠٠ میلیۆن کەس لە خواردنەوەی ئاوی خاوێن و داو ودەرمان و پێڕاگەیشتنی پزیشکی بێبەشن. لە وڵاتی وەک بەرزیل کە لە بواری پیشە سازی لە جیهاندا لە پلەی دەیەم دایە، حەوت میلیۆن کەس بە سواڵ دەژین وبۆ بژیوی ڕۆژانە هیچ شک نابەن. بانکی جیهانی و سندوقی نێونەتەوەیی پارە و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی کە زلهێزەکانی جیهانی یەک قوتبی بەسەریاندا زاڵن، لە سەتا هەشتای سامانی جیهانیان

خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. تەنیا وڵاتانی ئەفریقایی ٣٧٠ میلیارد دۆلار قەرز دارن. لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریش نیگەرانی لە ژیان خۆی دەر دەخات. وەک لۆمۆند دیپلۆماتیک دەنووسێ:« لە چوار چێوەی وڵاتانی بازاری هاوبەشدا نیزیکەی بیست میلیۆن کەس بێکارە. لەم وڵاتانەدا، تاوان، جنایەت، هیرۆئین و حەشیش، رەگەز پەرستی و دژایەتی بێگانان رۆژ بە رۆژ پەرە دەستێنێ. ساڵی ١٩٩٦ سەروەت و سامانی ٣٥٨ بیلیۆنێر بە قەدرایی داهاتی دوو میلیارد و٣٠٠ میلیۆن کەسی حەشیمەتی جیهان بووە.»

ئەمە لە بواری ئابووری و ژیانی رۆژانەوە، بەڵام جیهانی یەک قوتبی و نەزمی نوێی جیهانی پاش رووخانی سیستەمی سۆسیالیستی لە بواری ئەمنیەتی گشتی وپاراستنی مافی مرۆڤ و نە مانی شەریشەوە هەنگاوی کاربڕی ناویشتووە. تەواوی پروپاگاندەی پاراستنی مافی مرۆڤ و دێموکراسی لە چوار چێوەی بەرژەوەندی زلهێزەکانی جیهانی یەک قوتبی دا، گەریان خواردوە. مەسەلەی کۆسۆڤۆ بیانوێکی باشبوو بۆ جیهانی یەک قوتبی بە سەرۆکایەتی ئەمریکا،کە شەقێک لە رێکخراوی کارتۆنی بە ناو نەتەوە یەککگرتوەکان بداو بێ گوێدان بە شوڕای ئەمنیەت دەوڵەتێکی سەر بەخۆی ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان بۆمباران بکات. دیارە وڵاتانی ناتۆ بە سەرکردەیی ئەمریکا و هێندێ فەریکە سیاسی تازە پێگەیشتووی کوردیش بۆمبارانی یۆگۆسلاڤیان بۆ ئازادی ئەلبانی رەگەزەکانی کۆسۆڤۆ و پاراستنی مافی مرۆڤ بە رەواو باش دەزانی و ئەوەیان بە وەدەنگهاتنی ئەمریکا لە سەر گەلانی ژێر دەست لە قەڵەم دەدا. خۆ ئەگەر بۆمبارانی یوگۆسلاڤی بە راستی بۆ ئەو مەبەستە بوایە، کارێکی باش و پیرۆز بوو. بەڵام پاش ساڵێک بۆمبارانی یوگۆسلاڤی و ماڵ وێرانی خەڵکی کۆسۆڤۆ، دابینکردنی مافی مرۆڤ لەم وێرانی و کوشتارەدا، بە گوێرەی هێندێ رۆژنامەکانی ئورووپایی ناردنی جندە وسوزمانی بووە لە وڵاتەنی ئورووپاوە بۆ هێزە چەکدارەکانی پارێزەری مافی مرۆڤ لە کۆسۆڤۆ.!!

مرۆڤ دەتوانێ بپرسێ ئەگەر بۆمبارانی ٧٢ رۆژەی یوگۆسلاڤیا بۆپاراستنی مافی مرۆڤ و ئەلبانی رەگەزەکانی کۆسۆڤۆ بووە، دەبینی ئێستا رووسەکان لە چیچان هەموو ماف و دابی ئینسانیان خستۆتە ژێر پێ و گەلێک خەراپتر لە خەڵکی کۆسۆڤۆیان بە سەر چیچان هێناوە، بەڵام دنیای یەک قوتبی و نەزمی

نوێی جیهانی کە بەردی پاراستنی مافی مرۆڤ و دیموکراسی لە سنگی دەدا، نەک هەر دەنگی لەبەر نایەتە دەر، بەڵکوو دوور نیە دەستیشی لە خۆشکردنی ئاگر وقڕ کردنی میللەتی چیچاندا هەبێت.

زۆر سەیرە ئێستاش بە دوای ئەفسەرانی سربیدا دەگەڕێن کە لە بۆسنەو هەرزەگوین جنایەتیان کردوە تا بدرێن بە دادگای نێو نەتەوەیی لاهە. بەڵام لە ئاست بۆمبارانی کیمیایی هەڵەبجەی کوردستان وئەنفالکردنی ١٨٢ هەزار کوردی بێدەوڵەت دەنگیان لە بەر نایەتە دەر. بە کورتی سەدەی بیست ویەکەم بە سەقامگرتوویی دنیای یەک قوتبی و نەزمی نوێی جیهانی نە دەبێتە پایانی مێژوو، نە هیچ خێر و خۆشیشی بۆ گەلانی ژێردەستەو وڵاتانی خەریک بوژانەوە چاوەڕوان لێدەکرێ.

**کۆرد لە سەدەی بیستەمدا**

کوردستان و گەلی کوردیش لە سەدەی بیستەمدا هەر چەندە لە ڕووداوەکان و فراز ونشێوی بەسەرهاتەکانی جیهان کەنار نەبوو، بەڵام بە هێندێ بەسەرهات و کارەساتی تایبەتی لە ڕووداوەکانی جیهان جیا دەکرێتەوە.

کەم نەتەوە هەبوون کە لە تەواوی سەدەی بیستەمدا بۆ وەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی و ئینسانی خۆی وەک کورد بێ پسانەوە خەباتی کردبێت و بێ دەستکەوت بە هەزارانی فیداکار و شەهیدی ڕێگای سەربەستی پێی نابێتە سەدەی بیست و یەکەم و هەزارەی سێهەمەوە.

لە سەدەی بیستەمدا پتر لە سەت نەتەوەی کۆلۆنی و بندەست و دواکەوتوو لە ژێر دەستیی دەرباز بوون و دەوڵەت ودەسەڵات و کیانی سیاسی نەتەوەیی خۆیان دامەزراندووە. بەڵام بەدرێژایی سەدەی بیستەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد سەر کوتکراوە و ڕێبەرانی بزووتنەوە لە دار دراون و شار وگوندی لێ وێران کراوە. کوردستان و بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکەی بۆتە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز وحکوومەتانی ناوچە. دیارە هەر چەند کورد نەیتوانیوە لە سەدەی بیستەمدا بە ئاوات بگا ولە مافی نەتەوەیی وئینسانی خۆی کەلک وەربگرێ، کەم یا زۆر لە بوارەوە لاپەڕەی مێژووی خۆی ڕەنگین کردوە. حیزبی تێکۆشەر و ئازادیخواز دامەزراون، هوشیاری نەتەوەیی و سیاسی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر بەرز بۆتەوەو بە گوێرەی دەرفەت و توانا

هێندێ دەستکەوتی کەم کاتیشی وەدەستهێناوە.

پێکهێنانی کۆماری کوردستان وحکوومەتی میللی کورد لە جەنگەی شەڕی دووەمی جیهانیدا لە کوردستانی ئێران دەستکەوتێکی گرنگی نەتەوەیی بووە، گرنگی ئەم دەستکەوتە زیاتر لەوەدابووە کە تێکۆشەرانی هەموو بەشەکانی کوردستان بەشداریبوون و جێگای هومێدی دوارۆژی هەموو کوردێک بووە.

بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ و بە چۆکداهێنانی حکوومەتی بەعسی عیراق و مل پێراکێشانی بۆ ناسینی نەتەوەی کوردو مافی خۆد موختاری کوردستان، بەرهەمێکی دیکەی خەباتی گەلی کوردو شەڕی چاردە ساڵەی کوردستانی خوارو بووە بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی نەمر.

هەر چەند بەرهەمی خوێنی ڕۆڵەکانی کورد لە ١٩٧٥دا دەبێتە گەمەی دەستی دەوڵەتانی ئەمریکاو ئێران وئیسرائیل و بزووتنەوە نسکۆ دێنێ، بەڵام تێکۆشەرانی کورد ناهێڵن ئاگری خەبات بکوژێتەوە و جارێکی تر لە کوردستانی عیراق خەباتی چەکداری سەرهەڵدەداتەوە کە بە داجەوە دەبێ بڵێین ئەنجامەکەی تا ساڵی ١٩٩٠ تەنیا شەڕی خۆبەخۆی کوردو وێرانی کوردستان و بۆمبارانی کیمایی و ئەنفالی بەد ناوی خەڵکی کوردستانە. ئەگەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەرفەتێک بۆ کورد هەڵناکەوێ، یا کورد خۆی توانای ئەوەی نابێ لە ڕووداوەکانی جیهانی و خۆجێیی بۆ ئازادی خۆی کەلک وەر گرێ، لە دەیەی ئاخری سەدەی بیستەمدا دوژمنەکەی بە پەلاماردانی کوومیت تووشی ئەم گەوجییە دێت کە دەرفەت بۆ کوردیش بڕەخسێ هێزی خۆی کۆ بکاتەوە و بەسەر وڵات و چارەنووسی خۆیدا زاڵ بێت.

ڕاپەڕینی ١٩٩١ی کۆمەلانی خەڵکی کوردستانی خوارو ئەستێرەیەکی پرشەنگدار و ڕووداوی گرنگی مێژووی کورد بوو کە ویژدانی نوستووی زلهێزەکان و کۆمەلانی خەڵکی جیهانی وەخەبەر هێنا. دەرفەتێکی گەورەشی بۆ گەلی کورد لەم بەشەی کوردستاندا ڕەخساند کە وەخۆ بێتەوە، هەڵبژاردن بکا، پارلمان و حکوومەتێک پێک بێنێ. بەڵام بەداخەوە هەر چەند کورد ئەزموونی چەندین ساڵەی خەباتی بێوچانی هەیە و بە هەزاران زانا و سیاسیی و پرۆفیسۆر و دوکتۆر ونووسەر و ڕۆژنامە نووس وڕووناکبیری هەیە، بەڵام دیسان نەیتوانی لەم هەلەش کەلک وەر بگرێ و خۆ بگێێنێتە ڕیزی وڵات و

نەتەوەکانی ئازاد و سەر بەخۆی جیهان. دوژمنانی کورد کێچیان کەوتە کەوڵ و چاویان بەرایی نەدا کورد لە بەشێکی نیشتمانەکەیدا چارەنووسی خۆی بگرێتە دەست و بە ئاسایشی پشوێک بدات. شەڕی کورد کوژییان پێ ساز کردن و پاش چەندین ساڵ خوێن ڕێژی و بە کوشتن دانی هەزاران ڕۆڵەی خەڵک، بە داخی گرانەوە ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە دەبێ بێژین: ئەگەر ئیمپریالیزم و دەوڵەتانی کۆلۆنیالیستی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کوردستانیان دابەشکردو کوردیان لە مافی نەتەوەیی بێبەشکرد، لە کۆتایی سەدەی بیستەم و سەرەتای هەزارەی سێهەم پاش نیزیکەی سەت ساڵ ئەوا ئەمجار بەشێکی کوردستان وەک بەشە گۆشت لە نێوان دوو حیزبی ( هەڵگری کوردایەتی) و ڕزگاریخواز دابەش دەکرێتەوە وگەلی کورد ئەمجار بە دەست دەسەڵاتی خۆماڵییەوە دەناڵێنێ و دەکوژرێ وئاوارە دەکرێ و شانازی ئەم دوو حیزبەش هەر ئەوە دەبێ کە ناوی سەرۆک و وەزیر و وەزارەتخانە و ڕێبەر لە خۆ بنێن و بە ترس و دڵە ڕاوکەوە چاوەڕوانی کارەساتی پێشبینی نە کراو بن. شیکردنەوەی زیاتری هۆیەکانی دۆڕاندنی ئەم دەرفەتە بۆ وتارێکی تر ڕادەگرین.

٧/١/ دووهەزار سەفەرێکی بەرلینم کرد و چەند ڕۆژێک لە کن دۆست و خوشک و برای خۆشەویست شیرین خانم و کاک هوشیاری ئیمامی حەسامەوە. سەنتەڕی کوردی بۆ باسێک لە سەر مەسەلەی کورد داوەتیان کردم و گەلێک لە هاونیشتمانانی کورد بەشداری کۆبوونەوەکەیان کرد و باس و موناقەشەیەکی دۆستانە بە بۆچوونی لێک جیاوازەوە بەڕێوە چوو. لاوێکی کرماشانی سۆرانی و بادێنی تێکەڵ فێر بوو، چەند جارهاتە نێو باس و بیروڕای خۆی دەربڕی. ڕۆژی دوایی هاتە دوکانی کاک هوشیار و باسێکی دامەزراند و گوتی: ئێستا هەموو لاوانی کورد لە ئێران ڕێگای خۆیان دۆزیوەتەوە و سەردەمی حیزبی دیموکرات نیە و ڕێبازی کوردایەتی ئەوەیە کە پارتی کرێکارانی کوردستان پێیدا دەڕوا و لەم قسانە کە برا کوردە ئێرانیەکانی وێڵ بەدوای دەرکەوتنیان لە مێد تێڤێ فێری بوون. باسەکەمان گەرم بوو گوتی : کاک کەریم هێندێ پرسیارمان هەیە دەمانەوێ بە نووسین وەڵاممان بدەیەوە. پرسیارەکان دەنووسم و دەیانهێنم بۆ کاک هوشیار.

نوسراوەکەی لە چەند لاپەڕەیەکدا هێنا بوو دابووی بە کاک هوشیار. گەلێک پرسیاری جۆر بەجۆر ی نووسیبوون بێ ئەوەی ئیمزا و ناو نیشانی کەسێک، بنیاتێک، ڕۆژنامەیەک و یا شتێیکی وای لە سەر بێ. من نووسراوەکەم وەر گرت و گەڕامەوە. بۆ ئەوەی نوسراوەی ئەم برادەرە بێ وەڵام نەهێڵمەوە ئەم نووسراوەی خوارەوەم بۆ نارد و ئیتر دەنگێکی نەبوو. ئەمەش وەڵامەکەیەتی:

« بە ڕێز کاکی بێ ناو ونیشان. لە گەڵ سڵاو، پرسیارەکانم لە کاک هوشیار وەر گرت. نازانم کام گۆڤار، ڕۆژنامە و یا دەزگایەکی سیاسی ئەم وتو وێژە لە گەڵ من دەکات. چونکە وا باوە گوڤار و ڕۆژنامە وکەسێکی بخوازی وتو وێژبکا، ناو ونیشان و ئادرێسی خۆی دەنووسێ و تەرەفیش دەزانێ وەڵامەکانی ئەو لە کوێ بڵاو دەکرێنەوە.

دیسان بە کورتی تۆ ئەگەر دەتەوێ لە بارەی کۆمەڵەی ژێکاف و کۆماری کوردستان زانیاری زیاترت هەبێ، تکایە چل ساڵ خەبات نووسینی دوکتور قاسملوی شەهید و بەرگی یەکەمی پێداچوونەوەی من بخوێنەوە. لام وایە لەوانە زیاتر شتێکی دیکەم نیە. لە بارەی« کوردستانی ڕۆژ هەلات» و« باشوری کوردستان» و « باکوری کوردستان و P.K.K ئەگەر M.T.V ئەو پرسیارانەم لێدەکات کە تۆ نووسیوتن و ڕاستەو خۆش وەڵامەکانی من بڵاو دەکاتەوە، ئامادەم لەم وتو وێژەدا بەشداری بکەم. خۆشیتان. کەریمی حسامی ٢٠٠٠/١/١١

**یادی دووی ڕێبەندان**

٢٠٠٠/٢/١٢ کومیتەی هێزە کورد و کوردستانییەکان لە سوید بە بۆنەی ڕۆژی دووی ڕێبەندان، یادی کۆماری کوردستان ١٩٤٦ ئاهەنگێکی جوان وشازی ڕێکخست بوو، حەشیمەتێکی زۆر لە پیرۆزکردنی ئەم ڕۆژە مێژووییەدا بەشداریان کرد بوو. دیارە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بەڕێوەبەر وهەڵسوڕێنەری ئاهەنگەکە بوو، هەر بۆیەش بۆ هەوەڵجار شوێنەواری ئەم ڕۆژە مێژووییەی نەتەوەیی کوردیان کوێر کرد بۆوە. هەر چەند لە ئاهەنگەکەدا وەبیرم خستنەوە و داواشم کرد کە بەم بۆنەوە وەک کەسێکی زیندووی بەشدار بووی ئەم ڕووداوە مێژووییە و وەک کەسێکی دەیان وتار و کتێبیشم لە سەر کۆماری کوردستان نووسیوە، بە کورتە وتارێک باسی گرنگی ئەم ڕۆژە بکەم، بەڵام

بەرپرسی حیزبی قبوڵی نەکرد. بۆ ئەوەی دەرسێک بێ بۆ یادی ئەم ڕووداوە پیرۆزە ئەم وتارەی ژێرەوەم نووسی و ناردم بۆ گۆڤاری بەر بانگ و بڵاو کرایەوە.

**دووی ڕێبەندان لە هەندەران** کەریمی حسامی

**، ئەگەر دەمانچە بە ڕابردووی خۆتەوە بنێی، لە دوا ڕۆژ دا تۆپت پێوە دەنێن :**
ڕەسوڵ حەمزا تۆف

تۆ بڵێی لە مێژووی پڕ لە هەوراز و نشێوی نە تەوەی کورد دا، هیچ ڕۆژێک هەبێ وەک ڕۆژی دووی ڕێبەندان، ڕۆژی ( دامەزرانی کۆماری کوردستان ١٩٤٦) لە سەر لاپەڕەی مێژوو، و لە دڵی کۆمەڵانی خەڵکی کورد دا جێی گرتبێ و چەسپا بێت.؟ شتێکی سەیر نیە و جێگای خۆیەتی. چونکە کورد بۆ یەکەمجار توانی لە هەل و مەرجی پێکهاتووی نێو نەتەوەیی و خۆ جێیی کەلک وەر گرێ و دەسەڵاتی نەتەوەیی بسەپێنێ و ڕێژیمێکی کۆماری دابمەزرێنێ و حکوومەتی میللی خۆی و دام و دەزگای دەوڵەتی پێک بێنێ.

بۆ مێژوو ئەوە گرنگ نیە، پانتایی خاکی ژێر دەسەڵات چەندە وحەشیمەتی چەندە و چەندەی دەوام کردوە، هەر ئەو یازدە مانگەی تەمەنی کورت و پڕلە شانازی کۆماری کوردستان توانیویەتی شەقڵی خۆی بخاتە سەر لاپەڕەی مێژوو و تا ئەبەد زیندوو بمێنێتەوە. هەر بۆیەش کۆمەڵانی خەڵکی کورد هەموو ساڵێ لە هەموو شوێن و وڵاتی دوور و نیزیکی کوردستان بە زیندوو کردنەوەی یادی ئەم ڕۆژە پیرۆزە ئەمەگداریی خۆیان لە ئاست ئەم ڕوو داوە گرنگە ڕادەگەیێنن.

ئەم ساڵیش ٢٠٠٠/٢/١٢ لە سەدەی ٢١ و لە ستۆکهۆڵمی پێتەختی سوید، کومیتەی هاو کاری هێزە کورد و کوردستانیەکان بە شێوەیەکی لە ڕادە بەدەر جوان و ڕێک و پێک یادی دووی ڕێبەندانی زیندوو کردەوە. لە زۆربەی شارەکانی سوید خەڵکی بە ئەمەگی کورد بۆ بەشداری لەم ئاهەنگە پیرۆزە دا، هاتبوونە ستۆکهۆڵم. زۆری حەشیمەت و بەر نامە جوانەکە، ڕەنگ و واتایەکی تایبەتی دابوو بە ئاهەنگی دووی ڕێبەندان.

بەڵام ئەگەر خەڵکی ئازادیخوازی کورد بە حەز و عەلاقەوە و بە ناوی یادی

کۆماری کوردستانەوە بۆ پیرۆز کردنی ڕۆژی دووی ڕێبەندان ڕوویانکرد بوە ئاهەنگەکە، مالم قەبرە بە ڕێوە بەریی ڕێ و ڕەسمەکە بۆ هەوەڵین جار شوێنەواری کۆماری کوردستانی کوێرکرد بۆوە. کۆماری کوردستانی ١٩٤٦ دروشم و ئالا و سرود و ناو نیشانی خۆی هەبوە و لە مێژوو داتۆمار کراوە. شەهیدی خۆی هەبون و لەم ڕێگایەوە گیانیان فیدا کردوە. کومیتەی هاوکاری یادی دووی ڕێبەندان دەکاتەوە، بەلام شوێنەواری کۆماری کوردستان کوێر دەکاتەوە. لە جێگای دروشم و ئالا ونیشانی کۆماری کوردستان ئارمی حیزبی دێموکرات هەڵداوەسێ کە لە کۆنگرەی چوارەم پەسند کراوە و هیچ پێوەندییەکی بە کۆماری کوردستانەوە نیە. لە جیاتی عەکسی شەهیدانی کۆماری کوردستان عەکسی شەهیدانی حیزبی دێموکرات هەڵداوەسێ کە پێوەندی ئۆرگانیکیان بە دووی ڕێبەندانەوە نیە. ڕێز گرتن و یادی شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان کارێکی بەجێ و پیرۆزە، بەلام هەر ڕووداو و هەر شتە جێگای خۆی هەیە. کارێکی دوور لە مەنتیق و دڵسۆزییە کەسێک و دەستە و یا ڕێکخراوەیەک بە هەر بیانوو و مەبەستێک بێ، قەڵەمی ڕەش بە سەر شوێنەواری مێژووی نەتەوە دا بێنێ.

جێگای سەرنجە، بۆ دەبێ لە یادی دووی ڕێبەندان سرودی کۆماری کوردستان بخوێنرێتەوە، بەلام ئالا و دروشم و عەکسی شەهیدانی کۆمار وەلا بنرێ و عەکس و دروشمی دیکە لە جێی وان دابنرێ.؟بۆ دەبێ عەکسی چوار ئەفسەری مەهابادی کە بە لیباسی نیزامی کۆمارەوە لە دار دران، عەکسی سەدری قازی و حەمە حوسێنخان و محەممەدی نانوازادە و یازدە شەهیدانی بەگزادە لە بۆکان، عەکسی خۆشەوی کە لە ڕێگای پاراستنی کۆماردا شەهید کرا و عەکسی چوار ئەفسەری قارەمانی کوردستانی عیراق لە یادی کۆماری کوردستان هەڵناوەسرێن و بە خەڵک نیشان نەدرێن. یا عەکسی پێشەوا و بارزانی نەمر کە پشت و پارێزەری سەرەکی کۆمار بوە لەم یاد و ڕۆژەدا لە بەر چاو نەبن. کومیتەی هاوکاری ڕەنگە نە توانێ هیچ بیانویەکی کۆمەڵ پەسند بۆ ئەم هەڵە و کەمکارییە بێنێتەوە.

ڕوو داوەکانی مێژوو بۆ دەست تێوەردان و زیاد و کەمکردن نابن. مێژوو ڕووداوێکە گوزەراوە و تۆمار کراوە. بۆیە دەبێ بە شێوەیەکی زانستی

شیبکرێتەوە و لە ئەزموونی تاڵ و شیرینی کەلک وەر بگیرێ، نەک بە کەیفە مەڵکێش داکێشی لە گەڵ بکرێ.

## هەنگاوێکی پیرۆز

فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکان لە سوید خەبەریان دامێ کە کومیتەی کارگێڕ بڕیاری داوە بە بۆنەی شەست ساڵ خەباتی سیاسی و کولتوری تۆوە ئاهەنگێک ساز بکا و چەند کەسێکیش لە دۆستان و نووسەر و تێکۆشەران کورد داوەت بکا. بڕیارێکی پیرۆز و هەر لەو کاتەشدا کە جێگای خۆشی بوو، پێم دەستپێشخەرییەکی گەلێک نیشتمانپەروەرانە و داهێنانێکی شارستانیانە بوو. چونکە لە کۆمەڵی کوردەواریدا تا ئێستا شتێکی وام نەدیبوو کە تێکۆشەر و یا زانا و شاعیر و نووسەرێکی کورد، ئەندامی حیزبێک نەبێ، ڕێکخراوێکی کوردی ڕێزێ لێ بنێ و ئاهەنگی بۆ ساز بکات.

هەرچۆنێک بوو فیدراسیۆن ڕۆژی ٢٠٠٠/٩/٢ لە کۆبوونەوە گشتی خۆیدا کە بەرپرسانی کۆمەڵەکانی فیدراسیۆن هەموو لە ستۆکهۆلم بوون. بڕیارەکەیان تەنیا بە بەشداری بەرپرسانی کۆمەڵەکانی فیدراسیۆن بردە سەر و بە بەخێر هێنانی سەرۆکی فیدراسیۆن و کورتە وتاری کاک حامیدی گەوهەری و پێشکێشکردنی دەستە گوڵێک لە لایەن فیدراسیۆنەوە، پرسیاری زۆر و جۆر بەجۆر سەبارەت بە بار و دۆخی کوردستان و مەسەلەی سیاسی و ژیانێ سیاسی و کلتوری لە لایەن برادەرانی بەشدار بۆووە هاتنە گۆڕێ و و لامیان درایەوە. بە گرتنی چەند وێنەیەکی بە کۆمەڵ دانیشتنەکەمان کۆتایی پێهێنا. پرسیار و وەڵامەکانیش لە گۆڤاری بەربانگ دا بڵاو کراونەوە.

کۆمەڵەی کلتوری شاری هانۆڤەر لە ئەڵمان داوەتی کردم کە بۆ بەشداری لە حەفتەی کولتوری کۆمەڵەکەیاندا بەشداری بکەم و لە سەر پێکهاتن و تێکچوون و سیاسەتی کۆمەڵەی ژ.ک باسێکم هەبێ. ٢٠٠٠/١٠/٢٧بە فڕۆکەیەکی فینلەندی بەرەو هانۆڤەر کەوتمە ڕێ. هە رئەو ڕۆژە لە فڕۆکەخانەی هانۆڤەر پێشوازیمان لە شاعیری خۆشەویست و بوێری کورد مامۆستا پەشێو کرد کە ئەویش داوەت کرا بوو. جگە لە بەشداری چەندنووسەر و ڕوناکبیری تری کورد کە بۆ باس لە سەر بابەتی جیاوز داوەت کرابوون وسێمینارەکەین دەوڵەمەند

دەکرد، دانیشتنی چەند شەوان لە گەڵ پەشێو و برادەرانی تر و میوانداری کاک چەماڵ خەزنەدار سەفەرەکەی بە ڕاستی خۆش کرد بوو. دوای چوار ڕۆژ هاتمەوە بەرلین و لەوێ کاک پێشڕەو داوەتی کردم بۆ ئاوەدانی (مەڵبەندی ڕوشنبیری یەکێتی نیشتمانی) کە هەر لە سەر کۆمەڵەی ژ.ک باسێکم هەبێ. شەوەکەمان بە باسێکی دۆستانەو میوانداریەکی خۆمانە بردە سەر.

ساڵی دوو هەزاریش هەر وەک ساڵەکانی تر کۆتایی هات و خوارزاکانم بۆ دانیشتنی سەری ساڵە تازە هاتن بردیانینە لینشۆپینگ و لە گەڵ بەڕێکردنی ساڵی کۆن لە کۆبوونەوە و دانیشتنێکی پڕلە خۆشەویستی پێشوازیمان لە ساڵی تازە کرد. خۆشتریش ئەوە بوو کە کانالی ئاسمانی کوردستان لە سەفەریش بە دوامدا گەڕا بوو تا لە لینشۆپینگ دیتمیەوە و لە سەر( بارزانیزم) و سێمینارێک کە بەم بۆنەوەیە گیرابوو، وتوێژی لەگەڵ کردم.

٢٠٠١/١/١٤ گۆڤاری ڕاستی کە لە سوید دەردەچێ، سێمینارێکی بۆ پێکهێنام لە ژێر ناوی:( پێشوازی لە ٥٦ ساڵەی کۆماری کوردستان و ڕۆڵی بارزانی لە و کۆمارەدا) لە ماوەی سێ کاتژمێردا بە گوێرەی توانا بە شێوەیەکی بابەتی گرنگی مێژوویی کۆماری کوردستان و ڕۆڵی بارزانی نەمر و هێزی بارزان لە پاراستنی کۆماردا ڕوون کردەوە و زۆر لە بەشدار بووان لە باسەکەدا بەشداریان کرد. سەیر ئەوە بوو سێمینارەکە لە سەر کۆماری کوردستان بوو، بەلام لە و ڕێکخراوە چالاکەی حیزبی دیمۆکرات لە سوید دوو کەس بەشداریان کردبوو. بۆ ئەندامانی حیزبی دیمۆکرات لێکۆڵینەوە و زانیاری لە چۆنیەتی پێکهاتن و لە بەینچوونی کۆماری کوردستان گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە دووی ڕێبەندان بۆ شایی و هەڵپەڕین بە ڕێوە بەرن.

لەم بەشەی بیرەوەرییەکانمدا کە وا لێرەدا کۆتاییان پێدێنم،ڕەنگە خوێنەری کورد شتێکی وا سەرنجڕاکێش نە خوێنێتەوە کە تام وچێژی لێ وەربگرێ. لە وڵاتێکی ئاوا سارد وسڕ و لە کۆمەڵگایەکدا کە هەموو شت، هەموو هەست و مرۆڤایەتی و برایەتی و دراوسێیەتی و... هەمووی هەر پارەیە ویا هەوڵدان بۆ پارەیە، مرۆڤ دەبێ باسی چی ژیان و تێکۆشانی خۆی بکات کە بە کاری نووسین و بڵاو کردنەوە بێت و ڕووی نێو کتێب و نووسراوەی کوردی هەبێت ؟ ئەم دەر بەدەرییە و سیستەمی ئەم وڵاتە خەسڵەتی پیاوەتی و جوامێری و

تەنانەت دۆستایەتی کوردەواریش تا ڕادەیەکی لەق و گەندەڵ دەکات. دەبینی دۆستێکی خۆشەویستی قەدیمیت هەیە، بۆ کارێکی یەک سەعاتی ئیحتیاجیت پێدەبێ یاریدەت بدا، لەو بەری ڕوو هەڵماڵاویدا دەڵێ: نایەم کاکە ئێرە ئەوروپایە هەر کەس کاری خۆی هەیە و ناکرێ بە کاری کەسی دیکە ڕابگەی. بەڵێ ئەوروپایە و هێندێ جار هێندێ تێکۆشەری کورد لە بواری پیاوەتی و خەسڵەتی نەتەوەیی دە خە ستێنێ و دەیکاتە ئەوروپایی ! بەڵام هەر لەو کاتەشدا هەر لەم ئەوروپایە کوردی جوامێری ئینسان هەن کە نەک هەر جارێک بەڵکو چەندین جار بە ڕوو خۆشییەوە بۆ کاری پێویست دەفریای دۆست و هاو نیشتمانانیان دەکەون و یارمەتیان دەدەن. من لە کاری نووسین و کامپیوتەردا تووشی هەر دوو جۆری ئەو کەسانە هاتووم.

بەشی هەرە زۆری ژیانی ڕۆژانەی من لەو سالانەی دواییدا بە خوێندەوە و نووسین و نووسین لە کۆمپیوتەردا گوزەراوە. بە تایبەت خوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامەی جۆر بە جۆری کوردی کە بەشی زۆریان ئابوونە بووم و یا دۆستان بێ پارە بۆیان ناردووم یارمەتی زۆریان داوم. ناتوانم پیاوەتی ئەو دۆستانەش بە تایبەت برای خۆشەویستم ئاسری ئیبراهیمی و ئاسۆس و بەرەژ ئاکرەیی لەبیر بەرمەوە، کە هەر کاتی کاری کۆمپیوتەر و نووسینەکەم تەگەرەی کەوتبێتە بەر، بە دڵەوە یارمەتیان داوم . سوپاسی ئەو برادەرانەش دەکەم کە بە سەریان کردوومەوە و چێژم لە دیدار و دواندنیان وەر گرتووە.

هۆی بنچینەیی و سەرەکی بەر دەوامبوونی کار و تێکۆشانم لەو تەمەنەدا،( ئەگەر هیچ بەهرەیان بووبێت) بە ئەزموونی ڕۆژانەم لەم چەند خاڵەدا دەبینم کە بە پێویستی دەزانم لە بەرگی کۆتایی بیرەوەرییەکانمدا باسیان بکەم:

یەکەم – خۆشی و تەبایی نێو ماڵ و ئینسانیەت و ئەمەکداری و هەست کردن بە مەسئولیەت و میهرەبانی دایکی کەماڵ کە نەیهێشتوە هزر و بیر و خەیاڵم بە کەم و کوڕی ماڵەوە مەشغوڵ بێ. هەمیشە دەرفەتی ئەوەی بۆ پێکهێناوم کە بە نووسین و خوێندنەوە و میوانداری و سەفەر و حەسانەوە...هتد ژیان بە خۆشی بەرمە سەر

دووەم – ئینسانیەت و خۆشەویستی کەماڵ و شلێر، بەتایبەت کەماڵ کە بەشی زۆر لەم دواییانەدا لە گەڵ ئێمە ژیاوە. ئەویش وەک دایکی نەیهێشتوە بیر

و خەیاڵم بە هەڵس و کەوتی ئەو نارەحەت بێ و کارێکی وابکا کە دڵم بێشێنێ.
زۆر شەرتە کوڕێکت هەبێ لە ئوروپا زمانی گرابێتەوە، خوێندنی سەرەتایی و ناونجی و زانستگایی لە ئوروپا درێژە پێدابێ ولە نێو هاو تەمەنانی ئوروپاییدا ژیانی برد بێتە سەر و لە بەرانبەر دایک و بابیدا تەربیەت و ئەخلاق و خەسڵەتی بنە ماڵەیی خۆی بپارێزێ.

لام وانیە هیچ شتێک بۆ باوکێکی بە ساڵا چوو لە وەخۆشتر بێ کە کوڕی گەورەی بێتەوە ماڵ وبڵێ: «بابە ! تۆ لە بەر دڵت باشە قومێک ویسکی بخۆیەوە» پاشان هەر بۆ خۆی مەزەت بۆ ساز بکا و دابنیشێ لە گەڵت شەو وەدرنگی بخات. یان لە بواری ماددی و چاپی نووسراوەکانم لە یارمەتی دەست نەگێرێتەوە. یا ناکرێ باسی ئینسانیەتی شلێری کچم نەکەم کە جگە لەوە هەموو ڕۆژێ بە تەلەفون شادی کردووین و لە نەخۆشی دڵم پرسیاری کردوە و نوسخەی دەرمانی پێویستی بۆ نووسیوم . تەنانەت لە بواری ماددی و کڕینی کۆمپیوتەر لێم خافڵ نەبووە. ڕاستە ، ئەوانە مەسەلەی خانەوادەیین. ڕەنگە بۆ زۆر کەس هەر جێگای باس نەبن. بەڵام بۆ من لە ئاوارەیی و لەو تەمەنەدا تەنانەت بە نەخۆشی و برینکاریی دڵ، هیچی لێ خۆشتر و بە تامتر نە بووەو مانەوەی خۆم و توانای کار و نووسینم هەر لەوانەدا دەبینم.

سێیەم- بەسەر کردنەوەی دۆست و برادەران بە نامە و تەلەفون و بە سەردان و دانیشتنی خۆش یەکێتر لەو ئێکسیرانە بوە کە تەزووی خۆشی و تاقەت و وزە و توانای تێکۆشانی لە جەستەی خەستەمدا ڕاگرتووە. لەوانەش گرنگتر هیوا و هومێد بە دوارۆژێک کە ئاوارەیی و دوور وڵاتی و دەربەدەری کۆتایی بێت و لە زێد و نیشتمانی خۆشەویستمدا، پاشماوەی کورتی تەمەنم لە خزمەت مەسەلەی ڕەوای نەتەوەکەم بەرمە سەر و بە تایبەت خۆشی و رزگاری زەحمەتکێشانی کوردستان لە چەوسانەو وژێردەستی بە چاو ببینم.

ئەو هیوا و هومێدە بۆ گەیشتن بەو ئامانج و ئاواتە نەیهێشتوە ئەوەندەی بکرێ کاتم لە ئوروپا بە خۆڕایی بڕوات.

لێرەدا ئیتر خامەکەم بۆ نووسینی بیرەوەری لە سەر مێزدادەنێم و بە نووسەیەکی کورتی زانا و بلیمەتی هەڵکەوتووی ئێرانی ئیحسان تەبەری

کۆتایی بە نووسینی بەرگی یازدەهەم و درێژەی بیرەوەری دێنم و جارێکی دیکەش لە کەم و کوڕی وەهەڵە و پەڵە و پێکەوە نەلکاوی نووسینەکەم داوای لێبوردن لە خوێنەران دەکەم.

ئەمەش نووسینەکەی شادرەوان ئیحسان تەبەری:

**« ئەم بیرەوەرییانەی کە بنیاتی لە سەر بنەمای« من » دانراوە، بۆ من بێزاری هێنەرە.بەڵام لە بیرەوەرییەکاندا بە ناچاری باسی « من » دێتە گۆڕێ. چونکە هەر چۆنێکی بێ ئەوە بیرەوەری تایبەتی کەسێکن کە باسی خۆی دەکات و ناتوانێ لە بەرە من » رابکات.» احسان طبری ، یاد نامه زندگی اسفند ١٣٦٠، بە کوشش ف. شیوا ١٣٧٥، ص ٣٦**

## بەرهەمە نووسراوەکانی نووسەر

١- کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران.
٢- وەلامێک: کوردی و فارسی.
٣- ڕێنوێنی شەڕی پارتیزانی.
٤- لە دەوری ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات کۆ بینەوە.
٥- رەخنە ولێکۆڵینەوە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی.
٦- چەند قسەیەک لە گەڵ خەبات.
٧- کورد و فەرهەنگی بێگانە.
٨- لێکۆڵینەوەی(کورتە باسێک لە سەر سۆسیالیزم) کوردی وفارسی.
٩- تایبەتی کۆنگرەی شەشەم.
١٠- کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری.
١١- یادی هێمن.
١٢-لە پێناو چی دا ؟.
١٣- بادانەوە.
١٤- کڕ و کاش.
١٥- سەفەر بۆ کوردستان.
١٦- لە بیرەوەرییەکانم بەرگی:١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩-١٠-١١.
١٧- پێداچوونەوە بەرگی یەکەم( بزووتنەوەی نیشتمانی لە...).
١٨- پێدا چوونەوە بەرگی دووەم ( بزووتنەوەی نیشتمانی لە...).
١٩- حکایەت کردن یا نووسینی مێژوو.
٢٠- گەشتێک بە نێو بیرەوەرییەکاندا.
٢١- کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و حکوومەتانی ناوچەدا.

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بە کوردی

١- دایک - ماکسیم گۆرکی.
٢- ژیان و کردەوەکانی لینین.
٣- زەوی بچوک - بریژنێف.
٤-کۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە.
٥- مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید.
٦- یاسای بنچینەیی ئابوری سۆسیالیستی- چاپ نەکراوە.
٧- حەمە چکۆڵ. ئینجە مەمەدی یاشار کەمال- چاپ نەکراوە.
٨- ئوسوڵی سەرەتاییەکانی فەلسەفە- ژۆرژ پۆلستەر- چاپ نەکراوە.
٩- نامەکانی گوللە بارانکراوەکان - چاپ نەکراوە.
١٠- رەوشی کوردان- مێژووی ئەردەڵان و بابان.
١١- ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس.
١٢- مەسەلە و زار گوتنی لوڕی .
١٣- رۆژەکانی ئێران - ئارچیباڵد رۆزڤێلت.
١٤- ئەفسانە کوردییەکان ڕ ۆدینکۆ.
١٥- لە کوردستانی ئێرانەوە تا ئەو پەڕی ئاراز.
١٦- نان و شەراب - ئینیاتسۆ سیلونە.
١٧- دێموکراسی چییە؟ ئاشنایی لە گەڵ دێموکراسی.

بەرلین ٢٥/٥/١٩٩٠

کاکە کەریم گیان

پاش سڵاوێکی گەرم و چاک و چۆنییەکی خۆمانە، سوپاسێکی پڕ بە دڵ
بۆ دیارییە بەنرخەکەت. هەر تۆ بەرگی بیرەوەرییەکانت بە خۆی
هاوڕێیانی خۆشەویست کاکە بورهانی مام توفیقەوە پێگەیشت. چا لە بەرگەوەی
ئەوە سەرکەوت نازانم، تکام لە کاکە بورهان کرد کە ئەم نامەیە بگەیەنێتە دەستت.
بەڵێنی دا ئەو کارە خێرە بکات، ماڵی ئەویش و تۆیش ئاوا بێ.

لە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکاندا چاپەکەی گەیشتووەتە بەرگی خۆشتم.
بەتۆم بە خوێندنەوەیان بەگشتی دڵم خۆش بووە، چونکە ئەمانە هەر بیرەوەریی
تۆ نین، بەڵکوو لاپەڕەیەکیشن لە مێژووی لاگیری لاوی بە ژێر خۆڵدە-
کراوی نەتەوەی کورد، کە تۆ تۆمارت کردووە و لەگەڵ خۆت نەتکردووە
بە ژێر خۆڵەوە، ئافەرینت لێ بێ.

خۆزگە پیاوانی نێوبراوی دیکەش و بەشدارانی ئەو کارانە بوون کە
باسکراون، ئەوانیش - ئەگەر هێشتا ماون - دەستیان دەدایە
پێنووس و کارێکی وایان بکردایە. ئەوسا بە بەراوردکردنی
بەسەرهاتی گشتی لایەنە دیرۆکی زۆر دەمێکی پڕ لە لایەنەکانی بزووتنەوەی
کوردایەتی ڕوونتر دەبووەوە.

وا لە سەر فەرموودەی خۆتان بڕیارم دا پاش لێبوونەوەم لە خوێندنەوەی
بەرگی دووەم، تێبینییەکی پێک بۆ بەرگی دووەم بنێرم، با لەوێدا باسێکی ئەو
سەردەمەش بکەم کە لە خوارەوەی کوردستان بە کۆمەڵ ناسی و دواتر لە
دووکانەکەی مام توفیقدا بە شیرۆشیری لە بەغدا زۆر زۆر چاوپێکەوتنمان یەک دەکەوت.
جا تا ئەو کاتە بە شادیت دەسپێرم و هەر بژیت.

برات

جەمال نەبەز

Kurdistan Democratic Party (Iran)
Central Committee

حیزبی دیموکراتی کوردستان (ئێران)
کومیتەی ناوەندی

No:
Date:

ژمارە : ٢٣٩
رۆژ : ٨/٥/١٩٧٤

خوشکی بەڕێز خەدیجەی حەسەلمی ! سڵاوێکی گەرمی برایانەت پێشکەش دەکەین .

نامەی تاریخی ١٢/١/١٩٧٤ ی تومان پێ گەیشت . زۆر سپاس دەکەین و پێمان خۆشە پێت رابگەیەنین کە کومیتەی ناوەندی داوای تو بو وەئەندامەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی پەسەند کرد . بەم جۆرە پیرۆزبایت لی دەکەین و هیوادارین وەک خوشکێکی دڵسۆز بو بەجێ گەیاندنی ئامانجەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە رزگاری و بەختیاری گەلی زوڵملێکراو کەمانە تێی بکوشی .

داوای سەرکەوتنت بو دەکەین

کومیتەی ناوەندی
حیزبی دیموکراتی کوردستان

Kurdistan Democratic Party (Iran)
Central Committee

No:
Date:

حیزبی دیموکراتی کوردستان (ئێران)
کۆمیتەی ناوەندی

ژمارە : ١ ٧ ٢
ڕۆژ : ١٥/ ٢/ ١٩٧٦

هاوڕێی بەڕێز خوشکە خەجێ

دوای سڵاو
نامە جوانە پیرۆزباییەکەت بە هۆی سی و هەشتەمین ساڵی دامەزرانی کۆماری مهاباد گەیشتە دەستمان. تێکۆشانی خوشکی وەک تۆی بەڕێز بۆ ئێمە جێی شانازییە. هیوادارین بە خەباتی تێکڕایی هەموولایەکمان بە ڕابەرایەتی حیزبە پێشڕەوەکەمان و پشتیوانی هەموو گەلانی ڕزگاریخواز و پێشکەوتووە بەسەر ڕژێمی دیکتاتۆری شادا زاڵ بین و بتوانین لە ساڵانی داهاتوودا لە نیشتمانی خۆشەویستمان بە خۆشییەوە ئەو جێژنە بکەین.
ئیتر هەر خۆش بیت.

کۆمیتەی ناوەندی
حیزبی دیموکراتی کوردستانی
ئێران

کەریم گیان ڕۆژ باش !

هیوادارم هەمیشە ساغ و سلامەت و کەیف خۆش بی.

نامەکەیتم پێ گەیشت زۆر سوپاست دەکەم.

کەریم گیان ڕۆژی شازدەی مانگی چیکیلم وەرگرت. بەڵام بۆ منداڵەکان دەڵێن دەبی 2 سال هیدمان دەوی بۆ سجیلی منداڵەکان منیش نازانم چۆنیان چارە بکەم چونکە ئێرانی لێرە نەماون.

کەریم گیان دەبی بچیتە وەزارەتی ئیمورنیماریە لە تاران لەوی موڵەتی بدۆزی بۆ داوای پاسپۆرت بکەی بۆ من و بۆ منداڵەکان. دفتەری موڵەتەکەی بنێرە بۆ سەفارەتی ئێران لە صوفیا.

هیوادارم هەتا ئێستا کاک عەبدوڵڵای گەورە بۆ من تەلەفۆنی کردوە. ئەوڕۆژە ڕادیۆی کوردیان حیزبی دیموکراتی کوردستان قەدەغە کراوە و زۆریان لێ گرتوون. کەریم گیان زۆر نارەحەتم زوو نامەیەکم بنێری یان تەلەفۆنم بۆ بکە.

زۆر سڵاو لە سمایلی خوشکەزا و فیسەت دەکەم و دۆست و خزم و برادەران دەکەم. ئێمە حاڵمان زۆر باشە. ئومێدی لە ڕادا خۆشی و سلامەتی بشری.

22/8/79.

[signature]

کەریم کیان!

هیوادارم ساغ و سلامەت و کەیف خۆش بی. بە بۆنەی جێژنی نەورۆزی پیرۆزەوە و هەم لە خۆوە جوانترین جێژنە پیرۆزت لێ دەکەم هیوادارم سالی تازە سالی بەختەوەری و سەرکەوتن بی.

بو لە هەوانمان و شادی و ئازادیمان لە گەل خۆ ببینی. لە کۆتایی دا ئارەزووم ئەوەیە دایم و لە هەمیشە شاد و تووبی و ساغ و سلامەت.

ئیدی سلامەتیت.

فەتاح

2/3/82

پارتی دیموکراتی کوردستان
سەرۆک



الحزب الدیمقراطی الکردستانی
الرئیس

برای بەڕێز و خۆشەویست مامۆستا کەریمی حسامی پێشکەشە

دوای سڵاوێکی گەرم.

بە هیوای خۆشی و کامەرانیتانم و داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم.
زۆر زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان کە بۆ پیرۆزبایی بە بۆنەی کۆنگرەی ١٢ پارتی ناردبووتان.
هەمو کاتێک خۆشحاڵ دەبم بە دیتنی جەنابت و ئەگەر مجالتان هەیە سەردانمان بکەن بەسەر چاو ئێمە پێمان خۆشە و لە خزمەت دەبین چونکە جەنابت برایەکی خۆشەویست و تێکۆشەرێکی جێگای رێزی تایبەتیمانن.
بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی نسخەی کتێبە تازەکەتان دەکەم، خۆزگە هەر خەریکم لەسەر شۆڕشی ئەیلول بنوسم بەلام کاری زۆر رێگای نەداوم تا ئێستا.

ئیتر خۆشیتان و بە ئومێدی دیدار..

براتان
مسعود بارزانی

١٩٩٩/٨/٢١

بەڵگەی یازدەهەم

# KDP EUROPE

**Kurdistan Democratic Party - Iraq**

Tel: (0171) 931 7764 PO Box 1504, London W7 3LX, UK. Fax (0171) 931 7765

بۆ بەڕێز کاک ......کریم حسامی......

سڵاو ڕێز

وەزارەتی ڕۆشنبیری هەڵدەستێ بە یادکردنەوەی ( ۳۰۰ ) سێ سەد ساڵ تێپەڕبوون بەسەر داستانی "مەم و زین" ی شاعیر و فەیلەسوفی گەورەی کورد احمەدی خانی". لە ڕۆژانی ( ۲۰ - ۲۲/ ۹ )فیستیڤاڵێک بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کراوە لە دهۆک، ئەوەی شایانی باسە دەعوەت نامە بۆ کۆڕی دانە هەڵوێست و پەیوەندی سیاسی بۆ ڕۆشنبیران و نوسەرانی کورد چووە..

بەڕێزتان لە لایەن لیژنەی باڵای فیستیڤاڵەکەوە دەعوەت کراون بۆ ئەم یادە بەرزە، هیوادارین بە ئامادەبوونتان یادەکە دەوڵەمەندتر سەرکەوتو بکەن.

تێبینی :

- خەرجی هاتوچۆ لە سەر بەڕێزتانە .
- لیژنەی فیستیڤاڵەکە خەرجی میوانداریتان ئەخاتە ئەستۆی خۆی

تکایە بۆ زانینی زانیاری پەیوەندی بەم تەلەفون و فاکسەی خوارەوە بکەن لە لەندەن :

Tel + 171 931 7764
Fax + 171 931 7765

**پارتی دیموکراتی کوردستان - یەکگرتوو**
**مەکتەبی سیاسی**
لیژنەی باڵای یوبیلی زێڕین

بۆ/ کاک کەریم حسامی ........ بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

بە بۆنەی یوبیلی زێڕین ( یادی پەنجا ساڵە )ی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان . خۆشحاڵین داوا لە بەڕێزتان بکەین بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگەکانی ئەم بۆنە پیرۆزە کە لە ڕۆژانی ١٠-١٩ی ئابی داهاتوو بەڕێوە دەچێت ، کە ڕۆژی بیرەوەری دامەزراندنی پارتیمانە .
لەم بارەیەوە هەودوو لێی ئەوروپاو ئەمریکای پارتیمان هەر یەکە یەبن ی کاری خۆی هەڵدەستێت بە جێ بەجێ کردن و دابین کردنی پێداویستیەکانی هاتنتان بۆ کوردستان .

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزماندا.........

لیژنەی باڵای یوبیلی زێڕینی
پارتی دیموکراتی کوردستان
١٩٩٦/ ٦ /٢٣

12 97 15:08 BANCA ANTONVENETA-UFF BONIFICI ID=049 8731120





**Hetaw** *"Sole"*
**Rivista Culturale Kurda**
**Via delle Rose 28**
**35100 Padova - Italia**
**Tel. 049 - 691162 Fax. 049 - 8075657**
**Autorizz.Trib.TV n. 874. del 22.04.92**

**هەتاو**
Hetaw
گۆڤارێکی کولتووری گشتی
تایبەت بە کولتووری کوردی
بەزمانی ئیتالی دەردەچێ
سەرنووسەر
شۆرش عزیز سردانی

پادۆڤا ـ ئیتالیا 35100
سندوقی پۆستە:819 ( پادۆڤا ـ35100)
تەلەفۆن:049/691162
فاکس: 049/8075657


ئیتالیا - ڤێنیسیا ۱۹۹۷/۱۲/۱۹

مامۆستای بەڕێز خۆشەویست کەریم حسامی، دوای ڕێزو سڵاوم هیوادارم هەمیشە لەش ساغ بن.

مامۆ ا کەریم، ئەمەوێ بە ناوی خۆم و ـە بەناوی کۆمونتای کورد لە ئیتالیا سوپاستان بکەم بە ئامادەبوونتان لەو سیمینارەی کە لە شاری ڤێنیسیا بەسترا، وە داوای لێبوردنتان ' ێ دەکەم بۆ هەر کەم و کوڕیەک کە هەبووبێت. ئیتر خۆشتان

براکەتان شۆرش

# ڕیزی ناوەکان



کاک نەبی قادری و نووسەر لە دانیمارک



جەوهەر و باباى هونەرمەند لەگەڵ نووسەر لە ئامریکا



حوسێنی خوارزام و نووسەر لە پێش کۆشکی سپی



کاک مەلا محەمەدی جوانرۆ.کاک نەبوو سەرباز، کاک عەزیز محەمەدو
خێزانم خەجیج لە ماڵی نووسەر



خێزانم لەگەڵ منداڵەکانم شلێر و کەمال    بغداد ١٩٧٢



بەرێکردنەوەی کاک عومەری قازی بۆ وڵات



د. شەریف وانلی، د. قادر شەریف وکاک جەمیل لە ماڵی نووسەر



بەرێز مامۆستا حقیقی لەگەڵ کورەکانی شێخ عەلاعەدین و نووسەر لە هولەند



کۆنفرانسێکی نووسەرانی کورد لەگەڵ نووسەر لە مۆسکۆ



سێمینارێک لەسەر کۆماری کوردستان لە ٢٦-١-٩٦ لە کۆمەڵەی کوردی
فالشۆپینگ



د. جەمشید لەگەڵ د. عومەر دزەیی و نووسەر



بنەماڵەی برادەرێکی پێشمەرگە لە کانادا لەگەڵ حوسێنی خوارزام